سالّی سیانزەهەم زستانی ٢٠١٢
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
69

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

راوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

# پێڕست

## فیکرو فەلسەفە ٤ ـ ٩٤



## ئەدەب و هونەر ٩٦ ـ ١٨٧

## گفتوگۆ ۱۸۸ - ۱۹۷





## ویستگەکانی سەردەم ۱۹۸ ـ ۲۲٦

* مشتومڕ لەگەڵ ئەفلاتون — و. لە ئینگلیزییەوە: فاتح سەعیدی
* تۆتالیتاریسم و دەرکردنی... — و. ڕێبین هەردی
* ئایدۆلۆژیا چییە؟ — و. لەفارسییەوە.موسعەب ئەدهەم
* تیۆری فرۆیدی و ... — و. لەفارسییەوە هادی محەمەدی
* کەمە نەتەوەییەکانو ... — و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع
* کوردەکانی عێراق — و. لە ئینگلیزییەوە: عبدالکریم عوزیری








# فیکر و فەلسەفە

# مشتومڕ لەگەڵ ئەفلاتون

## بەشی یەکەم

نووسینی: جولیا ئەنەس
و. لە ئینگلیزییەوە: فاتح سەعیدی

**کێشەی لێژنەی جوری**

بیرلەوە بکەنەوە کە لە ڕیزی لێژنەی جوریدا دانیشتوون و گوێتان لە سمیت گرتووە کە باس لەوە دەکات چۆن پەلاماریان داوە و دزییان لێکردوە. وردەکارییەکانی باسی دەست لێوەشاندنەکە، تۆکمە و بەجێ بوون و ئێوە بە تەواوی بڕواتان پێیکردوە؛ ئێوە دڵنیان کە سمیت قوربانی توندوتیژییەکی ناڕەوا بووە. ئەمە باوەڕێکی ڕاستەقینەیە؛ لە ڕاستیدا، سمیت هێرش کراوەتە سەری. ئایا دەزانن کە سمیت هێرش کراوەتە سەری؟ قسەوباس لە سەر ئەم بابەتە، ڕەنگە لە سەرەتاوە وەک شتێکی سەیر بێتە بەرچاوتان. دەکرێت چ شایەتێکی باشترتان هەبێت؟ بەڵام ڕەنگە وا بیر

**ڕەنگە بۆ ناسینی باشتری ئەفلاتون ئاوڕێك لە بابەتێك بدەینەوە كە زۆرتر بە «بیردۆزەی فۆرمەكان» ناسراوە و كۆمەڵێك داخوازی سەرنج ڕاكێش لەمەڕ چ شتێك ڕاستە و چ شتێك دەتوانین بزانین، دەخاتە ڕوو. فۆرمەكان، كە لەبارەیانەوە تێڕوانینی زیاترمان دەبێت، لە مێنۆ و سیئیتیتوسدا ئاراستە ناكرێن، بەڵام ئەو كاتەی كە بەرەوڕووی فۆرمەكان دەبینەوە، دەتوانین لەم بەرهەمانەدا بۆچوونەكانی هزرێك بدۆزینەوە كە تێگەیشتنێكی باشترمان لەمەڕ داخوازییەكانی ئەفلاتون لەبارەی فۆرمەكانەوە پێبدات.**



جولیا ئەنەس

بكەیتەوە كە بە هەموو ئەمانەوە، ئێرە دادگایە و سمیتیش داواكارییەكی ئاراستە كردووە و ئەو كەسەی كە گوایە هێرشی كردووە، هەوڵ دەدات كە دژ بەو بەڵگانە بوەستێت. ئایا ئەم دڵنیاییەی ئێوە لەبەر ئەوەیە كە باوەڕتان بە سمیت كردووە كە ڕاستییەكە دەڵێت، یان ڕەنگە داواكارییەكە بە شێوەیەك ئاراستە كرابێت كە ئێوە قایل بكات؟ ئەگەر ئاوا بێت، ئەوسا ڕەنگە ئێوە بێزار و پەشۆكاو بن؛ لەبەر ئەوەی كە تەنانەت ئەگەر سمیت ڕاستی نەگوتبایە ڕەنگە ئێوە باوەڕتان بكردایە. سەرەڕای ئەمە، تەنانەت ئەگەر ئەو ڕاستی بڵێت، ئایا شایەتەكانی سمیت لەمەڕ ئەوەی كە هێرش كراوەتە سەری شتەكان یەكلایی دەكاتەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە دەزانن، ڕەنگە گێڕانەوەكەی ئەو بەشێک لە نەخشەیەكی دەسەنقەست بێت و ئەگەر ئێوە بۆخۆتان لەوێ بوونایە و ڕووداوەكەتان ببینیایە، ڕەنگە بەو شێوەیە بیرتان نەكردایەتەوە. كەوابوو، دەكرێت ئەم دەرەنجامە تەواو سروشتی بێتە بەرچاو كە ئێوە لە ڕاستی‌دا نازانن كە هێرش كراوەتە سەر سمیت، هەرچەند ئێوە باوەڕێكتان هەیە سەبارەت بەوەی كە ئەم ڕووداوە ڕاستەقینە بێت و هیچ بەڵگەیەكی بەڕاستیتان بەدەستەوە نیە كە گومان لە ڕاستییەكەی بكەن.

**سیئێتێتوس**

سیئێتێتوس یەكێكە لە دایەلۆگە هەرە دڵڕفێنەكانی ئەفلاتون، بەڵام هەروەها یەكێكیشە لە بەرهەمەكانی كە زۆر سەرسامكەرە. لەوێدا سوكرات دەڵێت وەكو دایكی مامانە: ئەو بیرۆكەكانی خەڵک دەكێشێتە دەر و بۆ ئەوەی بزانێت كە ئەم بیرۆكانە بەرگەی

لێکۆڵینەوەیەکی ژیرانە دەگرن، لە پێشدا تاقییان دەکاتەوە. ئەو لە هەمان کاتدا کە نایەوێ بیرۆکەکانی خۆی لەبارەی زانینەوە بخاتە ڕوو (هەرچەند خۆی وا دەردەخات کە شارەزاییەکی وردی دەربارەی بەرهەمی فەیلەسوفەکانی تر هەیە)، کەموکوڕی هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەی کە سێئێتێتوسی لاو لەمەڕ زانینەوە پێشنیاری دەدا، پێشان دەدات. سێئێتێتوس شوێن ئەم هزرە کەوتووە کە ئەگەر ئێوە شتێک دەزانن، ناکرێ هەڵەتان کردبێت و ئەم پێشنیارانە دەدا کە ڕەنگە زانین تێگەیشتن بێت؛ یان ئەوەتا زانین وەک (هەبوونی باوەڕێکی ڕاستەقینە؛ یان ئەوەتا زانین وەک) باوەڕێکی ڕاستەقینە و توانای بەرگری کردن یان «ڕوون کردنەوەی» ئەو باوەڕە بێت. هیچ یەک لەم پێشنیارانە سەرناگرن، دایەلۆگەکە ئەم بۆچوونە بەنرخەمان بۆ بەجێ دەهەڵێت کە ئێمە سەبارەت بە بێتوانایی خۆمان لەمەڕ سەلماندنی ڕوون کردنەوەیەک لەبارەی زانینەوە، وشیاریمان پەیدا کردووە. پێداگری سوکرات لەسەر ئەوەی کە تەنیا دژ بە هەڵوێستەکانی ئەوانیتر بەڵگە دەهێنێتەوە و کاری بە هەڵوێستەکانی خۆی نییە، ئەم دایەلۆگە دەکاتە دایەلۆگێکی سەرەکی لە ناو نەریتی ئەفلاتونیدا. میراتی ئەفلاتون، زیاتر لەوەی کە باس لە داخوازییە فەلسەفییەکانی کەسێک بۆخۆی بکات، بریتییە لە گەڕان بە شوێن ڕاستیدا، لە ڕێگەی پرسیارکردن لەو کەسانەی کە لافی ئەوە لێدەدەن ڕاستییان لەلایە (هەر وەک ئەو ڕەوتەی کە سوکرات لە زۆربەی دایەلۆگەکاندا ڕەچاوی دەگرێت). تاقمێک، بە سەرنجدان لە داخوازییە ئەرێنی و بەرزەفڕانەی



سوكرات

**سێئێتێتوس یەکێکە لە دایەلۆگە هەرە دڵڕفێنەکانی ئەفلاتون، بەڵام هەروەها یەکێکیشە لە بەرهەمەکانی کە زۆر سەرسامکەرە. لەوێدا سوکرات دەڵێت وەکو دایکی مامانە: ئەو بیرۆکەکانی خەڵك دەکێشێتە دەر و بۆ ئەوەی بزانێت کە ئەم بیرۆکانە بەرگەی لێکۆڵینەوەیەکی ژیرانە دەگرن**

کە دەربارەی سروشتی زانین لە دایەلۆگەکانیتردا بەرچاو دەکەوێت، وا بۆی دەچن کە سێئێتێتوس تەنیا ئەو ڕوونکردنەوانە ڕەتدەکاتەوە کە ئەفلاتوون بە هەڵەیان دادەنێت. لێرەدا وا دەردەکەوێت کە سوکرات، لە شێوەی کەسێکدا کە مامانی بیرۆکەکانی ئەوانیترە و خاوەنی «منداڵێک» لە خۆی نیە، لە سوکراتی دایەلۆگەکانیتر، وەک کۆمار، زۆر جیاوازە.
سوکرات لە کۆماردا ئەو بۆچوونە ئەرێنییانە پێشکەش دەکات کە تەواو بڕوای پێیانە. خوێنەران دەبێ لەمەڕ ئەم بۆچوونە بۆ خۆیان بڕیاری کۆتایی بدەن (لێکۆڵینەوە لە سەر هەندێک لە ڕێگەچارە کۆن و نوێکان لە بەشی سێهەمدا هاتووە).
ئەفلاتون لە دایەلۆگی سێئێتێتوس ئەم باسە دەهێنێتە ئاراوە: سێئێتێتوسی لاو دەپرسێت زانین بێجگە لەوەی باوەڕی ڕاستەقینەیە دەتوانێ چیتر ببێت؟ و بەم گوێرەیە، ئەگەر باوەڕی ڕاستەقینەت هەبێت ئەوا ئیتر هیچ هەڵەیەک ناکەیەت. بەڵام سێئێتێتوس لە گەڵ سوکرات قسە دەکات (سەبارەت بەو لە بەشی دووهەمدا زیاتر قسە دەکەین) و وەکوو زۆربەی کات، پیاوی بەتەمەنتر خەوشێک دەدۆزێتەوە: قایل کردنی خەڵک لە ناو جەماوەردا، کارێکە کە بە شارەزایی دەکرێت بە ئەنجامی بگەیەنیت. مەبەستێک کە ئەو لە کەسانی شارەزا هەیەتی، ئەمڕۆکە ئێمە بە پارێزەر ناویان دەبەین. هەرچەندە سوکرات لەبارەی سیستمێکەوە قسە دەکات کە تیایدا هیچ پارێزەرێکی شارەزا بوونی نییە. قوربانی دەبێ بۆ خۆی داواکارییەکەی ئاراستە بکات، لە گەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵک سکاڵانووسی کارامە بەکرێ دەگرن، بەتایبەت لەو ڕووە کە ئەوان دەبێ لێژنەی جورییەک دڵنیا بکەن کە لە جیاتی دوانزە کەس لە پێنسەد و یەک کەس پێکهاتووە.
سوکرات درێژە بە قسەکانیان دەدات:
سوکرات: هەر چونێک بێت، ئەم پیاوانە بە ئەزموونی خۆیان خەڵک ڕازی دەکەن. ئەوان شت فێری خەڵک ناکەن، بەڵکو وایان لێدەکەن کە هەمان باوەڕ و ئارەزووی ئەوانیان هەبێت. یان ئایە پێتوایە، مامۆستای هێندە ژیر هەبێت کە ڕاستی سەبارەت بەو شتەی کە ڕوویداوە بێ کەم و زۆر، و لە کورتترین کاتێکدا کە هەیەتی، بەو خەڵکەی فێر بکات کە بۆخۆیان لە کاتی دزینی مڵک و ماڵیان یان لە کاتێک کە بە زەبروزەنگەوە پەلاماری شتومکیان دراوە، لە شوێنی ڕووداوەکە نەبوون؟
سێئێتێتوس: نا وا بیر ناکەمەوە کە ئەوان بتوانن هەرگیز کارێک لەو شێوەیە بکەن، بەڵام من وا بۆی دەچم کە بتوانن خەڵک قایل کەن.
سوکرات: مەبەستی تۆ لە قایل کردنی خەڵک، ئەوە نییە کە وایان لێ بکەن کە باوەڕێکیان هەبێت؟
سێئێتێتوس: بێگومان.
سوکرات: زۆر باشە، کاتێک لێژنەی جوری کەمتاکورێک لەبارەی شتێکەوە دڵنیابووە کە تۆ تەنیا بە شێوەیەک دەتوانی زانینت لەبارەیەوە هەبێت کە بە چاوی خۆت بتبینیایە و شایەتیت بدایە و بە شێوەیەکیتر ئەم زانینە دروست نەدەبوو، کەچی ئەوان لە سەر بنەمای ئەو شتانەی کە بیستویانە دادگەرییان کردووە و باوەڕێکی ڕاستەقینەیان پەیدا کردووە. ئایا لێژنەی جوری، بێئەوەی کە

زانینێکیان هەبێت و تەنیا بە هۆی ئـەوەی  کە لەبارەی دروستی ڕووداوەکەوە دڵنیابوون، بەباشی دادگەرییان کردووە؟

سێئێتێتوس: بە هیچ جۆرێک.

سوکرات: بەڵام سەیرکە، ئەگەر باوەڕی ڕاستەقینە و زانین هەر یەک شت بن کەواتە هەر ئەندامێکی پایەبەرزی لێژنەی جوری بێ زانین، باوەڕێکی دروستی نییە. کەوابوو، دەردەکەوێت کە ئەمانە لە یەک جیان.

(سێئێتێتوس 201a-c)

بڕوا بەم مشتومڕە دەکرێت و قایلمان دەکات، لە ڕاستی‌دا ڕەنگە هێندە ڕوون بێت کە بەرچاومان نەکەوێت. بـەڵام ئێمەش وەکـوو لێژنەی جوری دەتوانین ئەم پرسیارە ئاراستە بکەین ئایا ئێمە دەبێ دڵنیا بووبێتین؟ بۆچی لێژنەی جوری نازانن کە سمیت دزی لێکراوە؟

**چۆن ئاماژە بە بەرهەمەکانی ئەفلاتون بدەین؟**

لـە سـاڵـی ١٥٧٨، هێنری ئەتییەنی خـاوەن چاپەمەنی کتێب، کە Stephanus شێوەی لاتینی نازناوەکەیەتی، یەکەمین بژاردەی چاپکراوی سەرجەم بەرهەمەکانی ئەفلاتونی لە پاریس بڵاو کردەوە. هونەری پیشەسازی نوێ دەرفەتی ئەوەی ڕەخساندبوو کە بە بەراورد لە گەڵ پێشوودا، ژمارەیەکی زۆرتر لە خەڵک بتوانن ئاسەواری ئەفلاتون بخوێننەوە. بۆ یەکەمین جار دەکرێت بەوردی بە بەندگەلێک لە ناو دایەلۆگەکان‌دا سەرچاوە بدرێت، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە خوێنەران بۆ یەکەمین جار لە ژمارەی یەکسانی لاپەڕەکان کەڵکیان وەرگـرتـووە. ئێمە هەتا ئێستاش بە لاپەڕەی بەندێک لە بژاردەکەی ستێفانوس (بۆ نموونە ٢٠٠) سەرچاوە دەدەین و ئەم ڕەوتە ئاوێتەیە لە گەڵ پیتەکانی a هەتا e کە بۆ دابەشکردنی لاپەڕەکان بە پێنج بەش لە سەرەوە بۆ خوارەوە بەکارهێنراون. ʹژمارەکانی ستێفانوس لە زۆربەی دەق و وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەفلاتون، لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا چاپ دەکرێت. ژمارەیەکی سەرچاوەدان، وەکوو ʹ200e، ئەو دەرفەتە بە خوێنەر دەدات هەتا ئەو بەندە بدۆزێتەوە، بێ‌ئەوەی ژمارەی لاپەڕەی ئەو کتێبەی کە بەکاری دەهێنێت گرینگ بێت.

**بۆ زانین، چیمان پێویستە؟**

یەکێک لـەو هـۆکـارانـەی کـە ئەفلاتون بـۆ ئەم داخوازییە کە ئەندامەکانی لێژنەی جوری زانینیان نییە، ئاراستەی دەکات ئەوەیە کە کەسێک ئەوانی دڵنیا کردووە. ئامانجی سەرەکی ئەو کەسە ئەمە بووە کە ئەوان باوەڕ بە شتێک بهێنن کە بۆخۆی دەیهەوێت. لەم بابەتەدا ئەو کەسە، ئەندامانی لێژنەی جوری لەمەڕ ڕاستی قسەکانی خۆی دڵنیا کردووە، بەڵام دەکرێ ئێمە وا بیر بکەینەوە کە ئەو تەنانەت ئەگەر چیرۆکەکەی ڕاستەقینەش نەبوایە، دەیتوانی لێژنەی جوری قایل بکات. لە سەرەتاوە ڕەنگە ئەم پەشۆکاوییە، وەک بابەتێکی پێویست نەیەتە بەرچاو: ئەگەر لە ڕێگەیەکی تایبەتەوە، باوەڕێکی ڕاستەقینەتان دەستکەوتبێت، بۆچی دەبێ پەشێوی ئەوە بن کە ڕەنگە بە هەمان شێوە سەبارەت بە شتێکی هەڵە دڵنیا بووبێتن؟ ئەو شتەی کە ڕووی نەداوە چۆن دەتوانێ گومان بخاتە

سەر ئەو شتەی کە ڕووی داوە؟ بەڵام لە ڕاستیدا گاڵتە بە پەشێوییەک ناکرێت کە سەبارەت بە هێزی قایلکردنە، لەبەر ئەوەی گومان دەخاتە سەر ئەو ڕەوتەی کە باوەڕی تێدا دەستدەکەوێت. ئەگەر ئەم ڕەوتە ڕێڕەوێکە کە تیایدا دەتوانم بە هەمان ئاسانی باوەڕە ڕاستەقینەکان، بە باوەڕی هەڵە بگەم، کەواتە ناتوانێت تەنیا بۆ ئەوەی بە باوەڕی ڕاستەقینە بگەم، پشتگیریم لێبکات. ئەمە لە مێشکی زۆربەی خەڵکدا گومان لەوە دروست دەکات کە لەم ڕێگەوە، بە باوەڕێک بگەم کە دەرەنجامی زانینی لێبکەوێتەوە. هۆکارێکیتر کە لەم بەندەدا ئاراستە کراوە ئەمەیە کە جۆری ئەو ڕووداوەی کە لێژنەی جوری پێی قایل بوون، واتە سمیت هێرش کراوەتە سەری، لە جۆری ئەو ڕووداوانە نییە کە بە هەر حاڵ بتوانن لەبارەیەوە زانینێکیان هەبێت، مەگەر ئەوەی کە لەوێ بووبێتن و بە چاوی خۆیان شتەکەیان بینیبێت. هەتا هەر ڕادەیەک دڵنیا بووبێتین کە سمیت ڕاستییەکە دەڵێت، هەموو ئەو شتەی بەدەستمان هێناوە گێڕانەوەیەکی ناسەرەکییە و لە ڕەوتێکی تەواو جیاواز لە ڕەوتی سمیت بۆ خۆی، ڕاگەیاندراوە. سمیت دزییەکەی بینیوە و بەسەرهاتەکەی تووش بووە؛ بۆ ئێمە تەنیا باس لە ڕووداکەوە کراوە. هەرچەندە ئەم گێڕانەوە ڕوون و ئاشکرا بێت، هێشتاکە هەر گێڕانەوەیە؛ تەنیا کەسێک کە لەوێ بووبێت و ڕووداوەکەی بینیبێت، دەتوانێ زانینی لەبارەیەوە هەبێت. دیسانەوە، ڕەنگە وەک ئەوەی پێویست بێت، بایەخی ئەم وردبوونەوەیە نەیەتە بەرچاو. ئەگەر زانین، بەو شتەی کە خۆمان دەتوانین ئەزموونێکی ڕاستەوخۆمان لێی بێت، سنووردار بکەین، کەواتە شتێکی هێندە گرینگ نامێنێتەوە کە بتوانین بیزانین؛ ئەو شتەی کە لە ڕێگای سەرچاوەی ناسەرەکییەوە دەیخوێنینەوە یان دەیبیسین، وەک زانین هەژمار ناکرێن. کەچی هێشتا لێرەدا پەنا براوەتە بەر هزرێکی بەهێز. هزرێک کە دەکرێت ئاوا بیدرکێنی کە هیچ کەسێکیتر ناتوانێت شتێک بە جێگای ئێوە یان لە لایەن ئێوەوە بزانێت؛ بۆ زانین پێویستیە کە ئێوە بۆ خۆتان باوەڕێک پەیوەندیدار بە بابەتەکە بەدەست بهێنن. بەدەست هێنانی باوەڕی پەیوەندیدار، بەپێی ئەوەی کە جۆری باوەڕەکە چی بێت، جیاوازی لێدەکەوێتەوە، بەڵام لەمەڕ ئەم باوەڕەوە کە سمیت دزی لێکراوە، تەنیا ڕێگا، بۆ ئەوەی کە بتوانن خۆتان ڕاستەوخۆ زانیاری بەدەست بهێنن، وادیارە ئەوەیە کە خۆتان لەوێ بن و لەڕاستیدا ڕووداوەکە ببینن.

## کێشەیەك بۆ ئێمە

بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکەیە ڕەتکەینەوە کە باوەڕی ڕاستەقینەی لێژنەی جوری دەتوانێت بریتیبێت لە زانین، ئەفلاتون دوو جۆر بەڵگەمان پێدەدات. هەر دووکیان بەهێزن، بەڵام چۆن لە گەڵ یەکدا دێنەوە؟ کێشەی قایلکردن ئەوە بوو کە ئەم ڕێڕەوە ناتوانێت ئەوەمان بۆ دەستەبەر بکات کە ئەو باوەڕانەی ئێمە لە کەسانی دیکەوە بە دەستیان دەهێنین، ڕاستەقینە بن. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم شێوەیە گیروگرفتێک بۆ قایلکردن سازبکات، دەبێ ڕێڕەوێکیتر لەم جۆرە بەدەستەوە بێت کە بە هەمان شێوە پشتگیری بابەتی ڕاستەقینە بکات. سوکرات ناڕەزایی خۆی

بۆ ئەو ڕەوتە دەردەبڕێت کە تیایدا کەسی لێقەوماو دەبێ لێژنەی جوری لە ماوەیەکی زۆر کورت و لە بارودۆخێکی لێوانلێو لە هەست و سۆز، دڵنیا بکات کە ئەو باوەڕانەی ئەوان بە دەستیان هێناوە لە جۆرێکی ڕاست لە زانینن. ئەم ناڕەزاییە بێمانایە، مەگەر ئەوەی کە ڕێگایەکیتر بۆ بە دەست هێنانی باوەڕ، بوونی هەبێت کە لەم جۆرە کۆسپانەی، کەمتر لە سەر ڕێگا بێت. بۆ وێنە، کاتێک (بۆ بەرگری کردن) دیاری نەکرێت و هەر ئەندامێکی لێژنەی جوری بتوانێت شایەتەکان و لێقەوماوەکە، هەتا ئەو ڕادەیەی کە بۆ دڵنیابوون پێویستە و هەتا دوایین پرسیارەکان، تاقیبکاتەوە. کەواتە، لەوە دەچێت، ئێمە وایدادەنێین، ڕێگایەک بۆ دەربڕینی باوەڕەکان هەیە کە دەتوانێت بە زانین بگات، هەرچەندە ئەم ڕێگایە قایلکردن نییە.

بەڵام بابەتی دووهەم پێشنیاری ئەوە دەکات هیچ ڕێگایەک بۆ دەربڕینی باوەڕەکان ناتوانێت بە زانین بگات، هەرچەندە کەشخەش بێت و بە وردکارییەوە ئاراستە کرابێت، چونکا هەر باوەڕێک کە لە لایەن کەسێکی دیکەوە بۆ ئێوە گواسترابێتەوە، ناسەرەکییە و لە دووهــەم دەستەوە بە ئێوە گەیشتووە. بەم گوێرەیە ئێوە ناتوانن بزانن، چونکە ئێوە ناتوانن بۆخۆتان، زانینتان دەربارەی ئەو باوەڕەوە هەبێت. پشت بەستن بە شایەتییەکی دیکە، هەرچەندە بێ کەم و کوڕیش بێت، هیچ کاتێک وەک ئەوە نییە کە خۆتان بەشداری ڕووداوەکە بن.

هەنووکە کێشەکە لەوێدایە کە وادیارە گیروگرفتی دووهــەم لەگەڵ ئــەوەی یەکەمدا لە ناکۆکیدایە. گیروگرفتی دووهــەم دەیگووت کە ناکرێت زانین بگوازیتەوە، بەڵکوو هەر کەسێک دەبێ بۆ خۆی بە دەستی بهێنێت؛ بەڵام گیروگرفتی یەکەم، کێشەی قایلکردن لەو شێوەدا دەبینێت کە پێشنیاری ئەوە دەدات کە دەکرێت ڕێگایەک بۆ بە دەست هێنانی باوەڕی کەسانی دیکە هەبێت کە بە زانین بگات، کەواتە ئەو زانینە توانای گواستنەوەی هەیە.

### خوێنەر دێتە ژووری

لێرەدا خوێنەر بە ناچار وایلێدێت هەتا بۆ خۆی لەبارەی بەندەکان و لەبارەی ئەوەی کە ئەفلاتون ئەنجامی داوە، بیربکاتەوە. سادەترین وەڵامدانەوە ئەوەیە، بەو دەرەنجامە بگەی کە ئەفلاتون چەند داخوازییەکی دووجەمسەر ناکۆکی لەمەڕ زانین دابێتە پاڵ سوکرات، لەبەر ئەوەی کە ئەفلاتون بۆ خۆی سەری لێشێواوە؛ ئەفلاتون سەرنجی ئەو بابەتەی نەداوە کە دەیەوێت زانین لەگەڵ ئەوەدا کە توانای گواستنەوەی هەبێت هەروەها نەتوانێت بگوێزرێتەوە. ئەو خوێنەرانەی لایەنگری ئەم بۆچوونە نین ڕەنگە هەر لێرەدا بوەستێن.

بەڵام ئێمە دەتوانین کەمێک بەرەو پێش هەنگاو هەڵبێنین. شتێکیتر کە دەبێ باسی لێبکەین ئەوەیە کە سوکرات لەم دایەلۆگەدا پەستا پەستا دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو هەڵوێستەکانی خۆی ئاراستە ناکات، بەڵکوو دژ بە هەڵوێستەکانی کەسانی دیکە بەڵگە دەهێنێتەوە. ئەو لەم پێشنیارەی سێئێتێتوس کە باوەڕی ڕاستەقینە ڕەنگە بە زانین بگات، دوو ڕەخنە دەگرێت. دژ بە پێشنیارەکە

هەر دوو ڕەخنەکە بەهێزن. ئایا دەبێت وایدابنێین کە ئەفلاتون، نووسەری دایەلۆگەکە، ئاگای لەوە نەبووە کە ئەم ڕەخنانە دژبەیەکن؟ نا مەرج نییە (ئەگەر نابێت وایدابنێین کە نووسەر ئاگای لەم چەڵەمەیە نەبووە، نابێت هەروەها وایدابنێین کە ئەو مەبەستی ئەوەی بووە کە سوکرات وانیشان بدات کە بێئاگا لە کێشە ـ هزرییەکە بووە، هەرچەند ئەمە بابەتێکیترە و ڕەنگە خوێنەران لە گەڵی ڕێک نەکەون). بە ئاوڕدانەوە لە ئاستی پێشکەوتووی ڕەوتی بەڵگەهێنانەوە لە سیئێتێتوس، ژیرانەیە کە وادابندرێت، ئەفلاتون لە چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئەم دوو ڕەخنەیە ئاگاداربووە.

کەواتە بۆچی وادێتە بەرچاو کە ئەفلاتون لەبارەی ئەم بابەتەوە وابیردەکاتەوە کە گرینگ نەبێت؟ لێرەدا دەبێ گرینگی بدەین بە پێداگری سوکرات لە ناو دایەلۆگەکەدا کە دەڵێت ئەو تەنیا دژ بە ڕوانگەی ئەوانی دیکە بەڵگە دەهێنێتەوە. ئەمە بەو مانایە نییە کە ئەو لەمەڕ بابەتەکە هیچ بیرۆکەیەکی نییە، بەڵکوو ئەوە دەگەیەنێت کە مەبەستی دایەلۆگەکە ئاراستە کردنی ئەو بابەتانە نییە. کێشەیەک کە ئێمە لە کاتی تێڕامان دەربارەی دوو بنەماکەی سوکرات بۆ ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی سیئێتێتوسدا بەڕەوڕووی دەبینەوە، ئەم دەرەنجامە لاواز ناکەتەوە کە ئەو پێشنیارە نەگونجاوە؛ ئەو دوو بنەمایە نیشان دەدەن کاتێک ئێمە یان ئەفلاتون لە سەر ڕوونکردنەوەیەکی ئەرێیانە لە زانین کار دەکەین، پێویستیمان بەوە هەیە کە لەم کێشەیە ئاگادار بین. لە دایەلۆگێکیتردا، بە ناوی مێنۆ، لە گەڵ ئەم

**یەکێك لەو هۆکارانەی کە ئەفلاتون بۆ ئەم داخوازییە کە ئەندامەکانی لێژنەی جوری زانینیان نییە، ئاراستەی دەکات ئەوەیە کە کەسێك ئەوانی دڵنیا کردووە. ئامانجی سەرەکی ئەو کەسە ئەمە بووە کە ئەوان باوەڕ بە شتێك بهێنن کە بۆخۆی دەیهەوێت.**



ئەفلاتون

داخوازییە بەرەورووو دەبینەوە کە زانین فێردەکرێت (87b-c)، و ئەمە خاڵێکە بە مسۆگەری پەسەند کراوە. بەڵام، هەروەها، لە دایەلۆگی مێنۆدا، یەکێک لە بەناوبانگترین بیرۆکەکانی ئەفلاتونمان بۆ دەردەکەوێت. ئەم بیرۆکەیە بریتیە لەوەی کە زانین لەڕاستیدا جۆرێک «وەبیرهاتنەوەیە«. سوکرات سەرقاڵی گفتوگۆکردن لە گەڵ کوڕێکدایە کە هەندەسە نازانێت و ئەوی بە سەلماندنێکی هەندەسییەوە خەریک کردووە، ئەگەرچی شوێن کەوتنی باسەکە ئاسانە، بەڵام کوڕەکە دەگاتە قۆناغێک کە تیایدا ڕەوتەکە بە دژەشهودی دادەنێت. سوکرات کە لە سەلماندنی بابەتەکەدا هاوشانی کوڕەکە دەڕواتە پێشەوە، دەڵێت (85c): کوڕەکە ئێستا لە بارودۆخی هەبوونی باوەڕگەلێکی ڕاستەقینەدایە سەبارەت بە بابەتەکە، بەڵام «ئەگەر کەسێک فرە جار و بە گەلێک شێوە هەر ئەم بابەتەی لێ بپرسێتەوە، لە ئاکامدا وەک هەر کەسێکیتر زانینێکی وردی لەسەر بابەتەکە دەبێت«. سوکرات کوڕەکەی فێرکردووە، بە واتایەک سوکرات ئەو سەلماندنەی کە خستویێتییە بەردەم کوڕەکە، کوڕەکە بتوانێت خوی زانیاری تر بدوزێتەوە و تێبگات. کوڕەکە لە کەردەوەدا زانینێکی نەبووە هەتا ئەو کاتەی بۆ خۆی کارێکی بە ئەنجام گەیاندووە، بەو مانایەی کە بۆ تێگەیشتن لە سەلماندنەکە خۆی هەوڵیداوە. کوڕەکە دەبێ بۆ خۆی زانینێک لەمەڕ سەلماندنەکە دەستەبەر بکات، لەبەر ئەوەی کە تەنیا بۆ خۆی دەتوانێت لێی تێبگات. سوکرات ناتوانێت ئەم کارە بکات. بەڵام سوکرات دەتوانێت زانین بگوازێتەوە، چونکا ئەو دەتوانێت سەلماندنەکە بە شێوەیەک بۆ کوڕەکە بگوازێتەوە کە بتوانێت بۆ خۆی هەوڵ بدات. کەوابوو ئێمە دەتوانین ببینین کە زانین چۆن دەتوانێت فێرکردنی بێت، لە کاتێکدا هێشتا ئەم بابەتە ڕاستە کە زانین ئەو شتەیە کە هەر کەسێک دەبێ خۆی پێی بگات. سەرەڕای ئەمە، ئەفلاتون بەم ڕەوتە دەڵێت وەبیرهێنانەوە؛ چونکا ئەفلاتون پێیوایە، کاتێک کوڕەکە لە سەلماندنەکە تێدەگات، ڕۆحی ئەو زانینەی وەبیردێنێتەوە کە پێش بوونی جەستەی خوی هەیبووە، کەواتە پێش لە ئەزموونی کرداری ئەم زانینەی لە لا بووە. ئەگەرچی ئاشکرایە، ڕەوتی سەلماندنەکە، بۆ خۆی، ئەم قۆناغەی دوایی لەمەڕ وەبیرهێنانەوە، دەستەبەر ناکات؛ ئەم شێوازە ئازا و هەست بزوێنەرانە، تایبەت بە ئەفلاتونە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی بەڵگەهێنانەوە ڕاڤە بکات.

### مشتومڕ لە گەڵ ئەفلاتون

لە زۆربەی بوارەکانەوە، بەندەکانی تایبەت بە لێژنەی جوری لە دایەلۆگی سێئێتێتوس، پێشەکییەکی باش سەبارەت بە شێوازی نووسینی ئەفلاتون بە دەستەوە دەدات. ئێمە یەکسەر بۆمان دەردەکەوێت کە سەرنجدان لە شێوەی نڤیساری ئەفلاتون، بەتایبەت دەوری بەڵگەهێنانەوە لە پشتیوانی کردن لە هەڵوێستی خۆی یان هێرش کردنە سەر هەڵوێستەکانی ئەوانی دیکە، زۆر گرینگە. هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە خوێنەر بۆ خۆی سەرنجی بۆ ناو مشتومڕەکە ڕاکێش دەکرێت و تەنانەت ئەو کاتەی کە سوکرات بە هاسانی لە ناو دایەلۆگەکەدا

سەردەکەوێت، وا لە خوێنەر دەکات کە لە گەڵ بەڵگەهێنانەوەکانی ئەفلاتون بەرەنگار بێتەوە.
ئەو پاژە کورتەی کە لە بەڵگەهێنانەوەکەی دایەلۆگی مێنۆدا باسم لێکرد، ئێمە لەگەڵ تایبەتمەندییەکی دیکەی شێوازی نووسینی ئەفلاتون ئاشنا دەکات. لە سیئێتێتوسدا ئەفلاتون لەم خاڵە کەڵک وەردەگرێت کە زانین توانای ئەوەی هەیە کە بگوازرێتەوە و زانین پێویستی بە ئەزموونی ڕاستەوخۆی کەسەکە هەیە. ئەگەر شوێنەواری ئەم دوو خاڵە لەنێوان بەسەرهاتەکانی ڕۆژانەدا وەکوو بڕیاری لێژنەی جوری سەبارەت بە تاوانێک، سەیر بکەین، لە گەڵ چەند کێشەیەک بەرەوڕوو دەبینەوە. لە مێنۆدا ئەم دوو خاڵە لە بەستێنێکدا دەبینین کە پێکەوە ناکۆکیان نییە. بەڵام بەستێنی بابەتەکە لەوێدا سەلماندنی هەندەسییە ـ نموونەیەک لە زانین کە زۆر جیاوازە لە بڕیاری لێژنەی جوری. سەلماندنی هەندەسی بێ پێچ و پەنا، دەرهەست و لە بەسەرهاتی ڕۆژانە گەلێک دوورە. لێرەدا شتێکی بنچینەیی بۆ تێگەیشتن و گواستنەوە بوونی هەیە. ئەمە بە ڕێکەوت نییە کاتێک کە ئەفلاتون ئەمبازی چەمکی زانین دەبێتەوە، بەرەو ئەم دەرەنجامە دەڕوات کە ئەو شتەی پێوەری ئەو بۆ زانین جێبەجێ دەکات، زۆر سنوردارترە لە مەودای ئەو شتانەی کە ئێمە بە شێوەیەکی ئاسایی وایاندادەنێن کە دەیانزانین. ئەگەر بیر لە جیاوازییەکانی نێوان نموونەی لێژنەی جوری و سەلماندنی هەندەسی بکەینەوە، دەتوانین ببینین کە بۆچی ئەفلاتون بەم دەرەنجامە دەگات. بۆ وێنە چەمکی تێگەیشتن لە نموونەیەکی ڕۆژانە، کە تیایدا چەمکی زانین تەنیا بۆ بینینی تاوانەکە دابەزیوە، مەودایەکی کورتتری هەیە.
ڕەنگە بۆ ناسینی باشتری ئەفلاتون ئاوڕێک لە بابەتێک بدەینەوە کە زۆرتر بە «بیردۆزەی فۆرمەکان» ناسراوە و کۆمەڵێک داخوازی سەرنج ڕاکێش لەمەڕ چ شتێک ڕاستە و چ شتێک دەتوانین بزانین، دەخاتە ڕوو. فۆرمەکان، کە لەبارەیانەوە تێڕوانینی زیاترمان دەبێت، لە مێنۆ و سیئێتێتوسدا ئاراستە ناکرێن، بەڵام ئەو کاتەی کە بەرەوڕووی فۆرمەکان دەبینەوە، دەتوانین لەم بەرهەمانەدا بۆچوونەکانی هزرێک بدۆزینەوە کە تێگەیشتنێکی باشترمان لەمەڕ داخوازییەکانی ئەفلاتون لەبارەی فۆرمەکانەوە پێبدات.
ئەفلاتون بە شێوەیەک دەنووسێت کە ئێمە لەگەڵ خۆیدا، سەرقاڵی بەڵگەهێنانەوە دەکات. هەروەها داخوازییە فەلسەفییەکان بە شێوازێکی وا بوێرانە و بە خەیاڵێکی بەرفراوان ئاراستە دەکات کە بەدەگمەن دەکرێت هاوتایەکی بۆ بدۆزینەوە (ئەم بیرۆکەیە کە زانین وەبیرهێنانەوەیە، یەکێک لە هەرە ناسراوەکانیانە). ئەفلاتون لە لێکدانەوەکانی‌دا، جار هەیە کە گرینگییەکی لە ڕادە بەدەر بە لایەکی باسەکە دەدات و لایەنەکانی‌تری لەبیر کردووە. جاروباریش تەنیا پێیخۆشە کە لە گەڵ خوێنەر دەمەقاڵێ بکات و لە هەر جۆرە بیرۆکەیەکی ئەرێیانە دوور دەکەوێتەوە. لە کاتەکانی‌تردا، ئەومان وەک بیردۆزدانەرێکی بوێر دێتە بەرچاو کە بە وشکەبڕواییەوە بەرەوپێش هەنگاو دەنێت و ئاوڕ لە بەڵگەهێنانەوە نادات. ئەو بابەتە ئاڵۆز و هەروەها

دڵخۆشکەرەی دەربــارەی ئەفلاتون کە نابێت لە بیرمان بچێت، ئەوەیە کە ئەو بەتینەوە سەرنج لە بەڵگە و بیرۆکەی بوێرانە دەدات. ڕەوتی ئەم شێوازە بە لێهاتوویی و بە وردی ئاراستە کراوە و تێگەیشتن لێیان بێ ئاسانکاری زۆر زەحمەتە. ئەم پێشەکییە لەمەڕ ئەفلاتون خۆی وا پیشان نادات کە تەواوی بیرۆکەکانی ئەفلاتون لەخۆ دەگرێت یان ڕێکارێک بۆ لێکدانەوەی بۆچوونەکانی ئەو بەدەستەوە بدات، بەڵکوو ئامانجەکەی ئاشناکردنی ئێوەیە لەگەڵ ئەوەی چۆن بەرەنگاری ئەفلاتون ببنەوە. هیوادارم ئەم کارەی من ببێتە هۆی ئەوە کە ئێوە لە ڕەوتی بیرکردنەوەدا بەردەوام بن.

**پەراوێزی نووسەر بۆ ئەم بەشە:**

ئەو بابەتەی لە پەیوەندی لە گەڵ بەندی لێژنەی جوری لە سێئێتێتوسدا قسە و باسی لە سەر کرا، یەکەم جار لە وتاری سوکرات و لێژنەی جوری: پارادۆکسگەلێک لەبارەی جیاوازییەک کە ئەفلاتون لە نێوان زانین و بــاوەڕی ڕاستەقینەدا دایدەنێت (Socrate and the Jury: Paradoxes in Plato›s distinction between knowledge and true belief)، بڵاو بۆتەوە و نووسەرەکەی، مایڵز بورنایت (Myles Burnyeat) گرینگی پێداوە و پێداگری لە سەر کردووە. بۆ خوێندنەوەی ئەم وتارە ئەم کتێبە ببینە:

The Aristotilian Society, Supplementary Volume LIV (1980), 17391-

**لەبارەی نووسەری ئەم بابەتەوە**

ئەم بابەتە بەشی یەکەم لە کتێبی (فەلسەفەی ئەفلاتونە) کە لە لایەن جولیا ئەنەس، مامۆستای زانکۆی ئەریزۆنا، نووسراوە. ئەنەس کە یەکێک لە شارەزا بەناوبانگەکانی فەلسەفەی یۆنانە، هەتا ئێستا چەند کتێبی دەربــارەی فەلسەفەی یۆنان نووسیوە کە بریتین لە:

- وەرگێڕانی بەشی M و N لە مێتافیزیکی ئەریستۆ، لە گەڵ پێشەکی و وتاری فەلسەفی لەوبارەیەوە (١٩٧٦)
- پێشەکییەک بۆ کتێبی کۆماری ئەفلاتون (١٩٨١)
- فەلسەفەی هۆش لە سەردەمی یۆنانیباوەڕیدا (١٩٩٢)
- ئاکاری بەختەوەری (١٩٩٣)
- فەلسەفەی ئاکاری ئەفلاتونی (١٩٩٩)
- فەلسەفەی سەردەمی کۆن (٢٠٠٠)
- فەلسەفەی ئەفلاتون (٢٠٠٣)

و هەروەها ٥ کتێبی هاوبەش کە تایبەت بە وەرگێڕانی دەقە بەناوبانگەکانی فەلسەفەی یۆنانە.

سەرچاوە

Annas, Julia (2003), “Arguing with Plato”, in Plato, New York: Oxford University Press Inc., pp. 111-

# تۆتالیتاریسم و دەرکردنی مۆدێرنەی سیاسی*

نووسینی :مۆریس باربیە
و. رێبین هەردی

مۆدێرنەی سیاسی کە هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە توشی بوژانەوە و گەشەکردنی ناسیۆنالیزم بوو بوو، لەسەدەی بیستدا بەر رێگرێکی ترسناکتر کەوت. ئەم رێگرە تۆتالیتاریسم لە شێوازە جیاوازەکانیدا لەبەردەم مۆدێرنەی سیاسیدا دروستی کرد. بەمشێوەیە مۆدێرنەی سیاسی بە توندی هیرشی کرایە سەر و بەشێوەیەکی کامڵ وەلاوە نرا و لەم ئاراستەیەدا لەو شوێنانەدا کە پێشتر هەبوو لەناوچوو، دەرکەوتنی شوێنانەشدا کە نەبوو ئەستەم بوو. بەشێوەیەکی گشتی و بە پیناسە تۆتالیتاریسم نەفیکردنی مۆدێرنەی سیاسیە. چونکە لە بنەڕەتدا مۆدێرنەی سیاسی بە وردی لەسەر بناغەی جیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، بواری گشتی و بواری تایبەتی و رەدکردنەوەی جیاوازی هاوڵاتی

**لەگەڵ هەمەڕەنگی فاشیزمدا دەکرێت شوناسی سەرەکی (ئەم شێوازی حوکمڕانیە) بە دەوڵەتێکی ستەمکار -تەنانەت تۆتالیتار- و هەروەها کەمکردنەوە یان تەنانەت نەهێشتنی سەربەخۆیی فەردی بزانرێت. فاشیزم لەنێوان دوو جەنگی جیهانیدا لەو وڵاتانەدا دەرکەوت کە یا هێشتا بە تەواوی مۆدێرنەی سیاسیان نەهێنابووە دی (وەك ئیتاڵیا، ئیسپانیا و پورتوگال) یان بە ئاشکرا ململانێیان لەگەڵ ئەکرد (وەك فەڕەنسا). بەمشێوەیە فاشیزم بە پێی ڕێگا جیاوازەکان توانی مۆدێرنەی سیاسی هەندێکجار بەشێوەیەکی کامڵ و هەندێکجار بەشێوەی کەموکوڕ لەناو بەرێت**



مۆریس باربیە

و تاك دامەزراوە . تۆتالیتاریسم ئەیەوێت گشتێکی چونیەک و یەکگرتوو دروستبکات و ماوەی نێوان دەوڵـەت و کۆمەڵگا و هەروەها جیاوازی هاوڵاتی و تاکەکەس بسڕێتەوە. ئەم هەوڵە دەبێتە هۆی دەرکردنی دەوڵەتی مۆدێرن و دروستکردنی جۆرێک دەوڵەتی پیش مۆدێرن لە شکڵێکی نوێدا. بەڵێ باس باسی دەولەتی تۆتالیتارە کە وەک لە ناوەکەیەوە دەرئەکەوێت لافی ئەوە لێئەدا هەموو شتێکە و ئەیەوێت هەموو شتێک لە خۆیدا بتوێنێتەوە و بگونجێنێت.

دەولەتی تۆتالیتار جگە لە شیوە بەدیهاتوەکانی، لەبەر نـاوەڕۆکـی خۆی ناتوانێت بە دەوڵەتێکی مۆدیرن ئەژمار بکرێت و لەراستیدا خاوەن خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی دەوڵەتی پێش مۆدێرنە. دەوڵەتی تۆتالیتار بونی کۆمەڵگای مەدەنی واتە جێگەیەک کە تیاییدا بەرژەوەندیە تایبەتیەکان بە رەوا ئەژمێرێت، قەبوڵناکات و هەروەها قەبوڵی بواری تایبەتی ناکات کە تیایدا تاکەکان بتوانن خاوەن ئازادی جۆراوجۆر بن. لەم روەوە ئەیەوێت هەموو کۆمەڵگا بگریتەوە و هەموو چالاکیە مرۆڤایەتیەکان لە ئابوریەوە بیگرە تا بیروڕاکانەوە لە ئەنجومەن و سەندیکاکانەوە بیگرە تا زانیاری و هەواڵ و زانست و زانین و کلتور و هونەر و رابواردن کونترۆڵ و رینمایی بکات. دەوڵەتی تۆتالیتار هەموو ئازادیە فەردیەکان لەناو ئەبات یان ئەیانپالێوێت و چلەبواری سیاسی و ئابوری و چ لە بواری فکری و هونەریدا جێگەیەک بۆ داهینانی تایبەتی ناهێڵێتەوە. ئەزانین کە نەبونی کۆمەڵگای مەدەنی، نەفیکردنی مافەکانی مرۆڤ و تەنانەت نەفیکردنی مرۆڤ بەدوای خۆیدا دێنێت و تاکەکەس کورتئەکاتەوە بە بەشێک لە گشت کە گشتیش هەمان دەوڵەتە. بەمشێوەیە تاکەکەس چیتر خاوەنی سەربەخۆی نیە و تەنانەت بونێکی تایبەتی نیە و لە ئەنجامدا ناتوانێت خاوەن مافی شەخسی بێت کە دەوڵەت ناچار بێت پارێزگاری لێبکات. ئەنجامی دۆخێکی وا ئەوەیە کە مافی مرۆڤ نە بونی هەیە و نە لە بنەڕتدا مانای هەیە.

کەوابوو دەوڵەتی تۆتالیتار دژی دەوڵەتی مۆدیرنە و لەو روەوە کە بونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی سەربەخۆ و ئازادیە فەردیە واقعیەکان رەد ئەکاتەوەم کەوابەە شێوەیەکی تازەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن نمایش ئـەکـات. دەوڵــەتــی تۆتالیتار بـەجـۆر و پانتای ئەو ئامرازانەی بۆ کۆنترۆڵی کۆمەڵگا و تاکەکان بـەکـاری دێنێت، لە دەوڵـەتـشـاری یۆنانی جیا ئەبێتەوە کە ئەکرێت بۆ نمونەی ئەم ئامرازانە ئاماژە بۆ دەستگەیشتنی رێکخراو بە فشار و ناچارکردن، توندوتیژی و شێوازی دیکتاتۆری ئاسا بە سودوەرگرتن لە تازەترین تەکنیکەکان بکەین. لەمرووەوە ئەکرێت تەماشات دەوڵەتی تۆتالیتار وەک دەوڵەتی پێشمۆدێرن بکەین کە ئامرازە مۆدیرنەکان بەکار ئەهێنێت. بەڵێ گەرچی بەکارهێنانی ئامرازە مۆدێرنەکان دەوڵەتی تۆتالیتار بەشێوەیەکی بەرچاو بەهێز ئەکات، بـەڵام ناتوانێت خەسلەتی واقعی ئـەم شـیـوازەی دەوڵــەت بشارێتەوە. هەرچەندە رەدکـردنـەوەی مۆدێرنەی سیاسی وەک شوناسی سەرەکی تۆتالیتاریزم هەم لە فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیسمدا ئەدۆزرێتەوە و هەم لە کۆمنیسمی یەکیتی سۆڤیەت و چینیدا، بەڵام لەهەریەک لەم حاڵەتانەدا شکڵی جیاواز بەخۆیەوە ئەگرێت و لێرەوە شایستەی ئەوەئە هەریەکیان بە جیا باسبکەین.

**فاشیزمی ئیتاڵی و هاوشێودکانی:**

لەگەڵ هەمەڕەنگی فاشیزمدا دەکرێت شوناسی سەرەکی (ئەم شیوازی حوکمڕانیە) بە دەوڵەتێکی ستەمکار —تەنانەت تۆتالیتار- و هەروەها کەمکردنەوە یـان تەنانەت نەهێشتنی سەربەخۆیی فـەردی بزانرێت. فاشیزم لەنێوان دوو جەنگی جیهانیدا لەو وڵاتانەدا دەرکەوت کە یا هێشتا بە تەواوی مۆدێرنەی سیاسیان نەهێنابووە دی (وەک ئیتاڵیا، ئیسپانیا و پورتوگال) یان بە ئاشکرا ململانێیان لەگەڵ ئەکرد (وەک فەڕەنسا). بەمشێوەیە فاشیزم بە پێی رێگا جیاوازەکان توانی مۆدێرنەی سیاسی هەندێکجار بەشێوەیەکی کامڵ و هەندێکجار بەشێوەی کەموکوڕ لەناو ببات.

ئەکرێ بوترێ فاشیزمی ئیتاڵی کامڵترین شکڵی ئەم دیاردەیە و باشترین نمونەی رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی بوو. لەراستیدا فاشیزمی ئیتاڵی بە رونی باڵاتربونی رەهای دەوڵەتی وەک بەهایەکی بەرین راگەیاند و تەنانەت خۆی لەگەڵ دەوڵەتدا بەیەک شت ئەژمار کرد، لەبەر ئەوە ئەکرێت فاشێزمی ئیتاڵی بە «دەوڵـەتـسـالاری» پیناسبکەین. مۆسۆلۆنی لەمبارەیەوە ئەنوسێت: «هەرکاتێک مانای لیبرالیسم بە تاکەکەس بزانین، ئەوا فاشیسم بەمانای دەوڵەتە«. مۆسۆلۆنی هەروەها بنەما سەرەکیەکانی مۆدێرنەی سیاسی بە ئاشکرا رەد ئەکاتەوە و رایئەگەیەنێت: « لەراستیدا ئێمە نوێنەرایەتی جەمسەری دژ(...) هەموو بنەما نەمرەکانی (شۆڕشی) ١٧٨٩ ئەکەین». مۆسۆلۆنی بەتایبەتی بە ئاشکرا دژی لیبرالیزم و تاکگەری رائەوەستێت: «وەک ئەزانین لیبرالیزم بە ئاراستەی بەرژەوەندی تاک، نەفی دەوڵەت ئەکات، بەڵام فاشیزم سەرلەنوێ دەستئەکات بە سەلماندنی دەوڵەت وەک بونی راستەقینەی تاک». بەمشێوەیە مۆسۆلۆنی تاک تەنها لە پەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە رەچاو ئەکات و تاکیش لە پەیوەندیدا بە دەوڵەتدا پێناس ئەکات: «تاک تەنها لەو رووەوە بونی هەیە کە لە ناو دەوڵـەتـدا پـەیڕەوی پێداویستیەکانی دەوڵەتە«. ئاشکرایە تێڕوانینێکی وا ئەگات بە رەهـاسـازی دەوڵــەت و تاک و گروپەکان ئەکاتە فەرمانبەری دەوڵەت: «لە دیدی فاشیزمەوە دەوڵەت رەهایەکە کە تاک و فروپەکان لەبارامبەریدا رێژەیین. بەڵێ تاک و گروپەکان تەنها لەناو دەوڵەتدا قابیلی دەرکردنن». دیارە ئەبێت سەرنجی ئەوە بدەین کە فاشیزم ننەفیکردنی تاکەکەس قەبوڵناکات، بەڵکو پێشنیاری تێگەیشتنێکی تازە بۆ تاکەکەس ئەکات:

«لە دەوڵەتی فاشیستیدا تاک ناشرێتەوە، بەڵکو زۆر ئەبێت، رێک وەک چۆن سەرباز لە مەفرەزەدا کەم نابێتەوە، بەڵکو لەگەڵ هاوخەباتەکانیدا زیاد ئەبێت».

ئەو ئـازادیـەی فاشیزم خـوازیـاری دابینکردنێتی بریتیە لە «ئـازادی دەوڵـەت و ئازادی تاکە لەناو دەوڵەتدا» کە ئازادی دەستەجەمعی دێرێن بە بیر دێنێتەوە. لەمڕووەوە دەوڵەتی فاشیستی «ئازادیە سەرەکیەکان» ئەپارێزێت و «ئازادیە بێهودە یان زیانبەخشەکان» سنوردار ئەکات: «لەم ئاستەدا تەنها دەوڵەت داوەرە و نەک تاکەکەس». بەڵێ تاک خاوەن بونێکی تایبەت نیە تەنها لەناو دەوڵەت و بە هۆی دەوڵەتەوە خاوەن ئازادیە: «تاک لێرەدا خاوەن ئازادیەکی زیاترە سەبارەت بە تاکی گۆشەگیر، چونکە دەوڵەت پارێزگاری لە تاک ئەکات و تاک بە بەشێک لە دەوڵەت دائەنرێت». فاشیزم تەماشای تاکەکان وەک بونەوەرانێکی گۆشەگیر و دەربەست ناکات، بەڵکو وەک ئەندامانی دەوڵەت تەماشایان ئەکات کە پەیوەستن پێوەی و تەنانەت خۆیان لەگەڵیا بە یەک شت ئەزانن: «تاکەکان بەر لە هەر شتێک و بە تایبەتی هەمان دەوڵەتن». بەڵام دەوڵەتی فاشیستی ئەگەرچی لافی مۆدێرنبون لیئەدا، بە رونی وەک دەوڵەتی پێشمۆدێرن سەرهەڵئەدات کە نە تاک وەک تاک بە فەرمی ئەناسێت و نە جێیەک بۆ سەربەخۆی راستەقینە ئەهێڵێتەوە.

ســەرەڕای ئەمانە دەوڵــەتــی فاشیستی هەموو شتیکە، کامڵ و تـەواو و تەنانەت «تۆتالیتار» (وشەی تۆتالیتار لە دروستکردنی مۆسۆلۆنیە) و بێ هیچ پەردەپۆشیەک خۆی وا ئەناسێنێت. ئەمە دەوڵەتیکە هەموو شتێک لەخۆیدا جێ ئەکاتەوە، هەموو شتێک رێک ئەخات و هەموو شتێکیش رابەرایەتی ئەکات. فۆرمەلەکەی مۆسۆلۆنی کە ئەڵێت: «هەموو شتێک لەناو دەوڵەتدا، هیچ شتێک دژی دەوڵەت، هیچ شتێک لە دەرەوەی دەوڵەت» لێرەوە سەرچاوە وەرئەگرێت. لیرەوە مۆسۆلۆنی بە ئاشکرا پێشنیاری «دەوڵەتێکی تۆتالیتار واتە دەوڵەتێک» ئەکات «کە هەموو ووزە، بەرژەوەندی و هیواکانی نەتەوە لەخۆ بگرێت بۆ ئەوەی بیانگۆڕێت و بەهێزیان بکات». فاشیزم جیابونەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت قەبوڵ ناکات و لەبنەڕەتدا رەدی ئەکاتەوە و بە تەواوی نامۆیە بە بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ. بەمشێوەیە دەوڵەت هەموو کۆمەڵگا کە فەرمانبەرێتی، لە خۆیا نوقم ئەکات. لێرەوە دەوڵەت ئەبێتە قەدەری دەسەڵات و دەست ئەخاتە ناو هەموو بوارەکانەوە لە ژیانی سیاسی و سەندیکایەوە بیگرە تا ئابوری و کەلتور، خیزان و تەنانەت دینیش. ئەمە «دەوڵەتێکە هەموو هێزە بکەر و کاراکانی ناو نەتەوە« بەتایبەتی هێزە ئەخلاقی و ئابوریەکان «کۆنترۆل ئەکات».

لەئەنجامدا «لــەدەرەوەی چنگی دەوڵــەت نە تاکەکان ئەتوانن بونیان هەبێت و نە (گروپەکانی وەک حیزبی سیاسی، ئەنجومەنەکان سەندیاکان و چینەکان)». لەسەر ئەم بناغەیە لە کرداردا حیزبە سیاسیەکان بە قازانجی تاکە یەک حیزب لابراون، پۆلەکان لەبری سەندیکاکان دانیشتون و چالاکیە ئابوریەکان لە چوارچێوەی ئەو پۆلانەدا رێکخراون کە فەرمابەری دەوڵەتن.دەوڵەتیش رەهەندێکی پۆلی بەخۆیەوە گـرت و ئـەو دەزگـا پۆلیانەی لەخۆئەگرێت کە ئەگەری کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگای بۆ دەستەبەر ئەکەن. هەروەها دەوڵەت چاودێری هەواڵ و زانیاریەکانی ئەکرد و بۆ لە قاڵبدانی رای گشتی، دەستی بە پڕوپاگەندەیەکی بەربڵاو ئەکرد. دەوڵەتی فاشیستی تا ئەو جێگەیە رۆیشت کە تەنانەت دینیشی لەخۆیدا توانەوە، واتە رەهەندێکی مەزهەبی وەرگرت و خۆی بە کاسۆلیک ئەژمار کرد. مۆسۆلۆنی لەمباریەوە دەڵێت: «دەوڵەتی فاشیستی

کاسۆلیکە (...) و ئێمە بە ئاشکرا رایئەگەیەنین کە کاسۆلیسم بە بەشێکی تەواوکاری دائەنرێت». لێرەوە رابەر (دۆچە Duce) بەشێوەیەکی سروشتی گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٩دا لەگەڵ پەیمانی «لاترن»دا کاسۆلیسم وەک دینی دەوڵەت بە فەرمی بناسێت». لە دیدی فاشیزمدا دەوڵەت لە نەتەوەش هەم لەپێشترە و هەم باڵاترە، چونکە دەوڵەت نەتەوەی دروستکردووە، نەک بە پێچەوانەوە. فاشیزم تێڕوانینی «سروشتیئامێزی» یان ئەتنی بۆ نەتەوە بە قازانجی تیڕوانینی ئاخلاقی یان سیاسی بۆ نەتەوە رەد ئەکاتەوە. لە دیدی مۆسۆلسنیەوە «بەپێچەوانەی تێڕوانینی کۆنی سرۆشتیئامێزەوە) کە بناغەی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بوو، لەراستیدا نەتەوە دەوڵەتی دروست نەکردووە، بەڵکو»بەپیچەوانەوە دەوڵەت نەتەوەی دروستکردووە و ئیرادە و بونێکی کارای بەو خەڵکە بەخشیووە کە هوشیاربون بە یەکێتی ئەخلاقی خۆیان». لەراستیدا فاشیزم بە پراکتیکی دەوڵەت لەگەڵ نەتەوەدا وەک «واقعێکی ئەخلاقی» یا سیاسی بە یەک شت ئەزانێت: «نەتەوە وەک دەوڵەت، بە واقعێکی ئەخلاقی ئەژمار ئەکرێت کە بە هۆی گەشەکردنی خۆیەوە هەیە و ئەژی». لە بڵاوکراوەی کاری (١٩٢٧)دا هاتووە کە نەتەوەی ئیتاڵیا «ئەو یەکێتیە ئەخلاقی، سیاسی و ئابوریەیە کە لە دەوڵەتی فاشیستیە بەتەواوی بەدیهاتووە«. بەمشێوە فاشیزمی ئیتاڵیای بە سوربون لەسەر لەپیشبون و باڵاتربونی دەوڵەت و سوربون لەسەر خەسلەتی تۆتالیتاریەکەی، بە کردەوە هیچ جێگەیەکی بۆ کۆمەڵگای سەربەخۆ و بەکارهێنانی ئازادیە فەردیەکان ناهێڵێتەوە و بەمشێوەیە مۆدێرنەی سیاسی رەد ئەکاتەوە کە ئیتاڵیا هێشتا پێی نەگەیشتبوو. فاشیزم شێوەیەکی تازەی دەوڵەتی پێشمۆدێرنی بەرپاکرد کە نیشانەی

**سالاریسم لە پورتغال سیستەمێکی نۆیخوازانەی بەرهەمهێنا کە هەم لە فرانکۆیسم و هەم لە فاشیزمو ئیتاڵیا جیا ئەبێتەوە و بە سێ ئاماژە کە لەخوارەوە ئەیهێنینەوە لەگەڵ فاشیزمدا جیاواز دەرئەکەوێت: یەکەم پێداگری لەسەر نەتەوە زیاتر لە دەوڵەت ئەکات و لە دیدی ئەوەوە نەتەوە دەوڵەت دروستئەکات(لێرەوە ئەکرێت بوترێت لەمڕووەوە لەگەڵ فاشیزمدا هاوڕا نیە**

گەڕانەوە بۆ دواوەیەکی سیاسی بوو لەم وڵاتەدا. بەڵێ پاش روخانی فاشیزم، ئیتاڵیا گۆڕانکاری خۆی لەسەرەوە دەستپیکردەوە و دواجار بە مۆدێرنەی سیاسی گەیشت. ئەڵبەتە نابێت ئەوە لە یاد بکرێت کە فاشیزم هێشتا هەندێکجار حەسرەتی سەردەمی رابـردوو ئەورژێنێت و جێ پێی لە خۆشی بەجێ هێشتووە.

لە ئەوروپا شێوەی تری فاشیزم سەریهەڵدا کە ئەگەرچی کەمتر لە فاشیزم ئیتاڵی رادیکال بوون، بەڵام بەشێوەی تر و لە ئاستێکی بچوکتردا رێگریان لەبەردەم مۆدێرنەی سیاسیدا دروستکرد. فرانکۆیسم لە ئیسپانیا و سالاریـزم لە پۆرتوغال نمونەی بەرجەستەیین. هەرچەندە ئەم دوو وڵاتـە پاش جەنگی جیهانی یەکەم هەنگاوە سەرەتاییەکانیان لە رێی مۆدێرنەی سیاسیدا نابوو، بەڵام گۆڕانیان بەهۆی دروستبونی رژێمە ستەمکارەکانەوە لە پیشەکەوتن راوەستا کە ئەتوانرێ بگوترێ پێشتر نەریتخواز و پارێزگار بون، تاکو فاشیزمی راستەقینە. ئەم رژێمانە پاش جەنگی جیهانی دوهەم هەروا مانەوە تا دواجار لە ناوەڕستی دەیەکانی حەفتاکاندا (سەدەی بیست) روخان و پاش ئەوە مۆدێرنەهی سیاسی لەم وڵاتەندا مومکین بوو.

فرانکۆیسم کە پـاش کودتایەکی سـەربـازی و شەڕێکی ناوخۆ، خۆی سەپاند بە تامەزرۆیی بۆ بەها نەریتیەکان (رێکخستن، دەسەڵات، پلەوپایە، موڵکایەتی ودین) ئەناسرێتەوە. جگە لەمە فرانکۆیسم پشتی بە هێزە پارێزگاریکارەکان و بەتایبەتی سوپا، کەنیسەی کاسۆلیک و تاکە حیزب بەستبوو. ئەم تاکە حیزبە واتە حیزبی فالانژ «ئەگەرچی خۆی وەک رێکخراوێکی نێوەندی نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت» ئەناسێنێت، بەڵام بەرنامەکەی بوو بە بەرنامەی دەوڵەت. لەراستیدا فرانکۆیسم رێگەی جوڵەی بەرەو مۆدێرنەی گرت و هەموو ئەوانەی ئەیتوانی مۆدێرنەی سیاسی مومکین بکات (وەک: لیبرالیسم، ئازادیە گشتیەکان، مافەکانی مرۆڤ) رەد ئەکاتەوە.

بە گشتی فرانکۆیسم بالاتربون و لە پێشبونی کۆمەڵ بەسەر تاکدا ئەسەلمێنێت و نەک تاک، بەڵکو خێزان بە خانەی کۆمەڵگا ئەزانێت. لە دیدی فرانکۆیسمەوە دەوڵەت بە ئامرازێک ئەزانرێت لە خزمەتی نیشتیماندا کە بە یارمەتی تاکە حیزب، رێکراوی پۆلینی و کەنیسە، کۆمەڵگا رابەرایەتی و کۆنترۆڵ ئەلات و بەم مانایە دەوڵەتێکی ستەمکارو تەنانەت تۆتالیتارە. فرانکۆ خوازیاری «دەوڵەتێکی بەرپرسیار و تۆتالیتار» بوو «کە بتوانێت رینمایی نەتەوە بکات و رێگەیەک دیاری بکات کە بێ هیچ دودڵـی و لادانێک ئەیەوێت نەتەوە تیایدا بەرەو پێش بـەرێـت». بەڵێ بە گەیشتنە دەسەڵاتی فرانکۆیسم جیزب و سەندیکاکان لابران و گەرچی دەستوری ئیسپانیەکان لە ساڵی ١٩٤٥دا ئازادیە بنەڕەتیکانی ئەسەلماند، بەڵام حکومەت ئەیتوانی هەمویان بەشێوەیەکی کاتی لەکار بخات. لێرەشدا وەک ئیتاڵیای فاشیست، کسۆلیسم مەزهەبی فەرمی دەوڵەت بوو و لەنێوان کەنیسە و دەوڵەتدا پەیوەندی تەنگاوتەنگ هەبوو، لەرستیدا کەنیسە سەر بە دەوڵەت بوو. لەم ئاستەدا کەنیسە دەورێکی رەمزی لە رژێمدا ئەبینی و کاریگەریەکی ئایدۆلۆژی لە خزمەتی رژێمدا هەبوو.

ئەم ئاماژانە هەمویان دەرخـەری ئەو راستیەن کە لە ئیسپانیای فرانکۆستی نە باسی دەوڵەتی مۆدێرن لە ئارادا بوو نە باسی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ. بەمشێوەیە دەوڵەتی فرانکۆستی بێ ئەوەی دیکتاتۆرێکی فاشیستی واقعی بێت، وەک جۆرێک لـەدەوڵـەتـی پێشمۆدێرن دەرکـەوت کە حەسرەتی بۆ مەزنێتی رابردوو هەبوو، و چاودێری پاراستنی رێکخستنی جێگیر بوو بوو. بەڵێ دەوڵەتی فرانکۆستی هێواش هێواش گۆرا و زەمینەی بۆ

پاشایەتی دەستوری ئامادەکرد. ئەم رژێمە پاش مردنی فرانکۆ لەساڵی ١٩٧٥دا بەتەواوی دیار نەما و ئیسپانیا توانی بە خێرایی پی بنیتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە.

سالاریسم لە پورتغال سیستەمێکی نۆیخوازانەی بەرهەمهێنا کە هەم لە فرانکۆیسم و هەم لە فاشیزمو ئیتاڵیا جیا ئەبێتەوە و بە سێ ئاماژە کە لەخوارەوە ئەیهێنینەوە لەگەڵ فاشیزمدا جیاواز دەرئەکەوێت: یەکەم پێداگری لەسەر نەتەوە زیاتر لە دەوڵەت ئەکات و لە دیدی ئەوەوە نەتەوە دەوڵەت دروستئەکات (لێرەوە ئەکرێت بوترێت لەمروەوە لەگەڵ فاشیزمدا هاوڕا نیە). سالازار ئەڵێت: «ئێمە ناسیۆنالیزمی پۆرتوگالی بە بناغەی نەمری دەوڵەت تازە داناوە« .باسی نەتەوەیەکی مێژوویە کە بە دێژایی سەدەکان شکلی وەرگرتووە و هەنوکە یەکێتی خۆی بەرجەستە ئەکات: «لە دیدی ئێمەوە نەتەوەیەک یەکتا و نەمرە«. نەتەوە لە دەوڵەت گرنگتر و بونی هەستپێکراوترە. لە راستیدا پۆرتوغال بە بەهێزی نەتەوە لاوازی دەوڵەت ئەناسرێتەوە. هەرچەند حەشامەتی خەلکی خاوەن «هوشیاریەکی نەتوەت بەهێزن» بەڵام خاوەن «هوشیاریەکی سیاسی سەقامگیر»یان نیە. لە ئەنجامدا «نەتەوە لەبەردەست هەمواندایە و دەوڵەتیش لەبەردەسر ژمارەیەکی کەمدا».

دوهەم سالازاریسم دەوڵەتی تۆتالیتار رەد ئەکاتەوە «دەوڵەتێک کە بێ ئاوارتن هەموو شتێک سەر بە ئایدیای نەتەوە یان نەژاد» ئەزانێت و «هەموو دەرکەوتە فەردی و جەمعیەکان» ئەبیت پەیڕەوی لێبکەن. هەرچەند سالازاریسم پێشنیاری «دەوڵەتێکی بەهێز» ئەکات، بەڵام ئەم دەولەتە «ئەخلاق، بنەماکانی مافی مرۆڤ، زەمانەتەکان و ئازادیە فەردیەکان سنورداری ئەکەن». هەروەها حیزبی یەکتای لەوروەوە رەد ئەکردەوە کە بە تۆتالیاتریسمی دەوڵەت ئەگات. سالازاریسم هەوڵئەدات بۆ تاکەکان، خێزانەکان، پۆلەکان و بەرێوبەرایەتیە پۆلەکان چەند زەمانەتێکی پێویست دەستەبەر بکات و لەم ئاستەشدا ئازادی باوەڕ و بیروڕا و هەروەها ئازادی ئەنجامدانی فەرزە دینیەکان ئەسەلمینێت.

سێهەم: سالاریزم تێکەڵ بونی دین و سیاسەت رەدئەکاتەوە و بڕوای وایەنە کەنیسە ئەبێت دەستبخاتە ناو کاروباری دەوڵەتەوە و نە دەوڵەتیش لەکاروباری دینیدا. لە ئەنجامدا جیابونەوەی کەنیسە لە دەوڵەتی پاراست کە کۆماری پۆرتۆغال —وەک نیشانەی مۆدێرنەی سیاسی– لەساڵی ١٩١١دا رایگەیاندبوو.

ئەم هەڵوێستە لەراستیدا هەم ئازادی کەنیسەی بەدوای خۆیدا هێنا و هەم سنورداریتی دەسەڵاتی سیاسی. دیارە ئەم جیابونەوەیە رێگەی لە دروستکردنی پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ ڤاتیکان و تەنانەت واژۆی رێکەوتننامەی لەگەڵیدا لەساڵی ١٩٤٠دا نەگرت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گەرچی سالازاریسم جیاوازی زۆری لەگەڵ فاشیزمی ئیتاڵیدا هەبوو. بەڵام نابی ئەوە لەبیر بکرێت کە لەگەڵ مۆدێرنەی سیاسیدا —کە بە رەگەیاندنی کۆمار لە ساڵی ١٩١٠دا دەستی پێکردبوو– ناکۆک بوو و ئامانجیشی پاراستنی دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن بوو کە لەسەر بناغەی بەها نەریتیەکانی وەک نەتەوە، دەسەڵات و ئەخلاق راوەستابوو. جگە لەمە بە ئاشکرا ئازادیخوازی و دیموکراسی رەدئەکردەوە و لایەنگری دەوڵەتێکی ستەمکارو دەستێوەردەر بوو، چونکە ئەبوو دەسەڵاتی دەوڵەت، لاوازی نەتەوە پارسەنگ بداتەوە .سالازار گرنگی هۆکاری سیاسی لە پۆرتۆغالدا بە دوو هۆ رونئەکاتەوە: یەکەم دەوری روو لە زیادی دەوڵەت، لەراستیدا « بە هەزار شیوە دەستێوەردان و هەزار

شیوە تواناکانی خۆی ، سنورداریێتی و ڕێنمایی پیویست بەسەر پەرەسەندنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەسەپێنێت. دوهەم «لاوازی ژیان لە پۆرتوغال» چونکە لە زۆرێک لە بوارەکاندا (خێزان، ئابوری، کلتور، وەرزش و..)»هەموو شتێک بەستراوە بە سودبەخشی یان زەرەرمەندی دەسەلاتی سیاسیەوە یان وا دەرئەکەوێت کە بەستراوە پێوەی». لەراستیدا گرنگی دەولەت لە پورتوغالدا دەرئەنجامی گەشەنەکردن و پینەگەیشتنی کۆمەڵگای مەدەنیە و لە ئەنجامدا بە ناچاری دەولەت دەست ئەکات بە ڕێکخستن و کۆنترۆلی کۆمەڵگا مەدەنی. بەڵێ سالازاریسم کە تەمەنی نزیک نیو سەدە درێژ بووە، گەرچی بنەماکانی مۆدێرنەی سیاسی ڕەد کردەوە، بەڵام بە ئاسانکردنی گەشەکردن و پەرەسەندنی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی ناهوشیارانە بەشداری لە دروستبونی مۆدێرنەی سیاسیدا کرد. هەرچەندە سالازاریسم بەهۆی خەسڵەتی پاریزگارانەی و نەریتیانەی خۆی بەردەوام چاوێکی لەسەر رابردوو بوو، وە دەولەتی تازەی (Estadeo Novo) پورتوغال لەراستیدا هیچ نەبوو جگە لە دەولەتی پێشمۆدێرن، بەڵام سەرەڕای خەسڵەتی ستەمکارانە و دەستێوەردانی، زەمینەی شکڵگیری دەولەتی مۆدێرن و کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ دەستەبەر کرد.

لە فەرانسەدا وڵاتیک کە مۆدێرنەی سیاسی لەزووەوە بە سەقامگیریەوە مۆدێرنەی سیاسی پێی خۆی تیا قایم کردبوو، رژێمی ڤیشی وەک گەڕانەوەیەکی سیاسی دەرکەوت. ئەم رژێمە بە لابردنی دەولەتی کۆماری، لەراستیدا مۆدێرنەی سیاسی رەد کردەوە و گەڕانەوە بۆ دەولەتی پێشمۆدێرنی هێنایە دی. گەرچی هەلومەرجی فەرەنسا لەو قۆناغەدا لەگەڵ ئیتاڵیای فاشیستدا لیک نە ئەچوو، و رژێمی ڤیشی هەم کورتخایەنتر و هەم لاوازتر بوو لە رژێمی مۆسۆلۆنی، بەڵام چەندان ئاماژە بە رونی دەریئەخات کە ئەم رژێمە ئەگەرچی هەندێک تازەگەری ئیداری و ئابوری دەستەبەر کرد، بە هۆی ئەوەوە کە سەربەخۆیەکی بچوکی بۆ کۆمەڵگای مەدەنی هێشتبۆوە، ئەوا لەراستیدا ئەیویست بگەڕێتەوە بۆ نمونەی دەولەتی پێشمۆدێرن.

سەرەتا رژێمی ڤیشی بەها بنەڕەتیەکانی شۆرشی ١٧٨٩ی بە تایبەتی ئازادیخوازی و تالباوەڕی واتە بناغەکانی مۆدێرنەی سیاسی رەد کردەوە، و لەبری ئەم بناما ئەبستراکتانە (و دەرکەوتە خراپەکانی وەک راپرسی گشتی و پەرلەمانتاریسم) مرۆڤی دیاریکراو و پێکەوەبونە سروشتیەکانی وەک خێزان، پیشەوەری و نەتەوەی دانا. دروشمی پارێزگارانەی «کار، خێزان، نیشتیمان» لەبری دروشمی شۆرشگێڕانەی «ئازادی، یەکسانی، برایەتی» دانا و بنەماکانی کۆمەڵی وەک راگەیاندنی ماف و ئەرکەکان، لەبری راگەیاندنی مافەکانی ١٧٨٩ دانا. لەم راگەیاندنەدا بەرونی هاتووە کە گەرچی «مافە بنەڕەتیەکانی خۆی قەرزاری سروشتە، بەڵام ئەم مافانە ئەو پیکەوەبونانە زامنی ئەکات کە لە خۆیان گرتووە. وەک ئەو خێزانەی کە پەروەردەی ئەکەن، ئەو پیشەیەی کە نانی ئەدەنی و ئەو نەتەوەیەی لە پارێزگاریان لیئەکات».

لەم ئاراستەیەدا هەروەها لەپێشبون و باڵاتربونی کۆمەڵگا بەسەر تاکدا و بەرژەوەندێ گشتی بەسەر بەرژەوەندی شەخسیدا بەرونی سەلمێنرا. تاک بە بەشێک لە گشت ئەژمێرێرا، گشتێک کە لە تاک زیاتر ئەڕوات و ئەبێ تاک لە خزماتیدا بێت: «ئەو هاوڵاتیەی کە بەدوای چاکەی خۆدیدا لەدەرەوەی بەرژەوەندی گشتی ئەگەڕێت. لەراستیدا دەستی داوەتە کارێک دژی خۆی و تەنانەت دژی بەرژەوەندیەکانی خۆی. تاکەکان کار و دەرامەت و تەنانەت ژیانی خۆیان قەرزاری نیشتیمانن». مارشال پتن جەخت

لەو خاڵە ئەكات كە «چارەنوسی پەتی تاك نیە و فەرەنسیەكان تەنها بەهۆی فەرەنساوە هەن». مارشال پتن بەشیوەیەكی رێكخراو تاكباوەڕی رەخنە ئەكات و بە بەرپرسیاری بەدبەختیەكانی خەڵكی فەرانسای ئەزانێت: «تاكباوەڕی كە لەرابردودا خەڵكی فەرانسا وەك ئیمتیازێك شانازیان پێوە ئەكرد. لەراستیدا سەرچاوەی ئەو رەنج و گرفتاریانەیە كە خەریكبوو لەناویان ببات». لە دیدی مارشال پتنەوە تاكەكان كۆمەڵگا دروستناكەن، بەڵكو كۆمەڵگا بە دروستكەری تاكەكان ئەژمێرێن: «وەك كۆمەڵناسی مۆدێرن پیشانی داوە سروشت كۆمەڵگا لەسەر بنەمای تاكەكان دروستناكات،بەڵكو تاكەكان لەسەر بنا×ەی كۆمەڵگا دروست ئەكات». لێرەوە تاكەكەس بەهۆی كۆمەڵگاوە و بە هۆی كۆمەڵگاوە و بۆ كۆمەڵگا ئەژی: «تەنیا جۆشوخرۆشی گشتیە كە مانا بە ژیانی تاك ئەبەخشێت و ئەمكارەش بە بەستنەوەی ژیانی فەردی بە شتێكەوە كەسەروتر لەو ئەڕوات، پەرەی پیئەدات و شكۆمەندی ئەكات بەئەنجام ئەگەیەنێت». تاكباوەڕی سەبارەت بە كۆمەڵگا «دەوری مشەخۆر» ئەبینێت و «بە ناچار بە لارێی ئاژاوەدا ئەڕوات». لێرەوە تەنها گشتباوەڕیە كە ئەتوانێت چاكسازی لەم هەلهومەرجەدا بكات. لە ئەنجامدا پتن «بنەما نادروستەكانی تاكباوەڕی» رەد ئەكاتەوەئەیەوێت تاكناوەڕی كە «وێرانكەری خێزان و كار و نیشتیمانە« لەناو ببات. بەمشیوەیە رەدكردنەوەی تاكباوەڕی هاوكات لەگەڵ رەدكردنەوەی مۆدێرنەی سیاسیدا بە ئەنجام گەیانرا. «ئەو دەوڵەتە فەرەنسیەی» كە رژیمی ڤیشی ئەیویست بەرپای بكات، دژی دەوڵەتی مۆدێرن بوو، «شۆڕشی نەتەوەیەكەی» لەراستیدا جگە لە دژە شۆڕش نەبوو كە پێشنیاری گەرانەوە بۆ فەرەنسای تەقلیدی و پێش شۆڕشی ئەكرد. لەراستیدا هەوڵیاندا یەكێتی پێكەوەبونی نەتەوەیی سەرلەنوێ بینا بكەنەوە و جیابونەوەی دەوڵەت و كۆمەڵگا لەناو ببەن. ئەم هەوڵە بووە هۆی سنورداریێتی و لەناوبردنی زیاتری ئازادیەكان و لێرەوە بووە هۆی رێگرتن كە هەبوونی كۆمەڵگایەكی مەدەنی سەربەخۆ. بەمشیەوەیە حیزبە سیاسیەكان بە فەرمی و سەندیكاكان بە پراكتیكی لابران. ئازادی راگەیاندن قەدەغەكرا و دەزگاكانی هەواڵ (رۆژنامەكان، گۆڤارەكان، رادیۆ) سانسۆر كران یان خرانە ژێر چاودیری دەوڵەتەوە. راپرسی گشتی وازی لیهێنرا و چیدی هەڵبژاردن روینەدا. ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگا و ئەنجومەنی قەزاكان (لەو ناوچانەی زیاد لە دوو هەزار دانیشتوی هەیە) دەولەت دائیەنا و هیچ هەڵبژاردنیك لەئارادا نەبوو. تەنانەت پێشنیاری پۆلینكردنی ویلایەتی پێش ساڵی ١٧٨٩ و لابردنی پۆلێنكردنی پارێزگاكان (كە شۆڕشی فەرەنسی ئەنجامیدابوو) كرا.

هاوكات لەگەڵ ئەم هەنگاوانەدا دەوڵەت بۆ رێكخستن و رێنمایی كۆمەڵگا و چالاكیە جۆراوجۆرەكانی بەتایبەتی چالاكیە ئابوریەكان، تێوەردانی (موداخەلە) ئەكرد. گەرچی دەوڵەتی ڤیشی تۆتالیتار بەبوو، بیرۆكەی حیزبی یەكتاشی كە سەردەمێك هینرایە ئاراوە بە زووت لابرد، بەڵام بەردەوام ئازەروی دەوڵەتێكی بەهێز و ستەمكارانەی لەسەردا بوو. ئەم دەوڵەتە هەوڵی ئەدا لە رێگەی جیاجیاوە كۆنترۆڵی كومەڵگا بكات بە تایبەتی بە یارمەتی رێكخراوی وەك «رێكخراوی خەباتگێران» (كە خەباتگێرانی جەنگەكانی رابردوی لە خۆی كۆكردبووە و دەوریكی سیاسی و ئایدۆلۆژی لە خزمەتی رژێمدا هەبوو)، «یارانی فەرەنسا» و «رێكخراوی لاوان» (كە بەرپرسیارێتی ریخستنی لاوانی لە ئەستۆ گرتبوو)، پۆلەكان و سیستەمی پۆلەكان (كە خەریكی ریكخستنی چالاكیە پیشەییەكان بوون) و دواجار میلیس (كە رەفتارێكی وەك پۆلیسی سیاسی هەبوو). دەوڵەت لە بواری

ئابوریشدا تێوەردانێکی بەرفراوانی هەبوو، بەوشیوەیە کە بەدەستبەسەراگرتنی پیشەگەری، بەرهەمهێنانی رێکئەخست و رێنمایی ئەکرد و باڵادەستی خۆی بەسەر پیشەسازی (بە هاوکاری ئەو کۆمیتانەی لە هەموو لقەکانی پیشەسازیدا دروستکرابون) و کشتوکاڵ (لەرێگەی پیشەی جوتیارانەوە) و کاری ئازاد (لە رێگەی سیستمە جیاوازەکانی پیشەییەوە) بەکار ئەهێنا. دەوڵەت سەرەڕای ئەمانە لەهەندێک بواری تازە دروستوو یان زیندودا (وەک شارسازی، تەداروکات، ئازوقە گەیاندن) دەورێکی چارەنوسسازی ئەبینی. ئەمجۆرە تێوەردانە فراوانە گەشەکردنی دەزگای ئیداری دەوڵەتی هاوکات لەگەڵ زیادبونی کارمەندەکاندا بەدوای خۆیدا هێنا (لەم قۆناغەدا ژمارەی کارماندانی دەوڵەت ئەوەندەو نیوی لێهات). رژێم هەروەها هەوڵیدا تا بە کۆنترۆڵکردن هەموو دەزگاکانێ هەواڵ دەستبەسەراگرتنی پرۆپاگەندەی نەخشەبۆداڕێژراو لە بڵاوکراوەکان و رادیۆ و سینەمادا، بیـروڕای خەڵکی فورمەلە بکەن. کۆمیتەکانی پڕوپاگەندەش پەیدا بون کە درێژیان بە ریبازی کەسایەتی مارشال پتن ئەدا. هەرچەند ژیابونەوەی دەوڵەت و کەنیسە دەست لێنەدراو مابۆوە، بەڵام پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دوانە تێکئاڵا و ئەکریت بۆ نمونە باسی بەخشینی هەندێک ئیمتیازات بۆ کەنیسەی کاسۆلیکی بکرێت (وەک یارمەتیدانی فێرگە مەزهەبیەکان، گێڕانەوەی هەندێک لە دارایی و سامانە مەزهەبیەکان بۆ کەنیسە، گۆڕانی هەلومەرجی یاسایی کومەڵە دینیەکان، لوخۆشبونی باج، دوبارە بیناکردنەوە و چاککردنەوەی بینا مەزهەبیەکان). کەنیسەی کاسۆلیکیش لەبری ئەمە کەوتە پشتیوانی کردنی رژێم وسەرکردەکەی.

رژێم بە ئامانجی بیناکردنەوەی نەتەوە ئەیویست دوبـارە پێکەوەبونی نـەتـەوەی سـەر لـە نوی ریکبخاتەوە و لە رەگـەزە نـەخـوازرەواکـان پاکی

**لە ئەڵمانیا ناسیۆنال سۆسیالیزم مۆدێرنەی سیاسی بەتەواوی رەدکردەوە، لێرەوە وەك نەفیکردنی کامڵی مۆدێرنە سیاسی دەرکەوت. دەولەتی نازی زیاتر لە دەوڵەتی فاشیست ئیتاڵیا دژی دەوڵەتی مۆدێرن بوو و لەوروەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی بەتەواوی توانەوە یان خنکان، بە دەوڵەتیکی تۆتالیتار ئەژمێرا.**

بکاتەوە. بەمشێوەیە دەزگـا ئیداریەکانیان پاک کردەوەو فراماسۆنەکان و یەهودیەکانیان لە هەندێک بەڕیوبەرایەتی دەوڵەتی و هەندێک کار کردە دەرەوە. بۆ یەهودیەکان پێگەیەکی یاسایی تایبەتیان رەچاوکرد کە بە دوو یاسا (یەکەم لە ئوکتۆبەری ١٩٤٠دا و دوهەم لە یۆنێۆی ساڵی ١٩٤١دا) سەقامگیر کرا و بە کـردەوە یەهودیەکان بوون بە هاوڵاتی پەراویزخراو و تەنانەت هەندێک یەهودی نەتەوەی فەرەنسی خۆیان لەدەستدا (لەوانە ئەو یەهودیانەی دانیشتوی جەزائیر بوون). ئەبێت سەرنجی ئەوە بدەین کە یاسای سێهەم ئۆکتۆبەری ١٩٤٠ پیناسی یەهودی نەک لەسەر بنەمای دین، بەڵکو لەسەر بنەمای رەگەز ئەکرد. ئەم تێگەیشتنە بە تەواوی تێڕوانینی قەومی بۆ نەتەوە پیشان ئەدات لە لەگەڵ مۆدێرنەی سیاسیدا ناگونجێت. زۆری پێ نەچوو کە چەوساندنەوەی ئازادی بە نەفی جەستەیی زۆرێک لە یەهودیەکان گەیشت (کە زوربەیان خەڵکی دەرەوە بون) لە ساڵی ١٩٤٢ ئەمانەیان دەستگیر کرد و

ڕەوانەی ئۆردوگاکانی مەرگیان کردن.
بەمشێوەیە ڕژێمی ڤیشی تێڕوانینی قەومی بۆ نەتەوە لەبری تێڕوانینی سیاسی بۆ نەتەوە دانا و بە دانانی کۆمەڵگا لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا و بە بەگەڕخستنی ئابوریەکی ئاراستەکراو، چاوپۆشی لە مۆدێرنەی سیاسی کرد. لە ئەنجامدا کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆی خۆی لەدەستدا و دەوڵەتی فەڕانسا وازی لە مۆدێرن بون هێنا. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕژێمی ڤیشی تەمەنێکی کورتی هەبوو (تەنیا چوار ساڵ) و بە هۆی فەرمابەرداری لە داگیرکەرانی ئەلمانی خاوەن نفوزیکی ئەوتۆ نەبوو. لەراستیدا ڕژێمی ڤیشی ئەکرێت بە کەوانەیەکی کورت لە میژوی وڵاتدا بزانرێت کە خاوەن نەریتێکی دێرینی مۆدێرنەی سیاسیە. ڕێک لەبەر ئەمەم فەڕەنسا پاش ئازادی بە خێرایی روی کردە مۆدێرنەی سیاسی.

### ناسیۆنال-سوسیالیزمی ئەڵمانی:

لە ئەڵمانیا ناسیۆنال سۆسیالیزم مۆدێرنەی سیاسی بەتەواوی ڕەدکردەوە، لێرەوە وەک نەفیکردنی کامڵی مۆدێرنە سیاسی دەرکەوت. دەولەتی نازی زیاتر لە دەوڵەتی فاشیست ئیتاڵیا دژی دەوڵەتی مۆدێرن بوو و لەوروەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی بەتەواوی توانەوە یان خنکان، بە دەوڵەتیکی تۆتالیتار ئەژمێرا.
ناسیۆنال سۆسیالیزم سەرەتا باڵاتر بون و لە پیش بوونی کۆمەڵگای بەسەر تاکدا بە رونی راگەیاند کە ئەوەنە شتێکی تازە نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی باسی کۆمەڵگا بوو لەسەر بناغەی نەژاد، مانایەکی تایبەتی وەرئەگرت. لەم قسەیەوە ئەو ئەنجامگیریە ئەکریت کە تاک تەنها بەهۆی کۆمەڵگای نەژادی و بە هۆی ئەوەوە بونی هەیە. ئەم قسەیە لە کاتێکدا راستە کە تاک سەر بە نەژادی ئاریای بێت کە لە خۆبوردنی ئەندامەکانی بە بەڵگەنەویست ئەزانێت. هیتلەر لەمباریەوە ئەڵێت: «ئەوەی ئەبێتە هۆی مەزنێتی مرۆڤی ئاریایی دەولەمەندی توانا زیهنیەکانی نیە، بەڵکو ئـارەزوی سروشتیەتی بۆ ئـەوەی هەموو تواناکانی خۆی بخاتە خزمەتی کۆمەڵگاوە (...) ئەو بە مەیل و ئارەزوی خۆی خۆدی خۆی ئەبەستێتەوە بە کۆمەڵگاوە، و لە کاتی پێویستیشدا دریغی لە قوربانیدان لە پێناویدا ناکات». مرۆڤی ئاریایی بە «ئایدیلخوازی» ئەناسرێتەوە. واتە بەو «توانایەی کە تاک بۆ قۆربانیکردنی خۆی لە ڕێگەی کۆمەڵگا و هاوشێوەکانی لە خۆی پیشان ئەدات». لە ئەنجامدا ئـازادی فـەردی بەڕاستی بونی نیە و ملکەچی پێداویستیەکانی کۆمەڵگای نـەژادیـە: «مافی خاوەنداریێتی ئازادی تاکەکەسی لە بەرامبەر ئەرکی پاراستنی نەژاددا، ئەکشێتە دواوە«.
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیتلەر ئەیەوێت «باهای تایبەتی تاکەکەس بژمێرێت» و لەم ئاراستەیشدا تاکەکەس لەبەرامبەر جەماوەر و زۆرینەدا دائەنێت و پەنجە ئەخاتە سەر دەوری تاک لە نۆێخوازی و داهێناندا: «تێڕوانینەنەژادپەرستیەکانی ئێمە (...) نـەک هـەر بەهای نـەژاد بەڵکو هـەروەهـا گرنگی کەسایەتی مرۆڤ بە فەرمی ئەناسێت». لێرەوە «هـەمـوو جـۆرە ڕێکخستنیکی دەوڵـەت ئەبێت لـە بنەمای کەسایەتیەوە« هەڵقوڵێت و ئەم بنەمایەش ئەبێ لەبری «بنەمای پەرلەمانی لەسەر بنەمای زۆرینە« دائەنیشیت. ئاشکرایە ئامانجی جەختکردنەوە لە گرنگی کەسایەتی، پاساوهێناوەیە بۆ نایەکسانی تاکەکان و ڕەدکـردنـەوەی بنەمای زۆرینەیە، نەک بە فەرمی ناساندنی ئازادی فەردی و بونیادنانی تاکباوەڕی مۆدێرن.
ناسیۆنال سۆسیالیزم لە چرکەی دوهەمدا روی لەوە بوو دەوڵـەت لەگەڵ نەتەوەدا بە یەک شت دابنێت، و یەکەم بخاتە خزمەتی دوهـەمـەوە. ئەکرێ دەوڵەتی تۆتالیتاری هیتلەر —بەپێچەوانەی دەوڵـەتـی لیبراڵیەوە- بە «یـەک شت دانانی

نەتەوەو دەوڵەت» بە «یەکیتی تەنگاوتەنگ» یان «پەیوەندی یەکێتی بەخشی سیاسی» نەتەوە و دەوڵەت پێناس بکرێت.سەرنجدان لەو خالە گرنگە کە مۆسۆلۆنی بالآتر بون و لە پێشبونی دەوڵەتی بەسەر نەتەوەدا رائەگەیاند، لە کاتێکدا هیتلەر بە پێچەوانەوە لەپێشبون و بالآتربونی نەتەوە یان جەماوەری بەسەر دەوڵەتدا ئەسەلماند: «خالّی دەرچونی تێزی ناسیۆنال سۆسیالیسم نەتەوەیە نەک دەوڵەت». لەراستیدا نەتەوە یان خەڵکە کە شکڵ بە دەوڵەت ئەدات، نەک بە پێچەوانەوە. بەڵێ دەوڵەت «ئورگانیسمێکە لە نەتەوەوە هەڵقوڵاوە« یان وردتر بڵێین «ئۆرگانیسمیکی زیندووە کە نەتەوە هیمەتی بۆ دروستکردنی کردووە«. هیتلەر دەوڵەت تەنها بە شکڵێکی سادە یان چوارچێوەیەکی بەتاڵ ئەزانێت و لە دیدی هیتلەردا جەوهەر یان ناوەڕۆکی دەوڵەت هەمان خەڵک یان نەتەوە یان نـەژادە. لێرەوە «دەوڵـەت ئامرازە نەل ئامانج». چونکە دەوڵەت ناتوانێت ئامانجیک بێت لە خۆیدا، بەڵکو بە ئامرازێک ئاژمێرێت لە خزمەت خەلکدا. دەوری دەوڵەت تەنها پاراستنی ئاسایش نیە، بەڵکو بریتیە لە بەرگریکردن لە خەڵک و زامنکردنی گەشەکردن و گەشانەوەیەتی. هیتلەر هەروەها لە پێشبونی و بالآتربونی نەژادی بەسەر دەوڵەتدا راگەیاند و دەوڵەتی خستە خزمەت ناژادەوە. ئەم بۆچونەش رێنمایی هیتلەری کرد بۆ ئەوەی پێشنیاری دەوڵەتێکی نەژادپەرست بکات کە ئەرکی سەرەکی پاراستنی نەژادی ئارياییە - وەک مەرجی بنەڕەتی شارستانێتی مرۆڤایەتی-: «ئامانجی ئـەم دەوڵـەتـە هـەمـان پـاراسـتـن و ئاسانکردنی گەشەکردن و گەشانەوەی کۆمەڵێک لەو مرۆڤانەیە کە لە روی جەستەیی و رۆحیەوە لەیەک جۆرن (..) ئامانجی کۆتای دەوڵەتی نەژادپەرست ئەبێ چاودێریکردنی ئەو ئەرکە بێت کە نوێنەرانی نەژاد (واتە پاخشکەرانی شارستانیەت) پارێزراو بن».

سەرەڕای ئەمە ناسیۆنال سۆسیالیزم نەتەوە لەسەر بنەمای نەژاد پێناس ئەکات و لەگەڵ نەژاددا بەیەک شتی دائەنێت. وەک ئەزانین تێڕوانینی نەتەوەیی بۆ نەتەوە لە دێرزەمانەوە بە قوڵی لە ئەڵمانیدا رەگی داکوتابوو. لەراستیدا ئەڵمانیا لە تێڕوانینی سیاسی بۆ نەتەوە دورکەوتبۆوە و لەم وڵاتەدا نەتەوە بە پێکەوەبونێکی نەتەوەیی و زمانی و کلتوری ئەزانی. بەهۆی فرەیی دەوڵەتەکان لە کۆمەڵگای ئەڵمانیادا و هەروەها دواکەوتنی یەکیتی ئەڵمانیا، سەر بە نەتەوەبون گرنگتر بوو لە ریکخستنی سیاسی، لێرەوە نەتەوە بالآتربون و لە پێشبونی خۆی بەسەر دەوڵەتدا پاراست. ناسیۆنال-سۆسیالیزم بە پشتبەستن بەم پێدراوە بنەڕەتیانە و بە بونیادنانی نەتەوە لەسەر بناغەی نەژاد ( نەک کلتور) لەراستیدا هەنگاوێکی زیـاتـری نـا: «نـەتـەوە یـان باشترە بڵێن نەژاد پەیوەستە بە خۆێنەوە نەک زمان». هیتلەر تێڕوانینی کلتوری بۆ نەتەوە خستە لاوە و تێڕوانینێکی نەک نەتەوەیی بەڵکو نەژادپەرستانەی لەبری دانـا. هیتلەر شێت و شەیدای نـەژاد بوو، نەژادپەرستی براوەی ستایش ئەکرد، نایەکسانی نەژادەکانی ئەسەلماند و بڕوای وابوو نەژادی ئاریای لە ناژادەکانی تر بالآترە و ئەبێت بەسەریاندا زاڵ بێت. بەڵێ لە دیدی هیتلەرەوە نەتەوەی ئەڵمانیا لە نەژادی ئاریایی بوو و لێرەوە ئەبوو بۆ بەرگریکردن لەم نەژادە و پاراستنی پاکێتیەکەی کار بکات و رێگەی گەشانەوە و پەرەسەندنی دەستەبەر بکات. لەبەرئەوە ئەبێت نەتەوەی ئەڵمانیا بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا کە بەم نەژادە بێگانەن و هەڕەشەی لیئەکەن —بەتایبەتی یەهودیەکان- بالآدەست و تەنانەت لەناویان ببات. بەمشێوەیە نەژادپەرستی بەشیوەیەکی لۆژیکی دژایەتی ئەهودیەت و لەناوبردنی یەهودیەکانی بەدوای خۆیدا هێنا. لەراستیدا ناسیۆنال

**له دیدی هیتلەرەوە پەروەردە بە ئامانجی پەروەردەکردنی «ئەندامی سودبەخش بۆ کومەڵگا» ئەبێت لە دەست دەوڵەتدا بێت. لەم ئاستەدا مافی گشت و دەوڵەت بەسەر مافی تاك و دایك و باوکدا زاڵە، چونکە باسی پاراستنی خەڵك و پاریزگاری لە نەتەوە لە ئارادایە. لیرەوە حیزب چاودیری فێربونی لاوانی ئەکرد کە لە رێکخراوی لاوانی هیتلەردا رێکخرابون.**

سۆسیالیزم تێڕوانینی قەومی بۆ نەتەوە پەرگیر کرد. لـەم دیـدەوە دەوڵــەت تەنها لەخزمەتی نەتەوە و نـەژادا نیە، بەڵکو خۆی یەبێت بە دەوڵەتێکی نەژادی و نەژادپەرست. هـەروەژا بنەمای هاوڵاتی لەسەر خۆینە: «بۆ هاوڵاتی بون ، ئینتیمای دینی گرنگیەکی ئەوتۆی نیە، گرنگ ئەوەیە خۆینی ئەڵمانیت هەبێت و لیرەوە هیچ یەهودیەک ناتوانێت بە هاوڵاتی ئەژمار بکرێت». کەوابوو ئەبێت لە ئەڵمانیادا دەولـەت پارێزگاری لە نـەژادی ئاریای بکات و یارمەتی گەشەکردن و پەرەسەندنی بدات، پارێزگاری لە پاکێتی خۆی بکات و ئاوێزان بون رەد بکاتەوە و دواجـار رێی باشترکردنی ناژادی بگریتە بەر. بەڵێ لەم ئاراستەیەدا ئەبێ باشترین ئەندامەکان پەرە پیبدرێن و ئەندامە کەموکوڕەکان (نەخۆشە چارەسـەر هەڵنەگرەکان، پیرەکان، دوژمنانی سیاسی و...) لەناو ببرێن. دەوڵەت ئەبی هیمەت بۆ دابینکردنی فەزای پێویست بۆ گەشانەوە و پەرەسەندنی نەژادی ئاریایی واتە فەزای زیندویەتی (lebensraum) نەتەوەت ئەڵمان بکات. جگە لەمە ئەبێت هەموو ئەڵمانیەکان لەیەک کۆبکاتەوە و ئاشکرایە خواستێکی لەمچەشنە پیویستی بە پەلهاویشتن بۆ زەوی تر هەیە. هەروەها دەوڵەت ئەبێت بە زامنکردنی سـەروەری ئەڵمانیا بەسەر ئەوروپا و تەنانەت سەرتاسەری جیهاندا، بەدیهێنانی زاڵبونی نەژادی ئاریایی بکاتە ئامانجی خۆی.

بەمشێوەیە ناسیۆنال-سۆسیالیسم بە پێناسکردنی نەتەوە لەسەر بناغەی نـەژاد و بە نزمتردانانی دەولەت لەبەردەم نەتەوەدا، لەراستیدا لەجەمسەری دژبە مۆدێرنەی سیاسیدا راوەستا و تێڕوانینێکی قەومی و نەژادپەرستانەی بۆ نەتەوە دەرخست کە لە تێڕوانینی کلتوری بۆ نەتەوە  کە لە کۆمەڵگای ئەڵمانیدا رەهەندێکی دێرینی هەبوو، زۆر جیاوازە. ئەو خاڵە گرنگە کە ئینتیما بۆ نەتەوە بە خەسلەتە بایەلۆجیەکان و خۆین و نەژاد دیاریئەکرا، و لیرەوە نە پەیوەندی بە ئیرادە و خواستی مرۆڤەکانەوە هەبوو، نە بە ئینتیمای کلتوریان. لە ئەنجامدا تاکەکان بە خەسلەتە نەژادیەکانیان پێناس ئەکران و کورت ئەکرانەوە بۆ بەشەکانی گشتێکی نەژادی و بەمشێوەیە چارەنوسیان بەسترایەوە بە چارەنوسی نەژادەکەیانەوە. ئەو کەسانەی لەم نەژادە نەبون نە ئەیانتوانی بەشێکی نەتەوە بن و نە بە هاوڵاتی ئەژمێران و جگە لەمەش وەک هەڕەشەیەک بۆ پاکی نـەژاد تەماشا ئەکران و لێرەوە ئەبوو دەربکرێن یان تەنانەت لەناو ببرێن. لەم ئاستەدا سەرەتا یەهودیەکانیان لە دامینی نەتەوە دەرکرد و لە مافی هاوڵاتی بێبەشیان کردن (یاساکانی نۆرمبرگ لە ساڵی ١٩٣٥دا)، پاشان لە بەڕێوبەرایتیە دەوڵەتی و هەندێک کـاری ئـازاد دەرکــران، بەمشێوەیە

یەهودیەكانیان ناچار بە دورخستنەوە و دواجار (بە پێی بڕیاریكۆنفرانسی وانس (Wansee) لە یەنایەری ١٩٤٢دا) بە بەربڵاوی لەناویان بردن. دەوڵەتی نازیش وەک نەتەوە بە پێكەوەبونێكی نەژادی ئەژمێرا و گۆڕایەڵی پێداویستیە ناعەقڵانیەكانی نەژاد و پەیڕەوی خواستە شێتئامیزەكانی پەیڕەوانی نەژاد بوو.

دواجار ناسیۆنال سۆسیالیسم وەک فاشیزمی ئیتاڵی بەو مانائە تۆتالیتار بوو كە جیابونەوەی دەوڵەت و كۆمەڵگای قەبوڵنەكرد و خەسلەتە نەژادپەرستانە و شیوازە دیكتاتۆری ئاساكانیش، خەسلەتی زیاتر كرد. لەراستیدا دەوڵەتی نازی ئەیویست سەرجەم كۆمەڵگا و پانتاییە جیاوازەكانی چالاكیەكانی لەوانە ژیانی سیاسی ، رێكخستنی كۆمەڵایەتی، ئابوری، پەروەردە، زانیاری و هەواڵ، كلتور و..بخاتە ژێر كۆنترۆڵ و رینمایی خۆیەوە. لەوروەوە كە جیزبەكانی تر قەدەغەكران یان لابران، حیزبی یەكتا دەوری بنەڕەتی ئەبینی. ئەم حیزبە بە پێی یاسای ساڵی ١٩٣٣ بە شێوەیەكی تەنگاوتەنگ لەگەڵ دەولەتدا بوو بە یەک شت. ئەم یاسایە رایگەیاند: «حیزبی كرێكاری ناسیۆنال-سۆسیالیستی ئەڵمانی نوێنەری بیركردنەوەی نەتەوەیی ئەڵمانیایە و بەشێوەیەكی جیانەبۆوە بە دەوڵەتەوە گرێدراوە«. رژێم هەروەها پۆلیسی سیاسی ترسناكی بەناوی گشتاپۆوە لەبەردەستدا بوو كە دۆژمنانی دەستگیر، زیندانی و لەناو ئەبرد. سەرەڕای ئەمانە بۆ رێكخستن و كۆنترۆڵی تاكەكان و بەتایبەتی لاوان و كرێكاران و رۆشنبیران، دەستیكرد بە دروستكردنی رێكخراوی جەماوەری. لە ساڵی ١٩٣٣دا سەندیكاكانیان هەڵگرت و لەبری ئەو «بەرەی كاری ئەڵمانیا»یان دانا كە لە روی نمونەی پیشەكانەوە بەجۆرێک رێكخرابوو كە جیاوازیە كۆمەڵایەتیەكان بشارێتەوە و رێگە لە هەموو جۆرە روبەروبونەوەیەكی چینایەتی بگرێت.

دەوڵەت دەستی ئەخستە ناو بواری ئابوریشەوە و سیاسەتی ئابوری ڕینمایكراوی بەكار ئەهێنا و هەروەها بەرنامەرێژی بۆ بەرهەمهێنان ئەكرد و ئاراستەی كرد بۆ پیداویستیەكانی بە تایبەتی لە بواری پڕ چەک كردندا.

لە دیدی هیتلەرەوە پەروەردە بە ئامانجی پەروەردەكردنی «ئەندامی سودبەخش بۆ كومەڵگا» ئەبێت لە دەست دەوڵەتدا بێت. لەم ئاستەدا مافی گشت و دەوڵەت بەسەر مافی تاک و دایک و باوكدا زاڵە، چونكە باسی پاراستنی خەڵک و پاریزگاری لە نەتەوە لە ئارادایە. لیرەوە حیزب چاودیری فێربونی لاوانی ئەكرد كە لە رێكخراوی لاوانی هیتلەردا رێكخرابون. هەوەها رژێم هەموو دەزگاكانی هەواڵ (چاپەمەنی، رادیۆ و سینەما)ی كۆنترۆڵ كردبوو، وە پروپاگەندەی ریكخراو و نەخشە داڕێژراوی ئەكرد. ئازادی رادەربرین بونی نەبوو، هەر چالاكیەكیش لەم بوارەدا بە وردی ریكخرابوو. لە یاسای ساڵی ١٩٣٣دا هاتبوو «هاوكاری(..) لە نوسینی رۆژنامەكان و گۆڤارەكان و مانگنامەكان(..) چالاكیەكی گشتیە كە ئەم یاسایە ماف و ئەركەكانی دیاری ئەكات».

لە ئەنجامدا رژێم ئەیویست شێوە جیاجیاكانی كلتور رێكبخات و كۆنترۆل بكات و لەم ئاستەدا هلە ساڵی ١٩٣٣دا یاسایەكی تری «ژوری كلتور» یان بە دەربڕینێكی وردتر ژوری «پیشە فەرمیەكان»ی دروستكرد كە ئەندامانی لقە كلتوریە جیاوازەكانی كۆ ئەكردەوە. بەمشێوەیە شەش ژور بۆ نوسەران، چاپەمەنی. رادیۆ، ئامێرژەن و موسیقازانەكان، شانۆ و هونەری بەرجەستەیی دروست بوو. مافەكان و زانستیش بونە ملكەچی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنال-سۆسیالیتی و جیهانبینیەكەی. رژێم هەروەها توانی بە بەدەستهێنانی كەمتازۆر فراوانی پرۆتستانتەكان (بە هاوكاری كەنیسەی مەسیحی ئەڵمانی) و بە واژۆكردنی رێكەوتننامەیەک لەگەڵ ڤاتیكاندا (لە

یۆنێۆی ١٩٩٣٣دا) دینیش بێلایەن و کۆنترۆڵبکات. ئاشکرایە لە هەلومەرجێکی وادا نە دەولەتی مۆدێرن ئەیتوانی بوونی هەبێت کە پێکەوەبونی هاولاتیانە، نە کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای فـەزای ئـازادی. ناسیۆنال-سۆسیالیسم زیاتر لە فاشیسمی ئیتاڵی جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای لەناوبرد، و هەر لەبەر ئەم هۆ بنەڕتیەش هەم تۆتالیتار بوو، هەم مۆدێرنەی سیاسی بە کاملی رەد ئەکردەوە. لەمرووە ئەکرێت دەولەتی نازی بە جەمسەری دژ بە دەولەتی مۆدێرن بژمێرێت. لەراستیدا دەولەتی نازی وەک دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن دەرکـەوت کە دەستی بە شێوازە دیکتاتۆریە ئاساکان و تەکنیکە مۆدێرنەکان گەیشتووە. ئەم شێوازانە کە تەنها بوونە هۆی زیادبونی تواناکانی سەرکوتکردن و زیادبونی خراپەکاری ئەم دەوڵەتە، نابێت خەسڵەتی راستەقینەی بشاریتەوە. بەڵێ ئەو خاڵە کە ناسیۆنال سۆسیالیسم تا ساڵی ١٩٤٣ لە لایەن ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ئەڵمانیاوە پشتیوانی ئەکرا، بە باشی پیشانی ئەدات کە خەڵکی ئەم وڵاتە بە ئاسانی نەبونی مۆدێرنەی سیاسیان قەبوڵکردووە و ملیان بۆ کۆیلەتیەکی خۆویست داوە. ئەبێت دەرکەوتنی ناسیۆنال- سۆسیالیسم بە دابڕانیکی توند لە گۆڕانی سیاسی ئەڵمانیا و تەنانەت گەڕانەوەیەکی کارەساتبار بۆ وڵاتێک بزانرێت کە بە دروستکردنی کۆماری ڤایمار پێی خستبوە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە.ئەڵمانیا پاش جەنگی جیهانی دووهەم و روخانی نازیسم، توانی بەڕاستی دەستی بە مۆدێرنەی سیاسی بگات. ئەو گۆڕنکاریە بنەڕەتیەی پاش ساڵی ١٩٤٥ لە ئەڵمانیا رویدا، بریتی بوو لە بەجێ هێشتنی نەتەوەی قەومی-کلتوری و گۆڕان بۆ نەتەوەیەکی سیاسی.

### ٣) کۆمنیسمی سۆڤیەت و چینی

کۆمنیسمیش وەک شـیـوەیـەکـی گرنگی تری تۆتالیتاریسمی سەدەی بیستەم بە رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی ئەناسرێتەوە. بەڵام لەم حاڵەتەدا رەدکـردنـەوەی مۆدێرنەی سیاسی بەشیوەیەکی تەواو جیاواز دەرکـەوت، چونکە نە وەک فاشیسم دەرئەنجامی ستایشی دەوڵەت بوو، نە وەک نازیسم دەرئەنجامی پەرستنی نەتەوە و نەژاد بوو. ئەکرێت رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی لە یەکێتی سۆڤێتدا بۆ دوو هۆکاری بنەڕەتی بگەڕێنرێتەوە کە یەکێکیان مێژوویە و ئەوی دیان ئایدۆلۆژیە. سەرەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە وڵاتێکدا رویدا کە پێی نەخستبووە مۆدێرنەی سیاسیەوە، جگە لەمەش ماوەیەکی زۆر بەسەر روخانی رژێمی تزاریدا نەرۆیشتبوو. هەرچەند لەسەرەتای سەدەی بیستدا و بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٠٥ ئازادیە فەردیەکان کەمتازۆر پەیدا بوو بوون، بەڵام بە گشتی زۆر سنوردار بوون. گەرچی شۆڕشی فبرایەری ١٩١٧ رێگەیەکی کردەوە کە ئەیتوانی بە مۆدێرنەی سیاسی بگات، بەڵام شۆڕشی ئۆکتۆبەت بەتوندوتیژیەکی تـەواو ئـەو رێگەیەی داخست. لە ئەنجامدا ئـەو دەوڵـەتـەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەرپای کرد، سەرەڕای هەموو رواڵەتەکانی، وەک دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن مایەوە کە لە شێوازیکی تردا بەردەوامیدا بە رژێمی پێشو. بە وتەیەکی تر روسیا لە ساڵی ١٩١٧دا هەلێکی مێژوی لەدەستدا کە بۆ پێخستنە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە هاتبووە پێشێ. ئەم دۆخە پاشتر ئەگەری لادان بەرەو تۆتالیتاریسمی رەخساند کە بە باڵادەستی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا ئەناسرێتەوە.

دوهـەم ئایدۆلۆژیای مارکسیست-لینینیستیش رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی رونئەکاتەوە. وەک پێشتر دیمان رەفکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی لە بیری مارکسدا هەبوو. لینینیش ئەم تێڕوانینەی قەبوڵکرد، چونکە دەولەتی مۆدیرن لەگەڵ دەولەتی بۆرژوازیدا (کە دەبوو بروخینرێت) بە یەک شت ئەزانرا، و سەرقاڵی دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی

سەربەخۆش نەبوو. لەراستیدامارکسیسم- لینینیسم زیاتر گرنگی بە بونیادە ئابوریەکان ئەدات تاکو بە رێکخراوی سیاسی. و گەرچی تیورەیەکی لەبارەی دەوڵەتەوە هەیە، بەڵام ئەم تیورەیە هەم کورت و چرە، هەم وەک پێویست گەڵاڵە نەبووە. بەکورتی ئـەم تیورەیە تەماشای دەوڵــەت وەک یامرازی ×ینایەتی بەدەست ئەو چینەوە تەماشا ئەکات کە لە رووی ئابوریەوە باڵادەستە، لە ئەنجامدا بڕوای وایە پرۆلیتاریا ئەبێت ببێ بە چینی حۆکمڕان و کۆنترۆڵی دەوڵــەت بکات. پاش ئەمە دەولـەت بۆ بەدیهاتنی گۆڕانی ئابوری و کۆمەڵایەتی پێوسیت بەکار دێت. لێرەوە دەولەت دەوری ئامرازێک ئەبینێت و نەک هەر لە کۆمەڵگای مەدەنی جیا نیە، بەڵکو ریکخستن و ڕێنمایکردنی (کۆمەڵگای مەدەنی) کردۆتە ئامانجی خۆی. ئاشکرایە لە هەلومەرجی وادا مۆدێرنەی سیاسی ناتوانێت ئامانجێک بێت کە دەبی هێواش هێواش پێی گەیشت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ دابینکردنی باڵادەستی دەولەت بەسەر کۆمەڵگادا، ئەبێت یەکسەر بەلاوە بخرێت. ئەمە هەمان ریگەیە کە مارسیسم-لینینیسم بە ئامانجی دروستکردنی بینای کۆمەڵگای سۆسیالیستی، گرتیە بەر.

ئەم دوو هۆکارە مێژوویی و ئایدۆلۆژیایە دەستیان خستە دەستی یەکەوە بۆ ئەوەی رێگە لە بەدیهاتنی مۆدیرنەی سیاسی لە یەکیتی سۆڤیەت بگرێت و ئەم وڵاتــە بــەرەو تۆتالیتاریسم بەرێت. گەرچی تۆتالیتاریسم لە رەوتــی حــەوت دەیــەی رژێمی سۆڤیەتدا گۆڕا و لە قۆناغی جیاوازدا شکڵی جیاوازی وەرگـرت و لە کشان و داکشانیش دور نەبوو، بەڵام بە گشتی بە باڵادەستی گشتی و بەردەوامی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵگادا ئەناسرێتەوە. تازە حیزبی کۆمنیست کە سەروەختێک نۆێنەری پرۆلیتاریای کریکاری و جوتیاری بـوو، دەوڵەتی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بەهەرحاڵ باڵادەستی دەولەت بەسەر کۆمەڵگادا بە شێوەی جیاجیا بەکارهێنراو لە پراکتیکیشدا کامڵ و تەواو (totale) بوو.

لەسەرەتادا دەسەڵاتی سیاسی هەوڵیدا بە سەپاندنی حیزبی یەکتا، قەدەغەبونی حیزبەکانی تر، هێنانی سانسۆر، کۆنترۆڵی چاپەمەنی، دروستکردنی پۆلیسی سیاسی و دەستکردن بە تۆقاندن (تیرۆر) بەسەر کۆمەڵگادا باڵادەست بێت. پاشان تۆقاندن لەسەردەمی ستالیندا توندتر بۆوە و ئۆردوگاکانی گۆلاکی بەرهەمهێنا (رێـژەی مامناوەندی ژمارەی زیندانیەکان لە نێوان ساڵی ١٩٣٧ تا ساڵی ١٩٥٣ نزیک دوو ملێۆن کەس بـوو). دەولـەت هەروەها سەرجەم ئابوری چ لە بەشی پیشەسازی و چ لە بەشی کشتوکاڵیدا، بە سۆشیالکردنی ئامێرەکانی بەرهەمێنان (لــەوانــە زەوی کشتوکاڵی) بە بەرنامەڕێژی ڕێنمایی ئەکرد. دەستوری ١٩٣٦ کە بەشی سەرەتای پێش باسکردنی رێکخراوی دەوڵەت، باسی رێکخستنی کۆمەڵایەتی ئـەکـات، بڕیاری لابردنی موڵکایەتی تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و جێگرتنەوەی بە مۆلکایەتی سۆشیالیستیدا بە شیوەی موڵکایەتی دەوڵەتی (سامان و داراییەکانی هەموو خەڵک) و موڵکایەتی هەرەوەزی و کالخۆزی (سەر بە یەکێتیە هەرەوەزیەکان و کالخۆزیەکان) (مادەی٤٥ و ١٥). گەرچی موڵکایەتی شتە شەخسی و ئابوری بچوکی تایبەت بە جوتیاران و پیشەوەران قەبوڵکرا، بەڵام سیستەمی ئابوری سۆسیالیستی، شیوەی باڵادەستی ئابوری وڵات بوو (مادەکانی ٩و ١٠). ئەم یاسایە لە دەستوری ساڵی١٩٧٧دا هەروا پارێزرا و ئەم دەستورەش جارێکی تر مۆڵکایەتی سۆسیالیستی ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی لە شکڵی جۆراوجۆردا سەلماند.

دەوڵەت ئەیویست شکڵ بە کۆمەڵگا بدات و رێنمایی چالاکیە جیاجیاکانی بکات. کۆمەڵگا ژیانێکی سەربەخۆی نەبوو، لەنێوان هاوڵاتی و تاکیشدا

جیاوازیەک نەئەبینرا. لەراستیدا یەکێتی سۆڤیەت تەنیا هاوڵاتیانی بە فەرمی ئەناسی و تاکەکانی نادیدە ئەگرت. بەمشێوەیە مرۆڤ بونێکی تایبەتی نەبوو، کورتبووبۆوە بۆ ئەندامیک لە گشت. هەرچەندە دەستوری ساڵی ١٩٣٦ و ساڵی ١٩٧٧ بە پێچەوانەی ساڵی ١٩٢٤وە، زۆر مافی بنەرەتی ئەسەلماند، بەڵام ئەم مافانە بە هاوڵاتیان ئەبەخشن، نەک بە تاکەکان. لێرەوە نە مافەکانی مرۆڤ وەک تاک، بەڵکو مافەکانی هاوڵاتیان (ئەگەرچی بە روکەش) بە فەرمی ناسرا. لە ئەنجامدا تاک وەک تاک بونی نەبوو، بەڵکو تەنها وەک هاوڵاتیان —وەک ئەندامانی دەوڵـەت- بونی هەبوو. بەمشێوەیە تاک لە ئازادی راستەقینە بێبەش بوو، لە پەیوەندیە سروشتیەکانی —وەک خێزان- جیابووبۆوە و لە گشتێکدا توابۆوە کە بە تەواوی وابەستە بوو پێوەی. دەولەت و حیزب هەموو لایەن و راهەندەکانی ژیانی تاکیان ئەپشکنی و کۆنترۆڵیان ئەکرد و ئاشکرایە کە کارێکی لەمچەشنە رێگەی لە دروستبونی کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخو ئەگرت. بەڵی مافەکانی مرۆڤ فەرامۆشکران و بە ئاشکرا دەستدرێژی کرایە سەر. لە ئەنجامدا دۆخەکە بەرەو ستەماکاری و بەربەریەت رۆیشت کە هاوکات بوو لەگەڵ دەستگیرکردنەکان، ناردن بۆ ئۆردوگاکان ولە سێدارەدانە بەرفراوانەکان. ئایدۆلۆژیای فەرمی لافی زانسی و زانین و هونەر و کلتوری لێئەدا، و لەم بوارانەدا جیگەیەکی بۆ ئازادی نە دەهێشتەوە، بە تایبەتی رۆشنبیران ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕینیان نەبوو. وا دەرئەکوت کە تەنیا دین لە دەستێوەردانی دەوڵەت بە دور بێت، چونکە ئازادی بڕوا و ئازادی رێبازە مەزهەبیەکان سەلمێنراو و کەنیسە لە دەولـەت جیابوو بـۆوە (دەستوری ساڵی ١٩٣٦ مادەی ١٢٤ و دەستوری ١٩٧٧ مادەی ٥٢). ئەڵبەتا پڕۆپاگەندەی دژ بە دین و خوا نەناسانەش ئازاد بوو. بەڵام لە پراکتیکدا گەرچی دین —و لەراستیدا کەنیسەی ئەرسۆزکس- جار و بار ئەخرایە ژێر فشار و هەندێکجار ئەیانخستە خزمەت رژێمەوە، بەڵام رژیم بەردەوام دینی ئەپشکنی و کۆنترۆڵ ئەکرد.

دەستوری ساڵی ١٩٧٧ تا ئەو شوێنە رۆیشت کە تەنانەت دەوڵەتی لەگەڵ سەرجەم کۆمەڵگادا بە یەک شت دانا. لە کاتێکدا دەستوری ساڵی ١٩٣٦ یەکیتی سۆڤیەتی وەک «دەولەتێکی سۆشیالیستی کرێکاران و جوتیاران» پێناس ئەکرد (مادەی یەکەم) ئەوا دەستوری ساڵی ١٩٧٧ یەکیتی سۆڤیەتی وەک «دەولەتی سۆسیالیستی هەموو خەڵک» ناساند (مادەی یەکەم) و ئەوەشی کە لە ساڵەکانی دەیەی شەستی میلادیدا قەبوڵکرابوو بەوشێوەیە ئەهێنایەوە کە قۆناغی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا تێپەڕیوە و «دەولـەتـی سۆڤیەت بـووە بە دەولـەتـی هەموو خەڵک» (پیشەکی). ئەم تێڕوانینە بە مانای نەفی ئاشکرای جیاوازی نێوان دەوڵەت و خەڵکە و لێرەوە رەدکردنەوەی جیابونەوەی دەوڵەتە لە کۆمەڵگای مەدەنی، چونکە وا بیریان ئەکردەوە کە هەنوکە بینای کۆمەڵگای سۆسیالیستی لە چوارچێوەی دەوڵەتی سۆڤێتیدا بە ئەنجام گەیشتووە.

جگە لەمە دەوری حیزبی کۆمنیست لە زاڵبونی دەولـەت بەسەر کۆمەڵگادا چارەنوسساز بوو. لە دەستوری ساڵی ١٩٣٦دا (مـادەی ١٢٦) حیزبی کۆمنیست وەک «ناوکی رێبەرایەتی هەموو رێکخراوی کرێکاران لە ریکخراوە کۆمەڵایەتیەکانەوە بیگرە تا رێکخراوە دەوڵەتیەکان» ناسێنرا بوو. واتە حیزد رێکخراوە کۆمەلایەتیەکان (سەندیکاکان، یەکێتیە هـەرەوەزیـەکـان، رێکخراوەکانی لاوان، وەرزشـی، کلتوری و..) و هـەروەهـا ئۆرگانەکانی دەولـەت لەهەموو ئاستەکاندا رێنمایی و کۆنترۆڵ ئەکات. کاتی دیاریکردنی جێگەی حیزب لە ساڵی ١٩٦١دا دەوری رێبەرایەتی حیزبیان لە پەیوەندیدا بە هەموو کۆمەڵگاوە سەلماند. لە پیشەکی ئەم دەقەدا هاتووە

کە حیزب: «هێزیکە ریگە پیشانی کۆمەڵگای سۆڤیەتی ئەدات و ئاراستەی ئەکات» و «رێنمایی چالاکیە داهێنەرەکانی خەلکی سۆڤیەت ئەکات». دەستوری ساڵی ١٩٧٧ بە گێڕانەوەی فۆرمەکانی پیشوو لە مادەی شەشدا، بەهایەکی یاسایی پی بەخشین و «دەوری رێبەرایەتی کردنی حیزبی کۆمنیستی» جارێکی دی سەلماند: حیزب «هێزێکە رێنمایی کۆمەڵگای سۆڤیەتی ئەکات و ئاراستەی ئەکات، بە ناوکی سیاسی هەموو رێکخراوەکانی دەوڵەت کۆمەڵگا ئەژمێرێت. حیزب روانگەی گشتی گەشەکردن و پەرەسەندنی کۆمەڵگا دیارئەکات (...) چالاکی داهێنانی خەڵکی سۆڤیەت رێنمایی ئەکات». یەکیتی سۆڤیەت لە سەرتاسەری ژیانیدا سەرەڕای ئەو گۆڕانانەی بەسەریدا هات، هەروا لەگەڵ مۆدێرنەی سیاسیدا بیگانە مایەوە و بەجۆریک بەردەوامیدا بە جۆرێک دەوڵەتی پێشمۆدێرن. تۆتالیتاریسمی سۆڤیەت جگە لە توندی و لاوازیەکانی لە قۆناغە جیاجیاکاندا، لەرەدکردنەوەی جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا و خواستی شکڵدان بە کۆمەڵگا بە پێی ئایدۆلۆژیا فەرمی کورت ئەبێتەوە. بەڵێ زاڵبونی دەوڵــەت بەسەر کۆمەڵگادا، دەستبەسەراگرتنی ئابوری و نەبونی ئازادی فەردی بەرونی پیشانی ئــەدات کە یەکێتی سۆڤیەت بەشێوەیەکی کامڵ مۆدێرنەی سیاسی رەد ئەکاتەوە و روبەروی هەموو شتێک رائەوەستا کە ئەیتوانی بــەرەو مۆدێرنەی سیاسی بچێت.

بەڵام لە دوا ساڵەکانی تەمەنی یەکێتی سۆڤێتدا، تاکەکان بونە خاوەنی هەندیک ئازادی و ژیانی تایبەتی روی لە گەشانەوە و گەشەکردن کرد و ئەم دۆخەش رێگەی بۆ پەیدابونی لەسەرخۆی کۆمەڵگای مەدەنی کردەوە. ئەم گۆڕانکاریە بە دوو گۆڕانکاری بنەڕەتی گەیشت واتە قەبوڵکردنی فرەیی حیزبە سیاسیەکان و مافی موڵکایەتی تایبەتی کە لە مارسی ساڵی ١٩٩٠ دا لە گۆڕانکاریەکانی دەستوردا هێنرایەوە. بەمشێوەیە لە لایــەک حیزبی یەکتا و دەوری رابەریکەرانەی وازی لیهێنرا و حیزبەکانی تریش لە پاڵ حیزبی کۆمنیستدا رێگەی چالاکیان پێدرا و لەراستیدا هاوڵاتیان مافی گردبونەوەی ئازادیان وەرگـرت (مادەکانی ٦ و ٥١). لە لایەکی دیەوە مۆڵکایەتی سۆشیالیستی ئامێرەکانی بەرهەمهێنانیش وازی لیهێنرا و لە پاڵ «مۆڵکایەتی گشتی دەولەتدا» «مۆڵکایەتی هاولاتیانی سۆڤیەتیش» سەلمێنرا، موڵکایەتیەک کە ئەیتوانی پەیوەندی هەبێت بە هەموو کالآ مەسرەفیەکان و بەرهەمهێنراوەکانەوە و بۆ «ئەنجامدانی سەربەخۆی چالاکیە ئابوریەکان» سودی لیوەربگیرێت (مادەکانی ١٠ و ١١). ئەم دوو گۆڕانکاریە گرنگە جیابونەوەی دینامیکی دەولەت لە کۆمەڵگا و لیرەوە کردنەوەی رێگا بەرەو مۆدێرنەی سیاسی بە بارهێنا. پــاش لەناوچونی یەکێتی سۆڤیەت و روخانی کۆنیسم، هەلی گەیشتن بەم ئامانجە رەخسا. دیارە بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە پێویستی بە رێکخستنی دەوڵەتێکی واقعی و شکڵوەرگرتنی کۆمەڵگایەکی سەربەخۆ هەیە لە وڵاتێکدا کە لە ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت هاتوتە دەرێ و بەدیهاتنیشی روبەروی کێشەی بەرچاو ئەبێتەوە و بیگومان پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە.

هەلومەرجی وڵاتە کۆمنیستیەکانی ئەوروپای ناوەندی و رۆژهــەڵات لەمڕووەوە بەشێوەیەکی هەستپێکراو جیاواز بوو. زۆرێک لەم وڵاتانە بەتایبەتی پۆڵەندا و چیکۆسلۆڤاکیا و مەجەر لەسەرەتای سەدەی بیستەوە –یان لانیکەم پاش جەنگی جیهانی یەکەم- پێیان خستبۆوە مۆدێرنەی سیاسیەوە و لەگەڵ بونی چەندان کێشەی جدیدا، ، خاوەن دەولەتێکی مۆدێرن بون کە بەشیوەی دیموکراتیک کاری ئەکرد. جگە لەمە کۆمەڵگایەکی سەربەخۆ هەبوو کە ریگەی بە تاکەکان ئەدا سود لە ئازادیە بنەڕەتیەکان وەربگرن.

بەڵام پاش جەنگی جیهانی دوهەم یەکیتی سۆڤیەت کۆمنیسمی بەسەر ئەم وڵاتانەدا سەپاند و کۆمنیسم لەناکاو کۆتای بە جوڵەی ئەوان بەرەو مۆدێرنەی سیاسی هێنا و بۆ ماوەی چل ساڵ رایکێشان بۆ ناو داوی تۆتالیتاریسم. بۆ ئەم وڵاتانە تۆتالیتاریسم تەنها بە مانای راوەستانی گۆڕانی سیاسیان نەبوو، بەڵکو بە مانای گەڕانەوەیەکی کارەساتبار بوو بۆ دواوە، بەو شێوەیە کە دەولەت کونترۆڵی کامڵی کۆمەڵگای کەوتە دەست و هیچ ئازادیەکی بۆ تاکەکان نەهێشتەوە. ئەم وڵاتانە بی سێ و دوو پاش روخانی کۆنیسم، جوڵەی خۆیان بەرەو مۆدیرنەی سیاسی دەست پێکردەوە و کەمتازۆر لە حاڵەتی بەدیهێنانیدان، هەرچەندە هەندێکیان وەک رۆمانیا و بولغاریا روبەروی چەندان کێشە بونەتەوە.

هەلومەرجی چینی کۆمنیست سەرەڕای تایبەتی و ئاڵۆزیەکانی وەک هەلومەرجی یەکیتی سۆڤیەتە. ئەم وڵاتە روخاندنی رژێمی ئیمپراتۆری و راگەیاندنی دەولەتی کۆماری لە ساڵی ١٩١١ توانی پێ بنێتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە، بەلام بە هۆی جیاجیاوە (لەوانە ئاژاوە ناوخۆیەکان، شەرەکانی ناوخۆ، داگیرکاری ژاپۆن، دژایەتی ناسیۆنالیستەکان لەگەل کۆمنیستەکاندا) لەم ریگەیەدا سەرکەوتوو نەبوو. سەقامگیربونی کۆمنیسم لە ساڵی ١٩٤٩وە بۆ ماوەیەکی درێژ چینی لە مۆدێرنەی سیاسی دور خستەوە. تۆتالیتاریسمی چینی وەک تۆتالیتریسمی یەکێتی سۆڤیەت، دیارە لە رێگەی جیاوازەوە، کۆمەڵگایان بەستەوە بە دەوڵەتەوە و جیابونەوەی ئەو دوانەی لەناو برد. دەستوری چین بە شکڵی جیاجیا بەردەوام یەکیتی دەوڵەت و خەڵک-واتە پرۆلیتاریای کرێکار و جوتیار-ی ئەسەلماند. جین بە پێی پوناسی دەستوری ساڵی ١٩٥٤ «دەولەتی دیموکراتی جەماوەریە« کە «چینی کرێکار رێبەرایەتی ئەکات و بناغەکەی لەسەر یەکێتی کرێکاران و جوتیاران دامەزراندووە« (مادەی یەکەم.

دەستوری ساڵی ١٩٧٥ و ١٩٧٨ جەختی لەسەر ئەو خاڵە کردۆتەوە کە چین «دەوڵەتیکی سۆسیالیستی دیکتاتۆری پرۆلیتاریایە« (مادەی یەکەم). دەستوری ساڵی ١٩٨٢ بە تێکەڵکردنی هەر دوو فۆرمەکەی پێشوو، چینی وەک «دەولەتێکی سۆسیالیستی دیکتاتۆری دیمۆکراتی جەماوەر» پێناسکرد (مادەی یەکەم) لە دیباجەکەشیدا جەختی لەوە کردۆتەوە کە ئەم دیکتاتۆریە «لە جەوهەری خۆیدا دیکتاتۆری پرۆلیتاریایە«. لێرەوە لە نێوان دەولەت و خەلکدا (یا پرۆلیتاریا) جیاوازیەک نابینرێت و لە روی تیوریەوە خەڵک یان چینی کرێکار، رابەرایەتی دەوڵەتی ئەکرد. گەرچی دەکری لەم قسەیەوە ئەو ئەنجامە وەربگیرێت کە دەوڵەت بە پەیڕەوی کۆمەڵگا زانراوە، بەڵام پێچەوانەکەی راستە، چونکە کۆمەڵگا بەتەواوی پەیڕەوی دەوڵەتە و تازە حیزبی کۆمنیست کە بە نۆێنەری هەموو خەڵکی دائەنرێت، رابەرایەتی دەوڵەتی بەدەستەوە گرتووە.

ئەوە بە بیر بهێنینەوە کە لە دیباجەی دەستوری ساڵی ١٩٥٤دا «دەوری بەڕێوبەرایەتی کردنی حیزبی کۆنیست» لە پەیوەندیدا بە دەزگاکانی دەوڵەتەوە سەلمێنرا بوو. پاشان دەستورەکانی ساڵی ١٩٧٥ و ساڵی ١٩٧٨ بە جەختکردنەوە لە دەوری رابەرایەتی حیزب-لە بەشی یەکەمدا کە تایبەتە بە بنەما گشتیەکان (مادەی ٢)- هەنگاویکی زیاتریان نا: حیزب بە «ناوکی رابەرایەتی کردنی هەموو خەڵکی چین» ئەژمێرێت و چینی کرێکار بە پێشڕەوی خۆی، واتە حیزبی کۆمنیست، ئاراستەی دەوڵەت دیاری ئەکات. هەرچەند لە دەستوری ساڵی ١٩٨٢دا ئەم شتانە بەرچاو ناکەون، بەڵام لە دیباجەکەدا باسی رابەرایەتی جیزب کراوە، و جگە لەمەش حیزب بە پێی پێگەی خۆی لە ساڵی ١٩٨٢دا وەک «ناوکی رابەرایەتی کردن لە پێناوی ئامانجی سۆشیالیسم لە چیندا» پێناس ئەکرێت.

حیزبی کۆمنیست لە پراکتیکدا سود لە دەوڵەت بۆ رابەرایەتی کردنی کۆمەڵگا وەر ئەگرێت. دەوڵەتیش لە هەموو بوارەکاندا لە ئابوری و پـەروەردە و زانستەکان و تەندروستیەوە بیگرە تا زانیاری و کلتور و ئەدەبیات و هونەرەکان تێوەردان ئەکات و بەمشیوەیە کۆی کۆمەڵگا فۆرمەلە و کۆنترۆڵ ئەکات. موڵکایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بە زەرورەت گشتیە و ئەتوانیت دوو شکڵی جیاوازی هەبێت: موڵکایەتی هەموو خەلک و موڵکایەتی گشتی جەماوەری زەحمەتکێش. یەکەم شکڵی موڵکایەتی بە بونیادی ئابوری دەوڵەتی ئەژمێرێت کە بە وتەی مادەی ٧ی دەستوری ١٩٨٢ «هێزی رابەرایەتیکەری ئابوری نەتەوەییە«. ئەکرێت شکڵی دوهەم لە کۆمۆنە جەماوەریەکان، هـەرەوەزی کشتوکالی و ئابوری هـەرەوەزی بدۆزرێتەوە. بەمشێوەیە موڵکایەتی تایبەتی ئامیرەکانی بەرهەمهێنان و زەوی ناتوانێت بونی هەبێت و بونیادی ئابوری لەسەر سیستەمی موڵکایەتی گشتی دامەزراوە و دەوڵەت بەرنامەرێژی ئابوری ئەکات. ئەڵبەتە نوسینگە دەوڵەتیەکان «لە بواری سودمەندی و بەرێوبەرایەتیدا سەربەخۆن» بەو مەرجەی سەرپێچی لە «رابەرایەتی یەکتای دەوڵـــەت» نـەکـەن و «هـەمـوو» ئامانجەکانی بەرنامەکە بەدی بهێنن (دەستوری ١٩٨٢ لادەی ١٦)، گەرچی ئابوری تاکانە وەک «تەواوکەرت بەشی سۆشیالیستی» لە شار و لادێکاندا قەبوڵکرا، بەڵام ئەبێت لە ژێر کۆنترۆڵ و رێنمای دەوڵەتدا بێت و لەو سنورەدا بمینێتەوە کە یاسا دیاری کردووە (مادەی١١). ئاشکرایە لە هەلومەرجی وادا نە کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆ ئەتوانێت هەبێت و نە ئازادی کەسایەتی واقعی. بە ئاراستەی بونیادی سۆسیالسم، دەوڵەت بە کاملی بەسەر کۆمەڵگا و تاکەکاندا زاڵە و بۆ ئەم مەبەستە هەموو توانا پێویستەکانی لەبەردەستدایە، و دەست ئەکات بە سەرکوتی سیاسی و «فێرکاری لە رێگەی کارەوە«. لێرەشدا وەک یەکیتی سۆڤیەت لەنێوان هاوڵاتی و تاکدا جیاوازی نیە. لەراستیدا چین تەنها هاوڵاتیان بە فەرمی ئەناسێت و تاکەکان ئەژمار ناکات و ئەم تێروانینەش رەدکردنەوەی کاملی مافەکانی مرۆڤ لەم ولاتەدا رون ئەکاتەوە. دەستوری ساڵی ١٩٨٢ وەک دەستوری ساڵی ١٩٧٥ و ساڵی ١٩٧٨ زۆرێک لە مافە بنەرەتیەکان بۆ «هاوڵاتیان» بە فەرمی ئەناسێت، نەک بۆ تاکەکان. هەرچەندە ئەم زارەوەیە (واتـە تـاک) لە دەسـتـوردا فـەرامـۆس نەکراوە، بەڵام بەشێوەی باو بۆ دەربڕینی قەدەغەکراوەکان بەکار هاتووە، و لەراستیدا بە روانین بۆ تاک وەک خراپەکاری هێزەکی (بالقوە)، هەولدراوە بەهای داماڵێنن. بەڵێ گەرچی «ئازادی فەردی هاوڵاتیان» و «رێزگرتن لە کەسایەتیان» لە مادەکانی ٣٧ و ٣٨ی ئەم دەستورەدا سەلمێنراوە، بەڵام تەنها پەیوەندی بە «هاوڵاتیان»ەوە هەیە و هیچ مافێک بە تاک نەدراوە. لێرەوە مافەکانی هاوڵاتیان لە روی تیوریەوە بە فەرمی ناسراون، بەڵام باسی مافەکانی مـرۆڤ وەک تاک نەهاتۆتە ئـاراوە. لە ئەنجامدا هاوڵاتیانی پەیرەوی دەوڵەت بونیان هەیە، و تاک وەک تاک بەراستی بونی نیە.

پاش مردنی ماوتیسۆنگ گۆڕانێکی هەستپێکراو لە ولاتدا –بە تایبەتی لە بواری ئابوری- دا رویدا و تەنانەت باسی «دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی» کرا. لەراستیدا لەسەراتای ساڵی ١٩٨٠دا ریفۆرمی کشتوکاڵی بە داماڵینی سوشیالیستی لە لادێکاندا گەیشت و جوتیاران بونە خاوەن کۆمەڵێک سەربەخۆی دارایی. دروستکردنی «ناوچە تایبەتیەکانی ئابوری» لە ساڵی ١٩٧٩دا ئەگەری سەقامگیری کارخانەی تیکەڵی چینی-دەرەکی رەخساند. دەیەیەک دوای ئەوە کۆنگرەی چواردەهەمی حیزبی کۆنیست (لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢) چەمکی «ئابوری بازاڕی ئازاد»ی قەبوڵکرد کە ماوەیەک دوای ئەوە لە دەستوریشدا

دانرا (مادەی ١٥). لەراستیدا ئەم روداوە تێڕوانینێکی تازەی بۆ بازاڕ پێشاندا. بەڵێ لە پاش ئەمەوە ئابوری پشتی بە بەرنامەڕێژی نەبەستبوو و لە چوارچێوەی سۆسیالیستیدا روی کردە یاساکانی بازاڕ. سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٩٩دا لە ئەنجامی پیاچونەوەیەکی تازەدا، دەستور بەشی تایبەتی بە «پارچەیەکی گرنگی پەیکەری» ئابوری سۆسیالیستی بازاڕ ئەژمار کرد. گەرچی ئەم هەنگاوانە نەرمیەکی واقعی بوو ، و هەندێک ئازادی لە بواری ئابوریدا بەدوای خۆیدا هێنا، بەڵام لەم ئاستەدا مایەوە و رەنگدانەوەی لە بواری سیاسیدا نەبوو، سەرکوت و حوکمدانی ناڕازیەکان (بەتایبەتی لەکاتی روداوەکانی مەیدانی «تیان ئان من» لە ساڵی ١٩٨٩دا) نیشانەیەکی ئاشکرای ئەم دۆخەیە.

لەبەرئەوە سەرەڕای گۆڕنکاریەکانی ئەم دواییانە، چین هێشتا روی نەکردۆتە مۆدێرنەی سیاسی، و رەدکردنەوەی شێلگیرانەی رەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ لەم وڵاتەدا، ئەم راستیە ئەسەلمینێت. جگە لەمە لەو روەوە کە چین لە دێرزەمانەوە رێگەیەکی سەربەخۆ لە وڵاتە کۆمنیستەکانی تری گرتبووە بەر، رۆخانی سۆڤیەت کاریگەری لەسەری دانەنا. دیـارە نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە چین دواجار رێکەوتننامەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانی لە بارەی مافە ئابوری، کۆمەڵایەتی وکلتوریەکان لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٧دا و رێکەوتننامەی مافە مەدەنی و سیاسیەکانی لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨دا واژۆ کرد، کە خۆی لە خۆیدا بە ئاماژەیەکی ئاشکرای کرانەوە ئەژمێرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سـەرەڕای پەیدابونی تاکباوەڕی پەرەسەندوو، و درێژەدان بە ریفۆرمی ئابوری (بە یەکەم هەنگاوی تایبەتیکردن)، هێشتا ئەم وڵاتە لەژێر نفوزی دوالیزمی ئایدۆلۆژیای کۆمنیستی و کلتوری تایبەتیدا، هەروا درێژە بە رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی ئەدات.

لەمڕووەوە وڵاتە کۆمنیستەکانی تری وەک ڤێتنام، کۆریای باکور، کوباو..لە هەلومەرجێکی هاوشێوەدان، گەرچی گۆڕانیان جیاواز و تۆتالیتاریسمەکەیان لاوازتـرە. ئەم وڵاتانەش وەک یەکێتی سۆڤیەت و چین هەرگیز مۆدێرنەی سیاسیان نەچەشت، و لە راستیدا کۆمیستیەکەیان رێگەی پێخستنە ناو مۆدێرنەی سیاسی لێگرتن.

بەڵێ بە سەرنجدان لە شێوە جیاوازەکانی تۆتالیتاریسم کە لەسەدەی بیستدا رویدا، ئەکرێت ئەم سەدەیە بە سەدەی گەڕانەوە بۆ دواوەی مۆدێرنەی سیاسی بزانرێت. ئەم گەڕانەوەیە دوو رێگەی جیاوازی گرتە بەر: یا مۆدێرنەی سیاسی هەبوو، یان لە دۆخی سەقامگیری و جێگیریدا لەناو برد (دۆخی فاشیسم و نازیسم) یان ئەگەری پەیدابونی لەو وڵاتانەدا لەناو برد کە هەرگیز ئاشنای نەبون (وەک کۆمنیسمی سۆڤیەت و چین). بێگومان ناکۆکی ئەم سەدەیەی ئاگر و ئاسن ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە گەرچی ئەم سەدەیە لە پەرەسەندن و گەشەکردنی زۆرێک لە زانست و زانین و تەکنیکە مۆدێرنەکاندا سەرکەوتوبوو کە هەلی کاری بەرچاویان لەزۆر بواردا رەخساند، بەڵام دەکرێت بگوترێت کە لە سەقامگیری مۆدێرنەی سیاسی لە وڵاتە گەورەکاندا بۆ ماوەیەکی درێژ سەرکەوتوو نەبوو. وەک پێشتر کۆتای فاشیسم و نازیسم پیشانیدا و بەم زوانە کەوتنی کۆمۆنیسم سەلماندی، بەدیهاتنی ئەم ئامانجە تەندا بە نەمانی تۆتالیتاریسم مومکینە. بەڵێ وەزیفەی سەدەی بیست و یەک بریتیە لە پاڵپێوەنانی دوو وڵاتی گرنگی روسیا و چین بەرەو مۆدێرنەی سیاسیە، کە هەردوکیان هەنوکە بۆ پێخستنە ناو ئەم ریگەیەوە، روبەڕوی چەندان کێشە بونەتەوە.

وەرگێڕانی فەسڵی پێنجەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:
موریس باربیە: مدرنیتەی سیاسی.ترجمە: عبدالوهاب احمدی. تهران، ١٣٨٣

# ئایدۆلۆژیا چییە؟

نووسینی: د.عبدالکریم سروش
و. لە فارسییەوە: موسعەب ئەدهەم

بابەتی ئایدۆلۆژیا لەچەندین ڕووەوە پەیوەستە بەزانستی کۆمەڵناسی یان زانست ناسییەوە. ئایدۆلۆژیا کە لە مانا سادە و زاراوەییەکەیدا بریتییە لە «زانست و زانیاری بە بیروباوەڕ» یان «بیروباوەڕناسی«. ئەم زاراوەیە لە سەرەتای دروستبوونیدا لەگەڵ جۆرێک لەتانە و زەمکردندا هاوڕا بوو. «ئایدۆلۆجیست» بە کەسێکی خەیاڵپەروەر ژمێردراوە کە بەو ئەندێشانەی لەواقیعیەت دابڕاون خۆی دڵخۆش دەکات. پاشتر تارادەیەک ئەم مانایەی ئایدۆلۆژیا چووە ناو قوتابخانەی مارکسیەوە و تێکەڵ بوو بەشیکردنەوەیەکی فەلسەفی — کۆمەڵناسی و لەلایەن مارکسەوە سوودی لێ بینرا. مارکس «ئایدۆلۆژیا»ی لەگەڵ «هەست یان ویژدانی درۆزن»



د.عبدالکریم سروش

**ئایدۆلۆژیا لەسەرووی ئەوەی کە هەڵگەراوەیە شێوە مەعریفەیەکی غەفڵەت ئامێزیشە، خزمەتکاری سودە، مەشروعیەت بەخشە بەدەسەڵاتی فەرمانڕەوا، لایەنگری دەسەڵات و سیاسەت و شۆڕشە، دژیەك دروستکەرە لە نێوان دیار و دەرەوە و زیهندا،**

بە بەرامبەر دانا. مەبەست لەهەست یان ویژدانی درۆزن ئەوەیەکە کەسێک بانگەشەی ئاگایی بکات، بەڵام لەحەقیقەتدا، نائاگایانە و بەهۆی بوونی جۆرێکی تایبەت لە ژیان و گوزەران، واقیعیەت بۆئەو بەشێوەیەکی هەڵگەڕاوە دەرکەوتبێت. لەبەرئەوە لەنێوان "ئایدۆلۆژیا" و "زانستی راستەقینە" جیاوازی هەیە: زانستەکان و ئاگاییە ڕاستەقینەکان کە هەمان "زانست" (Science) ن، ئەو ئاگاییانەن کەواقیعیەتی جیهان بەوجۆرەی کە هەیە دەبینن ودوور لە کاریگەری جۆری ژیانن. لە بۆچوونی مارکسیشدا ئەم "زانست"ە هەبوویەکی ڕێزلێگیراوە. بەڵام لە بەرامبەر زانست، ئایدۆلۆژیا بوونی هەیە کە شێوە هەڵگەڕاوەیە. لەبەرئەوە "زانست" و"ئایدۆلۆژیا" هەردووکیان لەگوتەزای مەعریفەن، بەڵام یەکێکیان مەعریفەیی حەقیقیە و ئەوی دیکەیان مەعریفەتی خەڵەتێنەر، بەم شێوەیە لەقوتابخانەی مارکسیزمدا جیاوازی هەیە لەنێوان "زانست" و"ئایدۆلۆژیا" ئەوەی کە باسکرا پێناسەیەکی تەواو و پڕاوپڕی ئایدۆلۆژیا نیە.

ئایدۆلۆژیا لەسەرووی ئەوەی کە هەڵگەراوەیە شێوە مەعریفەیەکی غەفڵەت ئامێزیشە، خزمەتکاری سودە، مەشروعیەت بەخشە بەدەسەڵاتی فەرمانڕەوا، لایەنگری دەسەڵات و سیاسەت و شۆڕشە، دژیەک دروستکەرە لە نێوان دیار و دەرەوە و زیهندا، هۆکاردار و بێ بەڵگە و خودی بەڵگە تاشین، گونجاو لەگەڵ ئاراستەی ژیان، بێگانە هێنەر بۆ خود "ئالیناسیۆن"، کاتی و قۆناغدار و مێژوویيە و جێگای ئەوەیە ئەرزشی بودابنرێت. ئایدۆلۆژیا زیاد لە هەر شتێک لەگەڵ عەقڵانیەت (Rationality) مرۆڤ سەروکاری هەیە و بەڕوانینی بەدگومانەوە سەیری

**مارکس «ئایدۆلۆژیا»ی لەگەڵ «هەست یان ویژدانی درۆزن» بە بەرامبەر دانا. مەبەست لەهەست یان ویژدانی درۆزن ئەوەیەکە کەسێك بانگەشەی ئاگایی بکات، بەڵام لەحەقیقەتدا، نائاگایانە و بەهۆی بوونی جۆرێکی تایبەت لە ژیان و گوزەران، واقیعیەت بۆئەو بەشێوەیەکی هەڵگەڕاوە دەرکەوتبێت.**



**مارکس**

دەکات و لەدیاریکردنیدا تاوانباری دەکات و بەستنی دەست و چاوی عەقڵ لە چرنووکی تەماع و مێژوو دەکێشێت و دەست خاڵی بانگەشەکەرانی پڕ لاف و مەعریفەتی بێهودە بڵاودەکاتەوە، ئێستا ئەم خاڵانە بەدرێژی باس دەکەین:

## بازنەی ئایدۆلۆژیا

لەڕووی مێژوویی و کۆمەڵایەتیەوە دروستبوون و دەرکەوتن و تەجەللای ئایدۆلۆژیا و پێشوازیکردن لەم هەستە یان مەعریفە درۆینە، دەبێت لە پێنج ناوچەی گرنگدا بۆی بگەڕێین:-

١-١- سەفسەتە: لەیۆنانی کۆندا، سۆفستاییەکان ئەوکەسانەبوون کە بە یارمەتی فێڵ و درۆ و قسەی بێهودە فیکری و یاریەکان و هەڵە لۆژیکیەکان وەڵامی بەرامبەرەکانیان دەدایەوە و مەبەستی خۆیان لەکورسی قبوڵکردن و ڕازی بوون دادەنیشاند. ئەم شێوە بەڵگەهێنانەوانە کەلە قاڵبی "ووتار"دا بڵاویان دەکردەوە، نەک بۆ کەشفکردنی حەقیقەت، بەڵکو بۆ بێدەنگکردنی ڕکابەر بوو. ئەم تاکانە، پەروای

ڕاستی و درۆیان نەبوو و بەڵگەهێنانەوەش لەکاریاندا نەبوو، بەڵکو لەبەر داخـوازی سوود لە بەرامبەر یەکتردا ڕیز دەبوون و بەرامبەر دەوەستان. گوتویانە کە ئەرستۆ زانستی لۆژیکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سۆفستاییەکان دانا، یەکێک لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی ئایدۆلۆژییەکان هەر ئەمەیە کە خزمەتگوزاری سوودی تاکە کەس، یان چین و توێژ یان حکومەت و...هتد بن و بەڵگەیان پێویست نەبێت. جارێکی دی لێرە سوودەکان ڕووبـەڕوون نەک بەڵگە. دەڵێی ئێستا شێوەی بەڵگە هێنانەوە ومەعریفەت لە خۆدەگرن.

٢-١- ئیمان: ئیمان لەڕەگەزی فیکر نیە، بەڵکو لە ڕەگەزی ئیرادەیە، ئیرادەیەک کە بۆ ئەندێشە یان هۆکارێکی دی دەگەڕێتەوە. ئیمان هۆی ئەوەی ئیرادە و بڕیاردان لەخۆ دەگرێت، بەپێچەوانەی ئەندێشەی ڕووت، وا لە مرۆڤ دەکات کردار ئەنجام



کانت

**بەبۆچوونی کانت لەقەڵەمڕەوی فەلسەفە هەندێك بابەتی میتافیزیکی وەکو جەبر و ئیختیار، سادەیی یان تێکەڵ بوونی ماددە، سنوردار یان سنوردار نەبوونی جیهان و کۆن و نوێبوونی جیهان لەڕیزی ئەو بابەتانەن کە شایەنی سەلماندن یان پوچەڵبوونەوە نین**

بدات. ئەندێشە ڕاستی یان ناڕاستی دەگرێتەوە. بەڵام ئیمان ڕاستی و ناڕاستی ناگرێتەوە و بەهێزی و لاوازی هەیە. موتەکەلیمانی جەبری و قەدری کە لە بەرامبەر یەکتریدا دەوەستان و دژی یەک بەڵگەیان دەهێنایەوە لەڕاستیدا ئیمانیان لەگەڵ یەکتردا دەجەنگا، بەڵگە و عەقڵیان پێشتر ئیمانی بە شتێک هێنا بوو و پاشان شێوەیەکی عەقڵانیان پێدەبەخشی. زۆرێک لە باسەکانیشیان لە ڕاستیدا ئایدۆلۆژیا بوو واتە، ناعەقڵانی.

٣-١ ئەو حوکمانەی جێگای گفتوگۆن (جدلی گرفین): بەبۆچوونی کانت لەقەڵەمڕەوی فەلسەفە هەندێک بابەتی میتافیزیکی وەکو جەبر و ئیختیار، سادەیی یان تێکەڵ بوونی ماددە، سنوردار یان سنوردار نەبوونی جیهان و کۆن و نوێبوونی جیهان لەڕیزی ئەو بابەتانەن کە شایەنی سەلماندن یان پوچەڵبوونەوە نین. لەبەرئەوە باوەڕبوون بەو بابەتانە ناتوانین بەبەڵگە و بورهان پاڵپشتیان لێ بکەین. لەم ڕووەوە بۆ ڕووگەدان و ئاراستەکردنی ئەو بابەتانە دەبێت بەدوی کاروباری نامەعریفیدا بڕۆین. واتە باسکردن لەبارەی قبوڵکردن و ڕەتکردنەوەی ئەم بابەتانە بۆ بەرامبەر یەک وەستان و لایەنگریەکان و حاڵەتی و میزاجی ڕازیبوونی دوولایــەن یان ئینکاریکردنیان دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوە کاتێک لەمەڕ ئەم بابەتانە شەڕی بەڵگەهێنانەوە دروست دەبێت، لەڕاستیدا بەڵگەکان لەگەڵ یەکتردا جەنگ ناکەن، بەڵکو میزاج و چێژ و حاڵەتە دەروونیە جیاوازەکان لەگەڵ یەکدا دەجەنگن.

٤-١ بەهاکان و ئەخلاق: گوتەزای شتە ئەخلاقیەکان و بەهاکان لە شتە ئیعتیباریەکانن و لەبەرئەوە بەڵگە و (استدلال) وەرناگرن. لەو شوێنانەی کە لە بابەتی ئەم بەهایانەوە جیاوازی دروست دەبێت، لە ڕاستیدا فەرهەنگەکان و پەروەردەی مرۆڤەکانە کە لەبەرامبەر یەکتردا دەوەستن، گەرچی شێوەی بەڵگەهێنانەوە لەخۆ دەگرن.

٥-١ دوو حیزبی سیاسی کە لەگەڵ یەکدا جەنگ دەکەن، توانا و دەسەڵاتەکان لەگەڵ یەکتردا جەنگ دەکەن، بەڵام لەڕوکەشدا دژی یەکتریش هەندێجار بەڵگەدەهێننەوە و دەیانەوێت لە ڕووی عەقڵی و ئەخلاقیەوە وەلامی یەکتر بدەنەوە.

لەبەرئەوە لە گۆرەپانی مەعریفیدا، بەلایەنی کەمەوە لە پێنج شوێندا، لە ڕووکـەشـدا واپێدەچێت و وادەزانرێ کە بیرو هزرەکان لەگەڵ یەکتردا ڕووبەڕوو دەبنەوە، بەڵام لەواقیعدا کاروباری نافیکری و نا هزری لەگەڵ یەکتر لە جەنگدان. بەروونکردنەوەیەکی دی واپێدەچێت کە بەڵگەکان لەگەڵ یەکتردا دەجەنگن، لە کاتێکدا لە واقیعدا هۆکارەکان لەگەڵ یەکتردا دەرگیرن و ئایدۆلۆژیاش هەرئەمەیە. واتە کارێکی نامەعریفی کە پۆشاکی مەعریفی لەبەرکردووە. سوود و دەسەڵات و ئیمان و کەلام و ئەخلاق کە هەموویان ڕیشەی دیکەیان هەیە، بەرگی مەعریفەت دەپۆشن و دەبنە ئایدۆلۆژیا.

ئـەوەی کەباسکرا، وێنەی ناواخنی ئایدۆلۆژیای کۆمەڵێک لەحوکمەکان بوو کە لە ساتی لۆژیکی و ئەزموونیەوە سەلماندن پوچەڵکردنەوەیان نیە.

**سەرچاوە**:

فربەتر از ایدئولوژی، د.عبدالکریم سروش، مؤسسە فرهنگی صراط، تهران، چاپ هشتم، ١٣٨٤، ص ٧٩ – ٨٢.

# تیۆری فرۆیدی و مۆدێلی پڕوپاگەندەی فاشیستی

نووسینی: تیۆدۆر ئادورنۆ، ماکس هۆرکهایمێر
و. لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

بە درێژەی دەیەی رابردوو زانایانی زانستی کۆمەڵایەتی، سروشت و ناوەڕۆکی وتار و راگەیاندنی وتەبێژانی فاشیستی ئەمریکایان بە قووڵی راڤە کردووە. هەندێ لەم تۆژینەوانە، کە بۆ لێکدانەوەی ناوەڕۆک تەرخان کرابوو، سەرئەنجام لە قاڵبی کتێبی پێغەمبەرانی فریو بەرهەمی لۆڤنتاڵ و گوترمەن دا بڵاوکرایەوە[1].

---

١ Massen-psychologie und Ichanalyse ساڵی ١٩٢١ بڵاوکرایەوە. وەرگێڕی ئینگلیزی بە دروستی دەڵێ وشەی ئینگلیزی group هاوتای وشەی ئاڵمانی Masse و وشەی فەرەنسی foule ە، دەبێ ئەوەش بڵێین کە لەم کتێبەدا مەبەست لە چەمکی "خود" ئەو هۆکارە دەروونناسانە تایبەتە نییە کە لە بەرهەمەکانی دواتری فرۆید دا لە دژایەتی نەست و سوپێر ئێگۆ پێناسە کراوە، بەڵکوو تەنیا بە مانای "خود" بەکارهاتووە.


سگمۆند فرۆید

**ئەو میتۆدەی کە فرۆید لە کتێبەکەیدا بەکاری هێناوە شرۆڤەیەکی دینامیك لە باسی لوبۆن لەمەڕ زەینی جەماوەری و ڕەخنەیەك لە هەندێ چەمکی دۆگما ئاراستەدەکات کە - گۆیا وەك هەندێ دەستەواژەی ئەفسوونی - بەهۆی لوبۆن و دەروونناسانی پێش دەروونشیکاری، وەك کلیلی هەندێ دیاردەی سەرسوڕهێنەر بەکاردەبرێن**

ئەم بەرهەمە بەگشتی باسی دوو تایبەتمەندی سەرەکی دەکات. یەکەم، بەپێچەوانەی هەندێ وتەی سەیر و تەواو نەگەتیڤ، بۆ ناردنی بیانیان بۆ کەمپی کاری زۆرەملی و بۆ دەرکردنی جولەکەکان، (دەبێ بڵێم کە) پرۆپاگەندەی فاشیستی لەم وڵاتەدا گرنگییەکی ئەوتۆ بە پرسی سیاسی کۆنکرێت نادات. زۆربەی زۆربەی وتەکانی لایەنگرانی فاشیست ڕوو لە خەڵکی ئاساییین. ئەم وتانە بە ڕۆشنی زیاتر لەسەر بنەمای لێپرسینەوە لە سایکۆلۆژیستەکان دامەزراوە، نەک ئامانجی ڕاکێشانی هەوادارانی تازە لە ڕێگای دەربڕینی عەقڵانی و ئامانجی عەقڵانییەوە. چەمکی «تاقمی هەڵخڕێنەر»، ئەگەرچی بەمهۆیە کە بە چاوی سووک سەیری جەماوەر دەکات جێگای ڕەخنەیە، بەڵام چەمکێکی ڕۆشنە، چونکە فەزایەکی ئێحساسی، هێرشبەرانە و نائەقڵانی دەرئەبرێت کە ئەمەش هیتلەرەکانی ئایندە بە دەستی ئەنقەست بانگەشەی بۆ ئەکەن. ئەگەر ناوهێنانی «تاقمی خوێڕی» بە خەڵک جۆرێک سووکایەتی یە، دەبێ بزانین کە ئامانجی ئاشکرای ئاژاوەگێڕانی فاشیست ئەوەیە کە خەڵک ببن بە «تاقمی خوێڕی»، یانی جەماوەرێک کە بە بێ هیچ مانا و ئامانجێکی سیاسی، فەزای ترس و سام و توندوتیژی پێکدێنن. ئامانجی گشتی ئەم ئاژاوەچییانە ئەوەیە کە بەشێوەی مێتۆدیک پەرە بەو شتە بدەن، کە لە کاتی بڵاوبوونەوەی کتێبی بەناوبانگی گوستاو لوبونەوە، بە «دەروونناسی جەماوەر» ناوبانگی دەرکردووە.

دووهەم، هەڵوێستی ئەم شەڕخوازانە بەشێوەی سیستماتیکە و لە چەن «مکانیزمێکی» وشک و تەواو دیاریکراو پێڕەوی دەکات. ئەم شتە نیشانەی یەکێتی دوائامانجی سیاسی فاشیستەکان نییە، یانی نابووتکردنی دیموکراسی بەهۆی ڕێکخستنی جەماوەر لە دژی بنەماکانی دیموکراتیک، بەڵکوو زیاتر سروشتی زاتی فۆرم و ناوەرۆکی خودی پرۆپاگەندەی فاشیستی دەردەخات. زۆربەی وتەکانی ئاژاوەچییان،

هەر لە کافلین و جیراڵد تا رقئەستورانی زەبوونی شارستانی، لێکدەچن، بەجۆرێک کە بە لێکدانەوەی وتەی یەکێکیان دەتوانین هەمویان بناسین. سێهەم: پەیڤ و وتەی فاشیستەکان بە رادەیەک یەکدەستن کە مرۆڤ بە ناسینی چەند فێڵێکیان لەگەڵ سێڵاوی بێ کۆتایی دوبارەبوونەوە بەرەوڕوو دەبێ. لە راستیدا، دوپاتبوونەوەی بەردەوام و یەکدەستی ئەندێشەکان ئامێری پێویستی ئەم فێڵەن.

ئەگەرچی مۆدێلی وشکی میکانیکی زاڵ لەسەر پڕوپاگەندەی فاشیستی، هەندێ ڕەهەندی تایبەتی ئەم هزرە ڕوون دەکاتەوە، بەڵام ناتوانین لەم هەستە خۆببوێرین کە بابەت و ماتریاڵی پڕوپاگەندەی فاشیستی پێکهاتەیەکی تۆکمە پێکدێنن، پێکهاتەیەک بەپێی تێگەیشتنێکی گشتی تۆتالیتێر، کە بەشێوەی وشیار یان ناوشیار، هەر وشەیەک کە بەسەر زماندا دێت دیاری دەکات. ئەم پێکهاتە تۆکمەیە وادیارە هەم لەگەڵ تێگەیشتنی سیاسی نێو پڕوپاگەندەکان و هەم لەگەڵ زاتی سایکۆلۆژیکی ئەوان پێوەندی هەیە. تا ئەمڕۆ تەنیا سروشتی ئابستراکت و دابڕاوی فێڵ و میکانیزمە فاشیستییەکان بەشێوەی زانستی راڤە کراوە و مانای دەروونشیکارانەیان بەوردی شرۆڤە کراوە. ئێستا کە توخمە سەرەتاییەکان بەپێی پێویست راڤەکراون، کاتی ئەوە هاتووە ئەو سیستەمە سایکۆلۆژیکە شیبکەینەوە کە ئەم توخمانەی لەبەر گرتووە – ئەڵبەت لەخۆڕا نییە کە زاراوەی نەزمی سایکۆلۆژیک ناوی نەخۆشی پارانۆیا مان وەبیردێنێتەوە. وادیارە ئەم مێتۆدە شیاوترە، چونکە ئەگەر وانەبێت شرۆڤەی دەروونشیکارانە کە بە دڵخواز لە فێڵ و میکانیزمی ئابستراکت کەڵک وەردەگرێ ناتوانێ سیستماتیک بێت. دەرخستن و گەشەپێدانی جۆرێک قاڵبی تیۆریک وەک سەرچاوە پێویستە. بۆوەی هەر کام لەم مکانیزمە ئابستراکتانە بەناچار بەرە و شرۆڤەیەکی دەروونشیکارانە دەمانبەن، بێگومان دەبێ وایدابنێین کە ئەم قاڵبی سەرچاوە دەبێ بەپێی تیۆرییەکی دەروونشیکاری بنەمایی هەمەلایەنە پێکبێت کە هەموو هەڵوێستێکی شەڕئەنگێزانی فاشیست بگرێتەوە.

فرۆید خۆی وەها قاڵبێکی لە کتێبی دەروونناسی گرووپ و دەروونشیکاری ئێگۆ دا باس کردووە. بەرهەمێک کە بەزوویی ساڵی ١٩٢٢ بە زمانی ئینگلیزی وەرگێڕدرا و بڵاوکرایەوە، یانی سەردەمێک بەرلەوەی مەترسی فاشیزم بەجدی خۆدەربخات. فرۆید هەرچەند بواری سیاسی ئەم پرسەی بۆ گرنگ نەبوو، بەڵام بەجۆرێک سروشت و سەرهەڵدانی بزاڤی جەماوەری فاشیستی بەپێی چەمکی سایکۆلۆژیکی پەتی بەرۆشنی پێشبینی کردبوو. ئەگەر ئەم خاڵە دروست بێت کە دەروونشیکار نەستی نەخۆش دەرک دەکات، هەروەها دەتوانین وای دابنێین کە شهوودی تیۆریکی دەروونشیکار دەتوانێ ئەو ویستانە کە هێشتا لە ئاستی ئەقڵانی دا شاراوەن، بەڵام لە ئاستێکی قووڵتردا خۆدەردەخەن، پێشبینی بکات. رەنگە لە خۆڕا نەبووە کە فرۆید پاش جەنگی جیهانی یەکەم هەموو سەرنجی خۆی بۆ پرسی خۆشەیدایی و پرسەکانی ئێگۆ بەتایبەتی تەرخان کرد. مکانیزم و کێشە غەریزیەکانی کە لەگەڵ ئەم پرسانە پێوەندییان هەیە بەرۆشنی ڕۆڵی گرنگ و گرنگتر لەم سەردەمەدا دەگێڕن، لە کاتێکدا بە وتەی ئەو دەروونشیکارانە کە خاوەن ئەزموونی زانستین، جۆرەکانی دەروونپشێوی «کلاسیک» وەک هیستری، کە مۆدێلی سەرەتایی پێکهاتنی مێتۆدی دەروونشیکاری بوون، ئێستاش وەک سەردەمی فرۆید ڕوودەدەن، یانی هەر ئەوکات کە چارکۆ خەریک بوو لەسەر نوێن نەخۆشی هیستری هەتوان دەکرد و ئیبسنیش لە شانۆنامەکانی خۆیدا بەیانی دەکرد. بەپێی ڕوانگەی فرۆید، پرسی

دەروونناسی جەماوەر پێوەندی نزیکی لەگەڵ جۆری تازەی نەخۆشی سایکۆلۆژیک هەیە کە تایبەتمەندی بەرجەستەی ئەم سەردەمەیە کە دەبینین بەهۆی ئابووری — کۆمەڵایەتی تاک تووشی سستی و لاوازی دەبێت و دەپووکێتەوە. ئەگەرچی فرۆید گرنگی بە پرسی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی نەدا، بەڵام لە بواری سنوورەکانی مۆنادۆلۆژیکی تاک دا، باسی ئاسەوار و نیشانەکانی قەیرانی قووڵی تاک (لە جڤاتی هاوچەرخ دا) دەکا و پیشان دەدات کە تاک ئامادەیی تەواوی هەیە تا لە ئاست هۆکاری کۆیی بەهێزدا ملکەچ بکات. فرۆید ئەگەرچی قەت تۆژینەوەکانی خۆی بۆ ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی هاوچەرچ تەرخان نەکرد، بەڵام بەهۆی پەرەپێدان بە کاری (تیۆریکی) خۆی، هەڵبژاردنی بابەتە دڵخوازەکان و، گەشەپێدان بە چەمکە بنەماییەکان، ئاماژەی بە ڕەوتە مێژووییەکان کردووە.

ئەو مێتۆدەی کە فرۆید لە کتێبەکەیدا بەکاری هێناوە شرۆڤەیەکی دینامیک لە باسی لوبۆن لەمەڕ زەینی جەماوەری و ڕەخنەیەک لە هەندێ چەمکی دۆگما ئاراستەدەکات کە — گۆیا وەک هەندێ دەستەواژەی ئەفسوونی — بەهۆی لوبۆن و دەروونناسانی پێش دەروونشیکاری، وەک کلیلی هەندێ دیاردەی سەرسوڕهێنەر بەکاردەبرێن. یەکەمین و گرنگترین بابەت لەنێو ئەم چەمکانەدا چەمکی ئیلهام (infusion)ـە کە بەڕێکەوت، هێشتا وەک جۆرێک ڕێگەچارەی کاتی، لە بیرکردنەوەی ساویلکانە لەمەڕ دەسەڵاتی تلێسم ئاسای هیتلەر و هاوشێوەکانی بەسەر جەماوەردا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ. وەسفی بەناوبانگی لوبۆن لە جەماوەر (mass) وەک کۆمەڵی مرۆڤی نائەقڵانی و لە تاکێتی بۆشکراو کە بە سانایی فریو دەخۆن، حەزیان لە توندوتیژییە و بەگشتی سروشتێکی دواکەوتوانەیان هەیە، لە لایەن فرۆیدەوە ڕەت ناکرێتەوە. ئەوەی فرۆید لە لوبۆن جیادەکاتەوە نەبوونی هەستی سوکایەتی کلاسیک لەئاست جەماوەرە کە وەک بابەتی زاڵی زۆربەی دەروونناسانی کۆنتر دەوردەبینێ. فرۆید لەجیاتی ئەم بۆچوونە کە پێی وایە جەماوەر لە سروشتی خۆیاندا نزم و پەستن و ڕەنگە هەروا دەمێننەوە، بە پشت بەستن بە ڕۆحی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەری دەپرسێ: چ شتێ جەماوەر دەکاتە جەماوەر؟ فرۆید تیۆری سادەی بوونی غەریزەیەکی کۆمەڵایەتی یان گاڕانی ڕەت دەکاتەوە، بەڕای ئەو ئەم تیۆرییە پرسەکە ڕوون دەکاتەوە و چارەسەری ناکات. فرۆید لە ڕەتکردنەوەی ئەم پرسەدا سەرەڕای پشت بەستن بە بەڵگەی دەروونناسانە، بەڵگەی بەهێزی کۆمەڵناسانەش بەکاردێنێ. بەراوردکردنی ڕێکخراوی جەماوەری مۆدێرن لەگەڵ دیاردەی بایۆلۆژیکی ئەوەندە جێگای بڕوا نییە چونکە ئەندامانی جەماوەری کۆمەڵگەی هاوچەرخ لانیکەم بەڕواڵەت خاوەن تاکێتین. ئەوان ڕۆڵەی جڤاتێکی ڕکەبەر، لیبراڵ و تاکگەران و، بە مەبەستی پاراستنی پێگەی خۆیان وەک تاکی سەربەخۆ بەرنامەیان بۆ داڕێژراوە. ئەوان بەردەوام بەهۆی "شپرز" بوون سەرزەنشت دەکرێن و وشیار دەکرێنەوە کە نەبا ملکەچ بکەن. تەنانەت ئەگەر وایدابنین کە غەریزەی کۆن و پیش تاکی نافەوتێن، ناتوانین بە سادەیی ئاماژە بەم میراتە غەریزییە بکەین، بەڵکوو دەبێ ڕوونی بکەینەوە کە بۆچی کۆمەڵی مۆدێرن بەرەو وەها مۆدێلێکی ڕەفتاری دەگەڕێتەوە کە بەشێوەی ئاشکرا حاشا لە پێگەی ئەقڵانی و قۆناغی ئێستای ژیاری تێکنۆلۆژیکی خاوەن ڕۆشنگەری دەکات. ئەمە ڕێک هەر ئەو کارەیە کە فرۆید ویستوویە ئەنجامی بدات. ئەو تێدەکۆشێ تێبگات کە گۆڕینی تاکەکان بۆ گرووپێکی جەماوەری بەرهەمی کرداری کام هێزی



سیگمۆند فرۆید

سایکۆلۆژیکە. "ئەگەر تاکەکانی ئەندامی گرووپێک لە قاڵبی پێکهاتەیەک دا تێکەڵاو بن، بەدڵنیاییەوە دەبێ شتێک هەبێت تا ئەوان یەکانگیر بکات، ڕەنگە ئەم پێوەندە کە ئەوان یەک دەخات هەمان شت بێت کە ڕوخساری تایبەتی گرووپێک پێکدێنێ." بەڵام ئەم هەوڵە دەتوانێ هاوسەنگی شیکردنەوەی پرسی بنەڕەتی دەسەڵات و ئوتۆریتەی فاشیستی بێت، چونکە تاکی خەڵک فریودەری فاشیست، کە دەبێ داکۆکی چەندین ملیۆن نەفەر لەپێناو ئامانجێک کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەقڵانیان ناکۆکە بەدەست بێنێ، تەنیا بە خولقاندنی قەڵبی هەمان پێوەندی کە فرۆید بۆی دەگەڕێ، دەتوانێ وەها کارێک بکات. ئەگەر هەڵوێستی ئەو کەسانە کە خەڵک فریو دەدەن ڕیالیست بێت- سەرکەوتنی جەماوەری ئەو کەسانە دەریدەخات کە بەمجۆرەیە - دەتوانین وایدابنین کە پێوەندی باسکراو ڕێک ئەو شتەیە کە تاکی فریوکار تێدەکۆشێ تا بەشێوەی دەسکرد بیخولقێنێ، لە ڕاستیدا ئەم پێوەندییە هەمان بنەمای جۆشدەرە کە لەودیوی فێڵەکانەوە شاراوەیە.

فرۆید لە هاودەنگی لەگەڵ تیۆری گشتی دەروونشیکاری دا، پێی وایە ئەو بەند یان پێوەندە کە تاکەکان لە گرووپێکی جەماوەری دا تێکەڵ دەکات سروشتێکی شەهوەتی (libidinal) هەیە. دەروونناسانی کۆنتریش لە هەندێ بابەتەوە ئاماژەیان بەم ڕەهەندەی دەروونناسی جەماوەر کردووە. "بە ڕای مەک دوگال لە جەرگەی گرووپێک دا هەست و سۆزی مرۆڤەکان ئەوەندە توند و تیژ دەبنەوە کە لە هیچ دۆخێکی دیکەدا، هەرگیز بەم ئاستە ناگەن یان بە دەگمەن دەگەن. ئەم پرسە بۆ ئەو کەسانە لەزەت بەخش دەبێت کە دەیانەوێ بێ هیچ کۆت و بەندێک ڕکێفی خۆیان بە شەهوەتەکانیان بسپێرن بەمجۆرە لە گرووپ دا بتوێنەوە و ئیدی هەست بە سنوورەکانی تاکێتی خۆیان نەکەن." فرۆید بێجگە لەوە کە یەکێتی و تۆکمەیی گرووپەکان بەپێی چەمکی لەزەت ڕاڤە دەکات، واوەتر دەچێ و تۆکمەیی گرووپ وەک جۆرێک دامرکان و ڕەزامەندی واقعی یان هێمایی ڕاڤە دەکات کە تاکەکان بە تێکەڵبوون لە گرووپ دا پێی دەگەن. هەروەها هیتلەر ئەم ڕاستییەی باش دەزانی کە بنەمای شەهوانی دەبێتە هۆی پێکهاتنی جەماوەر و خۆسپاردنیان بە سەرۆک، بەتایبەت ئەو کاتە کە بەشدارانی کۆڕەکانی خۆی بە خاوەن تایبەتمەندی مێینە و پەسیڤ دەزانی و، بەمجۆرە بەشێوەی هێمایی ئاماژەی بە ڕۆڵی هاوڕەگەزخوازی نەست لە دەروونناسی جەماوەردا دەکرد. گرنگترین ئاکامی کۆششی فرۆید بۆ ناساندنی چەمکی وزەی سێکسی (libido) لە باسی دەروونناسی گرووپ دا ئەوەیە کە تایبەتمەندییە گشتییەکانی جەماوەر، خەسڵەتی فریودەرانە و نەگۆڕی خۆیان لەدەست دەدەن، خەسڵەتێک کە لە دەرک و تێگەیشتنی غەریزەی تایبەتی جەماوەری یان گاڕانی دا دەردەکەوێ. ئەم غەریزانە زیاتر هۆکردن نە هۆکار. بەپێی ڕوانگەی فرۆید خەسڵەتەکانی جەماوەر، زیاتر

بەرهەمی سروشت و تایبەتمەندی کۆن و نادیارن نە سروشتێکی تازە. "بە ڕای من پێویست نییە کە گرنگی زۆر بە دەرکەوتنی تایبەتمەندی نوێ بدەین. بۆ ئێمە وتنی ئەم خاڵە بەسە کە لە قاڵبی گرووپێک دا، تاک دەکەوێتە نێو هەلومەرجێکەوە کە ڕێگای پێ دەدات تا ئەو ئاستەنگانە کە ویستەکانی نەستی سەرکوت دەکەن، لەنێوببات." ئەم بۆچوونە بێجگە لە وەی کە ئاستەنگی تیۆرییەکانی دیکە ڕزگارمان دەکات بەڵکوو ئەم ڕاستیەش ڕاڤە دەکات کە ئەو مرۆڤانەی کە لە ناخی گرووپەکان دا دەتوێنەوە، دواکەوتوو نین بەڵکوو هەڵوێستی دواکەوتوانە دەگرن کە لەگەڵ ڕەفتاری سروشتی و ئەقڵانی خۆیان لە ناکۆکی دایە. سەرەڕای ئەمەش، تەنانەت سادەترین ڕاڤەکانیش دڵنیامان دەکەن کە هەندێ تایبەتمەندی جەماوەر لەگەڵ خەسڵەت و ڕەفتاری سەردەمی کۆن دا سازگارن. لێرەدا بەتایبەت دەبێ ئاماژە بە ڕێگای قەدبڕی پۆتانسیەلی بزاڤ لە هەست و سۆزی توندوتیژەوە بۆ کرداری توندوتیژ بکەین کە هەموو نوسەران و شارەزایانی پرسی دەروونناسی جەماوەر جەختیان لەسەری کردووە، هەمان دیاردە کە لە بەرهەمەکانی فرۆیددا لەمەڕ کولتووره سەرەتاییەکان بەم فەرزە دەگات کە کوشتنی باوک لە مێگەلی سەرەتایی دا پرسێکی خەیاڵی نییە بەڵکوو لەگەڵ ڕاستیەکانی پێش مێژوو پێوەندی هەیە. بەپێی تیۆری دینامیک، زیندووکردنەوەی ئەم هەستە (کۆن)انە دەبێ وەک بەرهەم و ئاکامی کێشەیەک فام بکرێت. ڕوونکردنەوە و ڕاڤەکردنی هەندێ تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی فاشیستی دەتوانێ سەمەربەخش بێت، تایبەتمەندییەک کە دەکرێ وایدانبین کە زادەی ناکۆکی نێوان هێزە دەروونییە جیاوازەکانە. لێرەدا دەبێ زیاتر لە هەموو شتێ گرنگی بە چەمکی سایکۆلۆژیکی ویستی وێرانکاری بدەین کە فرۆید لە کتێبی ژیار و ناڕەزایەتییەکانی دا ڕاڤەی کردووە. فاشیزم، وەک دژایەتیەک لە ئاست شارستانیەت، تەنیا بە مانای چەسپانی دووبارەی پرسی کۆن نییە، بەڵکوو هاوکات بەمانای بەرهەمهێنانەوەی پرسی کۆنە لەنێو شارستانیەت دا و بەهۆی شارستانیەتەوە. ناساندنی پەتی هێزە سەربزێوە فاشیستەکان وەک چەند وزەیەکی بەهێزی نەست (id) کە لە ئاست نەزمی کۆمەڵایەتی سەردەم ڕەت دەکەنەوە، پرسەکە بە ڕۆشنی ڕاڤە ناکات. خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە سەرهەڵدانی فاشیستی هەندێ جار وزەکانی تاک لە هەندێ هۆکاری سایکۆلۆژیکی تر وەردەگرێ کە بەناچار لە خزمەتی نەست دا جێگیر دەبن.

بۆوەی کە پێوەندی شەهوانی نیوان ئەندامانی گرووپی جەماوەری بەڕۆشنی خاوەن سروشتی سێکسی ئازادانە نییە، ئەم پرسیارە دێتەگۆڕێ کە چ میکانێزمێکی سایکۆلۆژیک وزەی سێکسی سەرەتایی وەک هەست و سۆزێک دەردەخات کە جەماوەر لێک کۆدەکاتەوە. فرۆید بە شیکردنەوەی ئەو دیاردانە کە دەکەونە بەر دوو چەمکی ئیلهام و ئیلهام وەرگرتن، ئەم پرسە راڤە دەکات. ئەو ئیلهام وەک "داڵدە" یان "پەردەیەک" دەبینێ کە "پێوەندی عشقی" دەشارێتەوە. ئەمە خاڵێکی بنەڕەتییە کە "پێوەندی عشقی" شاراوە لە و دیو دیاردەی ئیلهامەوە ناوشیارانە بمێنێتەوە[1]. فرۆید ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات کە لە گرووپانی ڕێکخراوی وەک ئەرتەش و کلیسا، لە نێوان ئەندامان‌دا یان هیچ باسێک لە عشق ناکرێت، یان تەنیا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ باسی دەکرێت، یانی بەهۆی جۆرێک وێنە یان ڕوخساری دینی کە هەموو ئەندامان لە عشقی ئەودا یەک

١. «... پێوەندی عاشقانە ... هەروەها زاتی زەینی گرووپی پێکدێنێ. نابێ لەبیرمان بچێ کە سەرچاوەکانی دەسەڵات هیچ ئاماژەیەک بەم پێوەندییە ناکەن.»

دەگرن و دەبێ هەموویان لە پێوەندی لەگەڵ یەکتردا لە عشقی گشتگیری ئەو پێڕەوی بکەن. ئەم خاڵە گرنگە، چونکە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا، بەو گرووپە فاشیستانەوە کە بەشێوەی دەسکرد یەکیان گرتووە، ئاماژە و گەڕانەوە بۆ (دیاردەی) عشق بەتەواوی سڕاوەتەوە[2]. هیتلەر نەیدەویست ڕۆڵی کلاسیکی باوکی مێرەبان بگێڕێ، بەڵکوو ڕۆڵی نەگەتیڤی دەسەڵاتداری بەهێز و سامناکی زۆر پێ باشتر بوو. چەمکی عشق بە کاتێگۆری ئابستراکتی ئاڵمانەوە بەسترا و بە بێ وەسفی «ناموس پەرستانە« بەدەگمەن باسی دەکرا، وەسفێک کە تەنانەت ئەم عشقەی لە ئاست کەسانی تر بەشێوەی دوژمنکارانە و داگیرکەرانە دەنواند. یەکێ لە پرنسیپە بنەماییەکانی ڕێبەرانی فاشیست ئەوەیە کە وزەی شەهوانی لە ئاستی نەست دا بهێڵنەوە تا بتوانن دەرکەوتنی ئەم وزەیە لەپێناو ئامانجی سیاسی خۆیان ڕێک بخەن. هەرچەندە ڕۆڵی بیرێکی واقعی، وەک ڕزگاری دینی، لە پێکهاتنی جەماوەردا کەمتر بێت، هەرچەندە تاقە ئامانجی سەرەکی زیاتر مێشک گۆڕین و ڕێکخستنی جەماوەر بێت، عشقی ئازادانەش دەبێ بەشێوەیەکی تەواو سەرکوتکراو و لە قاڵبی کۆیلەتی دا دەرکەوێت. لە ئایدیۆلۆژی فاشیستی دا بەدەگمەن خاڵ پەیدا دەبێ کە شیاوی خۆشویستن بێت.

مۆدێلی شەهوانی فاشیزم و تێکڕای تێکنیکی خەڵک فریودەرانی فاشیست، سروشتێکی دەسەڵاتخوازانەی هەیە. لێرەدایە کە فێڵەکانی تاکی خەڵک فریودەر و هیپنوتیست لەگەڵ ئەو مکانیزمە سایکۆلۆژیکە سازگار دەبێت کە بەهۆی ئەوەوە تاکەکان ناچار بە پاشەکشە دەبن، بەجۆرێک کە وەک ئەندامانی گرووپێکی مێگەل ئاسا دەردەکەون.

هیپنوتیست بە یارمەتی کار و مکانیزمەکانی خۆی، بەشێک لە میراتی کۆنی سوژە لەودا بێدار دەکاتەوە، هەمان بەش کە سوژەی ملکەچی دایک و باوکی کردبوو و ناچاری کردبوو تا لە پێوەندی خۆی لەگەڵ باوکی دا جۆرێک جۆش و خرۆشی تاکی سەرلەنوێ ئەزموون بکات: ئەوەی بەمجۆرە بێدار دەبێتەوە ئایدیای پرسۆناژێکی مەزن و سامناکە کە لەئاست ئەودا تەنیا دەکرێ ڕوانگەیەکی پەسیڤی – مازوخیستی هەڵبژێردرێت، کەسێک کە دەبێ ئیرادەی مرۆڤ تەسلیمی بێت – لە کاتێک دا بە تەنیا مانەوە لەگەڵ ئەو، یان «بەرەوڕوو بوون لەگەڵ ئەو»، کارێکی ئێجگار پڕمەترسییە. تەنیا بەمشێوەیە دەتوانین پێوەندی نێوان ئەندامی ئێزۆلەی مێگەلی سەرەتایی و باوکی سەرەتایی بۆ خۆمان ڕاڤە بکەین... کەوابوو تایبەتمەندی نائاسایی و زەختاوی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، کە هەموویان لە دیاردەکانی ئیلهام دا دەبینرێن، دەکرێ لەگەڵ سەرچاوەی واقعی خۆیان لە مێگەلی سەرەتایی دا پێوەند بدرێن. ڕێبەری گرووپ هێشتا وەک باوکی سامناکی سەرەتایی دەور دەبینێ، گرووپیش هێشتا بەتەواوی دەیەوێت لەئاست دەسەڵاتی زەخت و زۆردا ملکەچ بکات و ئینتمای بێ سنوور بۆ ئۆتۆریتە لەودا دەبینرێ. بە وتەی لوبون، گرووپ تینووی کۆیلەتییە. باوکی سەرەتایی، وەک ئامانج یان ئایدیالی گرووپ (group ideal) دەور دەبینێ، کە لەجیاتی ئایدیالی ”ئێگۆ“ (ego ideal) بەسەر ئێگۆدا زاڵە. دەکرێ ڕوداوی هیپنوتیزم ڕێک وەک گرووپێکی پێکهاتوو لە دوو ئەندام ڕاڤە بکەین،

---

٢. ڕەنگە یەکێ لە هۆکارەکانی دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە، ئەم ڕاستیەیە کە ئەو جەماوەری کە دەبێ وتەبێژانی فاشیست بەر لە بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات- لەگەڵیان بەرەو ڕوو بن، جەماوەری ڕێکخراو نەبوون، بەڵکوو چەند گرووپێک بوون کە بە ڕێکەوت لە شارە گەورەکاندا کۆدەبوونەوە.

دەمێنێتەوە پێناسەکردنی دیاردەی ئیلهام- بڕوایەک کە بەپێی تێگەیشتن و بیرکردنەوە پێکنەهاتووە، بەڵکوو بەپێی پێوەندییەکی ئێرۆتیک پێکهاتووە.
لە ڕاستیدا ئەم پرسە سروشت و ناوەرۆکی پڕوپاگەندەی فاشیستی پێناسە دەکات. سروشتی سایکۆلۆژیکی ئەم پرسە، بەرهەمی ئامانجی دەسەڵاتخوازانە و نائەقڵانییە، ئەمانجێک کە گەیشتن بەو لە ڕێگەی بیر و باوەڕی ئەقڵانییەوە ئیمکانی نییە، بەڵکوو تەنیا بە یارمەتی بێدارکردنەوەی پسپۆڕانەی "بەشێک لە میراتی کۆنی سوژە" هەموار دەبێت. پڕوپاگەندە و هەڵخڕادنی فاشیستی لە سەر بیری پێشەوا چەقدەبەستێ، ئیدی جیاوازی نییە کە ئەو بەڕاستی گرووپ ڕێبەری دەکات، یان بەرژەوەندییەکانی تاڵان دەکات، چونکە تەنیا وێنەی دەروونناسانەی پێشەوا دەتوانێ بیری باوکی سەرەتایی زاڵ و بەتوانا سەرلەنوێ زیندوو بکاتەوە. ئەم شتە دواین ڕیشەی خەسڵەتی ڕەمزی پرسۆناژیزم لە پڕوپاگەندەی فاشیستی دایە کە بەشێوەی بەردەوام، لەجیاتی باسکردنی هۆکارە ڕاستەقینەکان، بارانێک لە ناو ناوبانگی پیاوانی گەورە بەسەر بەردەنگ دا دەبارێنن. دروست بوونی وێنەیەکی تەواو توانا و سنووربەزێن لە ڕوخساری باوک (father figure)، کە تا ڕادەیەکی زۆر باوکی واقعی و ئیزۆلە بەجێ دێڵی و بەمجۆرە دەرفەتی شیاوی جۆرێک "خۆدگرووپی" پێکدێنێ، تاقە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی "دیدی پەسیڤی - مازوخیستی"ـە کە "ئیرادەی مرۆڤ دەبێ تەسلیمی بێت". هەرچەندە ڕەفتاری سیاسی تاکی ئاسایی لایەنگری فاشیزم، لەگەڵ بەرژەوەندی ئەقڵانی خۆی، وەک کەسێکی هەقیقی و هەروەها لەگەڵ گرووپەکەی ناکۆکتر بێت، وەها دیدگایەک لە پێش چاوی گرنگتر


هیتلەر

دەردەکەوێ[3]. کەوابوو، دژ بە ئەقڵبوونی تاکی پێڕەو کە سەرلەنوێ لەودا بێدار بۆتەوە لە دیدی پێشەواوە پرسێکی تەواو ئەقڵانییە: ئەم دژایەتییەی ئەقڵ بەشێوەی حەتمی دەبێ دۆگم و ئایدیۆلۆژیک بێت: «نابێ بەپێی ئەقڵ و بیرکردنەوە بێت بەڵکوو دەبێ بەپێی کۆتێکی ئێرۆتیک بێت».
ئەو میکانیزمەی کە لە نێوان ڕێبەر و پێرەوان و هەروەها لە نێوان پێرەوان دا، لبیدۆ وەک گرێیەک

٣. ئەم ڕاستییە کە مازوخیسمی تاکی فاشیست هەمیشە هاوکاتە لەگەڵ چەندین ویستی سادیستی، لەگەڵ تیۆری گشتی فرۆید لەمەڕ دوالیزم، کە یەکەم جار لەمەڕ گریمانەی ئودیپ پەرەیسەند، سازگارە.

لێدەکات، هەر هەمان میکانیزمی یەکبوونە. بەشی بەرینی کتێبەکەی فرۆید بۆ شیکردنەوەی ئەم پرسە تەرخان کراوە. لێرەدا ناتوانین جیاوازی تیۆریکی هەرە زراڤ، بەتایبەت جیاوازی نێوان یەکبوون و دەروونهاوێژی (introjection) باس بکەین، بەڵام دەبێ بڵێین کە ئێرنێست زیمیل، کە لەمەڕ دەروونناسی فاشیزم زۆر شتی پڕبایەخی نووسیوە، پێی وایە کە چەمکی فرۆید لەمەڕ سروشتی دوولایەنەی یەکبوون، پرسێکە کە بەرهەمی قۆناغی زارەکی (oral age) ڕێکخستنی لبیدۆیە. زیمیل ئەم چەمکەی لە زۆربەی تیۆری دەرونشکارانەدا لەمەڕ دژایەتی جولەکەکان پەرەپێداوە.
ئێمە لێرەدا چەند بەڵگەیەک لەمەڕ پێوەندی یەکانگیر بوون لەگەڵ پڕوپاگەندەی فاشیستی و بیرکردنەوەی فاشیستی دێنینەوە. زۆرێک لە نووسەران و توێژەران و بەتایبەت ئێریک ئێریکسۆن ئاماژەیان بەم خاڵە کردووە کە ڕێبەری تیپیکی بەتایبەت فاشیست، بەرواڵەت خاوەن ڕوخساری باوک، لە چەشنی پاشای سەردەمانی کۆن نییە. بەڵام ناکۆکی ئەم بیرە لەگەڵ تیۆری فرۆید لەمەڕ پێشەوا وەک باوکی سەرەتایی، تەنیا شتێکی رواڵەتییە. ڕوانگەی فرۆید لەمەڕ یەکبوون دەتوانێ یارمەتیمان بدات تا ئەو ئاڵوگۆڕە کۆنکرێتە کە بەرهەمی دۆخێکی مێژوویی کۆنکرێتە، بەپێی دینامیزمی زەینی دەرک بکەین. یەکبوون بریتییە لە "یەکەمین دەرکەوتنی پێوەندییەکی عاتفی لەگەڵ کەسێکی تردا"، کە "لە مێژووی سەرەتایی گریمانەی ئودیپ دا" دەور دەبینێ. ڕەنگە ڕێک بەمجۆرە بێت کە ئەم خەسڵەتە پێش ئودیپییەی یەکبوون، جیایی نێوان وێنەی پێشەوا، وەک باوکی سەرەتایی خاوەن توانایی ڕەها و وێنەی باوکی واقعی دەردەخات. بۆوەی کە یەکبوونی مناڵ لەگەڵ باوکی وەک وەڵامێک بە گریمانەی ئودیپ تەنیا دیاردەیەکی لاوەکییە، پاشەکشەی مناڵانە دەتوانێ ئەم دیمەنەی باوک تێپەڕێنێ و بەهۆی پرۆسەیەکی "ئانکلیتیک" بە دیمەنێکی کۆنتر بگات. هەروەها، ڕەهەندی سەرەتایی و خۆشەیدای دیاردەی یەکبوون، وەک جۆرێک کرداری هەڵدڕین و قووتدان، یانی وەک گۆڕینی ئوبژەی خۆشەویست بۆ بەشێک لە خۆ، دەتوانی دەرکی ئەم ڕاستییە ئاسان بکات کە بۆچی هەندێجار وادەردەکەوێ کە دیمەنی پێشەوای مۆدێرن، وەک نموونەی گەورەکراوی کەسێتی خودی سوژە، یان وەک جۆرێ دیهاوێژی کۆیی سوژەکانە، نە دیمەنی باوکێکی واقعی کە لە درێژەی سەردەمانی دوای مناڵی سوژەدا، ڕۆڵی ئەو لە کۆمەڵگەی ئەمرۆدا کەم بۆتەوە. هەموو ئەم خاڵانە پێویستیان بە شرۆڤەکردن هەیە.
ڕۆڵی سەرەکی خۆشەیدایی لە پێوەندی لەگەڵ ئەو یەکبونانەی کە لە پێکهاتنی گرووپانی فاشیستی دا کاریگەرن، لە تیۆری فرۆید لەمەڕ ئایدیال سازی (idealization) سەلمێندراوە. "دەبینین بەجۆرێک لەگەڵ ئوبژە هەڵسوکەوت دەکرێت وەک لەگەڵ 'خودی' سەربەخۆ، لە ئاکامدا ئەو کاتە کە عاشقین ڕادەیەکی بەرچاو لە لبیدۆی خۆشەیدا بەرەو ئوبژە دەچێ. تەنانەت ئەم خاڵەش ڕۆشنە کە ئوبژە، لە زۆر شێوازی هەڵبژاردنی عشقی دا، وەک جێگری ئەم یان ئەو ئایدیالی 'خود' (ego ideal) ڕۆڵ دەگێڕێ کە ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە پێی بگەین. هۆکاری عشقی ئێمە بەو ئوبژە ئەو تایبەتمەندییە باشانەیە کە تێدەکۆشین بۆ 'خودی' خۆمان بەدەستیان بێنین و ئیستا دەمانەوێ بەشێوەی ناڕاستەوخۆ و وەک ئامێرێک بۆ دامرکانی خۆشەیداییمان بەدیبێنین." پێشەوای فاشیست تێدەکۆشی ئەم جۆرە ئایدیال سازییە لە خۆ لەنێوان پێڕەوانی دا پەرەپێبدات، ئایدیۆلۆژی پێشەواش ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێ.

هەموو ئەو خەڵکانەی کە پێشەوا لەگەڵیان پێوەندی هەیە، شەڕی بەتایبەت مۆدێرنی نێوان هۆکارێکی "خودی" ئەقڵانی، ئێجگار گەشەکردوو و پارێزەری گیان لە دابینکردنی ویستەکانی "خودی" خۆیاندا بەردەوام تووشی شکست دەبن. ئەم شەڕە دەبێتە هۆی چەندین شۆکی بەهێزی خۆشەیدا کە تەنیا لە ڕێگەی ئایدیال سازییەوە دابین و ڕازی دەکرێن، ئەویش وەک گواستنەوەی بەشێک لە لبیدۆی خۆشەیدا بۆ ئوبژە. ئەم پرسەش لێکچوونی دیمەنی پێشەوا لەگەڵ سوژەی گەشەکردوو پیشان دەدات: بە وتەیەکی تر، مرۆڤ بە گۆڕینی پێشەوا بۆ ئایدیالی خۆی، خۆی خۆش دەوێ، بەڵام لە هەمان حاڵدا لە شەڕی پەڵەکانی ناکامی و ناڕەزایەتی، کە دیمەنی گیانی ئەزموونی ئەو خەوشدار دەکەن، ڕزگار دەبێت. بەڵام ئەم مۆدێلەی یەکبوون بەهۆی ئایدیال سازی - یانی کاریکاتۆری هاوپشتی ڕاستەقینە و وشیارانە - مۆدێلێکی کوێییە. ئەم مۆدێلە ئاپۆڕەیەکی بەرینی خەڵک کە خاوەن خەسڵەتی کەسێتیناسانە و خواستی لبیدۆیی هاوشێوەن، دەگرێتەوە. ئەم پێناسەیەی فرۆید لەمەڕ گرووپ، بە دروستی جەماوەری فاشیستی خەڵک ڕاڤە دەکات: "کۆمەڵێک لە خەڵک کە ئوبژەیەکی تاقانە لەجیاتی ئایدیالی 'خۆیان' داناوە و بەمجۆرە هەموویان لە 'خودی' خۆیاندا یەکیان گرتووە." دیمەنی پێشەواش دەسەڵاتی ڕەهای باوکی سەرەتایی خۆی هەر لەم هێزە کوێییە وەردەگرێت.

شیکاری دەروونناسانەی فرۆید لەمەڕ وێنەسازی پێشەوا، لێکچوونی زۆری ئەم پێشەوا لەگەڵ نموونەی تیپیکی پێشەوای فاشیست دەردەخات. وێنەکانی فرۆید ئەوندە لەگەڵ وێنەی هیتلەر لێکدەچن وەک بڵێی ئایدیال سازی خەڵک فریودەرانی ئەمریکین بۆ دروستکردنی ستایلی شانۆیی خۆیان. پێشەوای فاشیست بۆ ئەوەی یەکبوونی خۆشەیدا فەراهەم بکات، دەبی خۆی بەتەواوی شەیدای خۆی بێت، بەپێی ئەم ڕاستییەیە کە فرۆید دیمەنی "باوکی سەرەتایی مێگەل" وەردەگرێ، دیمەنێک کە بە شیاوی دەتوانێ دیمەنی هیتلەر بێت.

ئەو، لە سەرەتای مێژووی ڕەگەزی مرۆڤ دا، هەمان سوپێرمەن[4] ێک بوو کە نێچە چاوەڕێ بوو تەنیا لە ئایندەدا سەرهەڵبدات. تەنانەت ئەمڕۆش ئەندامانی گرووپێک پێویستیان بەم وەهمە هەیە کە پێشەوا هەموویانی بەشێوەی یەکسان و بەرابەر خۆش بوێت. بەڵام خودی پێشەوا پێویستی بەوە نییە تا کەسی خۆش بوێ، ئەو دەتوانێ سروشتێکی ئاغایانە و تەواو خۆویستانەی هەبێت، بەڵام دەبێ سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆ بوون بێت. ئێمە دەزانین کە عشق، خۆشەیدایی ڕکێف دەکات، دەکرێ پیشان بدەین کە چۆن عشق، بە ڕۆڵی بەم چەشنەی، وەک هۆکارێکی (پێکهێنەری) شارستانیەت دەرکەوت.

بەمجۆرە یەکێ لە بەرچاوترین خەسڵەتەکانی پەیڤی پەیڤبێژانی فاشیست، یانی نەبوونی هەر جۆرە بەرنامەیەکی پۆزەتیڤ و، هەروەها زۆر بوونی توخمی ناکۆکی و هەڕەشە و قەدەغە، ڕاڤە دەکرێت. پێشەوای فاشیست تەنیا کاتێک دەتوانێ بابەتی عشق و خۆشەویستی بێت کە خۆی عاشقی هیچ شتێک نەبێت. سەرەڕای ئەمەش، فرۆید دەیزانی کە دیمەنی پێشەوا ڕەهەندێکی دیکەی هەیە کە بەڕواڵەت ڕەهەندی یەکەم ڕەت دەکاتەوە. پێشەوا لە کاتێکدا کە وەک سوپێرمەن دەردەکەوێ، دەبێ لە هەمان کاتدا ئەو موعجزەیە بخولقێنێ کە وەک

---

٤. ڕەنگە پێداگرتن لەسەر ئەم خاڵە بەسوود بێت کە چەمکی سوپێرمەنی نیچە ئەوندە لەم دیمەنە کۆنە دوورە وەک مەودای خەونەکانی ئەو لەمەڕ ئایندە و فاشیزم وایە. ئاماژەی فرۆید تەنیا چەمکی گشتی "سوپێرمەن" لە درووشمە رواڵەتیەکاندا دەگرێتەوە

کەسێکی ئاسایی دەرکەوێت، ڕێک بەوجۆرە کە هیتلەر هاوکات خۆی وەک کینگ کونگ و دەلاکی شەقام دەردەخست. فرۆید ئەم خاڵەش بەپێی تیۆری خۆشەیدایی راڤە دەکات. ئەو دەنووسێ:
تاک ئایدیالی «خۆدی» خۆی پشتگوێ دەخا و لەجیاتی ئەو ئایدیالی گرووپ کە لە پێشەوادا خۆدەنوێنێ، جێگیر دەکا. (سەرەڕای ئەمەش)، لە زۆرێک لە تاکەکان دا جیایی نێوان «خود» و ئایدیالی «خود» زۆر گەشەی نەکردووە: ئەم دوانە هێشتا بە ئاسانی لێک جووت دەبن. «خود» زۆر جار حاڵەتی لەخۆبایی قۆناغەکانی پێشووی پاراستووە. ئەم دۆخە هەڵبژاردنی پێشەوا ئێجگار ئاسان دەکات. ئەو تەنیا پێویستی بەوە هەیە کە بەشێوەی تەواو ڕۆشن، دیار و پەتی، خاوەن خەسڵەتی تیپیکی ئەندامانی بێت، تەنیا دەبێ ئەم هەستە بە ئیلهام بۆ پێڕەوانی بنێرێ کە خاوەن وزەی زیاتر و ئازادی زۆرتری لبیدۆیە. لەم حاڵەتەدا پێویستی (گرووپ) بە سەرۆکێکی بەهێز نیوەی کارەکان بۆ ئەو ئەنجام دەدا و وەها هێز و دەسەڵاتێکی پێدەبەخشێ کە بە هیچ شێوەیەکی تر نەیدەتوانی بانگەشەی بکات. ئەندامانی دیکەی گرووپیش کە ئایدیالی «خودی» ئەوان قەت نەیدەتوانی، بە بێ هەندێ ئاڵوگۆڕ، لەودا بەرجەستە ببێت، هاوکات بە هۆی (دیاردەی) «ئیلهام»، یانی لە ڕێگەی یەکبوونەوە، لەگەڵ پاشماوەی گرووپ یەک دەگرن.
بەمجۆرە دەبینین کە تیۆری فرۆید پێشتر ئاماژە بە نیشانەکانی راچڵەکێنەری سوکایەتی پێشەوای فاشیست دەکات، ئاماژە بە لێکچوونی ئەو لەگەڵ ئەکتەرەکانی بازاڕی و دەروونپشێوانی دابڕاو دەکات. بۆ دابینکردنی ئەو بەشانەی خۆپەرستی تاکی پێڕەو کە بۆ ناخی دیمەنی پێشەوا نەهاوێژراون بەڵکوو هەروا بە «خودی» ئەوەوە بەستراون، سوپێرمەن هێشتا دەبێ هاوشێوەی تاکی پێڕەو بێت و وەک نموونەی «مەزنکراوی» ئەو بنوێنێ. بەمپێیە، یەکێ لە میکانیزمە بنەماییەکانی پڕوپاگەندەی فاشیستی پرسۆناژیست، چەمکی «سوپێرمەنی بچووک»ـە، کەسێک کە ناسنامەکەی هەم دەسەڵاتی ڕەهای دەناسێنێ و هەم وەک یەکێ لە خەڵک دەینوێنێ، ئەمریکایەکی سادە و ساکار و هاوشانی خەڵکی تر کە ئالوودەی سروەتی مادی یان مەعنەوی نەبووە. ئەم حاڵەتە سایکۆلۆژیکە دولایەنەیە بواری خولقانی موعجزەیەکی کۆمەڵایەتی دەرەخسێنێ. دیمەنی پێشەوا ویستی دووقاتی تاکی پێڕەو ڕازی دەکات، وەها ویستێک کە هەم مل بۆ سەرچاوەی دەسەڵات کەچ بکات و هەم خۆی هەمان سەرچاوە بێت. ئەم کارە تەواو لەگەڵ جیهانێک دا دێتەوە کە لەودا کونترۆڵی نائەقڵانی بەردەوام بەڕوەدەبرێ، هەرچەند کە ڕۆشنگەری جیهانداگر کاکڵی ئایدیۆلۆژیکی ئەوی لەنێو بردووە. ئەو خەڵکانە کە لە دیکتاتۆران پێڕەوی دەکەن لە هەمان کات دا بەچەشنێک لە ناکارامەیی ئەوان ئاگادارن. خەڵک ئەم ناکۆکییە بەهۆی ئەم بیرە چارەسەر دەکەن کە خۆیان هەمان دەسەڵاتداران و زاڵمان بێ ڕەحمن.
هەموو فێڵەکانی لایەنگران و ئاژاوەگێڕانی فاشیست لە قاڵبی شرۆڤەکەی فرۆید دا جێدەگرن، شرۆڤەیەک لەمەڕ ئەو شتەی دواتر وەک پێکهاتەی بنەمای خەڵک فریودانی فاشیستی دەرکەوت: تێکنیکی پرسۆناژیزم و ئایدیای سوپێرمەنی بچووک. ئێمە لێرەدا تەنیا چەند نموونەیەک کە بە ڕێکەوت هەڵبژێردراون راڤە دەکەین.
فرۆید توخمی پێگەیی (hierarchical) لە گرووپانی نائەقڵانی دا بەشێوەی هەمەلایەنە شرۆڤە دەکات: "زۆر ئاساییە کە سەربازێک سەرۆکەکەی، یانی فەرماندەی تیپەکەی، بە سەرمەشقی خۆی

دەزانێ و لە هەمان کات دا خۆی لەگەڵ هاوشانەکانی بە یەکسان دەبینێ، لەم جۆاتەی "خودەکانی" خۆی سەرئەنجام بە هاوکاری، هاوپشتی و هاوبەشی لە ئامێر و پێداویستییەکان دا و، هاوڕێی و هاوسۆزی دەگات. بەڵام ئەگەر تێکۆشی خۆی بە هاوشانی ژەنەراڵ بزانێ، دەبێتە گاڵتەجاڕی هەموان." ئەڵبەت مەبەستمان تێکۆشانی وشیارانە و ڕاستەوخۆیە (ئەگینا لە خەون و خەیاڵ دا خۆی بە ژەنەراڵ دەزانێ، و. ک). فاشیستەکان تەنانەت تا نزمترین ئاستەکان بۆ فریودانی خەڵک تێدەکۆشن و هەردەم لەسەر داب و نەریتی ئایینی و جیاوازی پلە و پێگە پێدادەگرن. هەرچەندە ڕادەی پلە و پێگەکان لە ڕێکخستنی جۆاتێکی سەنعەتی تەواو ئەقڵانی و ڕێژەیی دا کەمتر بێت، فاشیستەکان تەنیا بەهۆی دەروونی - جیاوازی، لەخۆڕا زۆر پلە و پێگەی دەسکرد بەرپا دەکەن و بە وردی بەسەر کۆمەڵ دا دەیسەپێنن. بەڵام دەبێ ئەم خاڵەش زیاد بکەین کە ئەم شتە تاقە سەرچاوەی شەهوانی ئەم شێوەکارە نییە. بە وتەیەکی تر، پێکهاتەکانی هیرارشیکاڵ بەتەواوی لەگەڵ ویستەکانی کەسێتی سادومازوخیستی سازگارن. فورمولی بەناوبانگی هیتلەر (ملکەچی لەئاست باڵادەست، دەسەڵات لەئاست بندەست) سروشتی دولایەنەی ئەم کەسێتییە بەشێوەی ئەقڵانیکراو دەردەخات[٥].

خواستی پێشێلکردنی بندەستان، کە لە ئەشکەنجە و سەرکوتی کەمینەی لاواز و داماودا بەشێوەی پڕکارەسات دەردەکەوێ، وەک ڕق و نەفرەت لەئاست بیانیان. ئەم دوو خەستە لە کردەوەدا بەردەوام تێکەڵاو دەبن. تیۆری فرۆید، جیاوازی ورد و گشتگیری نێوان دەروون گرووپی خۆشەویست و دەرەوەی گرووپی بێزراو بەڕۆشنی دەردەخات. ئەم شێوە ڕەفتار و بیرکردنەوە لە سەرتاسەری کولتووری ئێمەدا ئەوەندە بە شتێکی ئاسایی زانراوە کە ئەم پرسە بەدەگمەن بە شێوەی جدی دێتەئاراوە کە بۆچی خەڵک ئەو شتەی لە خۆیان دەچێ خۆشیان دەوێ و لەو شتەی لە خۆیان ناچێ بێزارن. لە بابەتەشدا وەک زۆر بابەتی دیکە ڕوانگەی فرۆید بۆ لێکدانەوەی ئەو شتانەی بەشێوەی گشتگیر لەلایەن خەڵکەوە قەبووڵکراون، کارامەیە. لوبون ئاماژەی بەم خاڵە کردبوو کە گرووپی نائەقڵانی «ڕاستەوخۆ بەرەو جەمسەری کۆتایی و بنەڕەتی دەڕۆن». فرۆید ئەم بۆچونە پەرە پێدەدات و ئاماژە بەم خاڵە دەکات کە دوالیزمی نێوان دەروون و دەرەوەی گرووپ بەشێوە زاتی ئەوەندە بە قووڵی ڕەگیان داکوتاوە کە تەنانەت کار دەکەنە سەر ئەو گرووپانەش کە بە «بیر و ئەندێشە« دژایەتی ئەم کارانە دەکەن. بەمجۆرە فرۆید ساڵی ١٩٢١ توانی ئەم وەهمە لیبراڵییە تێپەڕێنێ کە گوایا گەشەی شارستانیەت دەتوانێ بەشێوەی ئوتۆماتیک گەشە بە تۆلێرانس بدات و توندوتیژی لە ئاست دەرەوەی گرووپ کەم بکاتەوە.

تەنانەت لە حکومەتی مەسیحیش دا ئەو کەسانەی کە بەدەر لە کۆمەڵی ئیماندارانن، ئەو کەسانەی کە عاشقی مەسیح نین و لە عشقی ئەو بێوەرن، لە دەرەوەی ئەم پێوەندییە دان. کەوابوو، دینێک، تەنانەت ئەگەر خۆی بە دینی عشق بزانێت، دەبێ لەئاست بیانیان دڵڕەق و بێ ڕەحم بێت. لە ڕاستیدا هەر دینێک بۆ پێڕەوانی خۆی دینی عشقە، بەڵام بۆ

٥. لە فەرهەنگی فولکلۆری ئاڵمانی دا، بۆ ئەم تایبەتمەندییە هێمایەکی ڕۆشن هەیە. ئەم هێمایە باسی «تایبەتمەندییەکانی بایسیکڵ سواران» دەکات: لە کەمەر بەرەو ژوور کڕنۆش دەبەن، لە کەمەر بەرەو خوار لەقە دەوەشێنن.»

کەسانی جیاواز بە توندوتیژی دەجولێتەوە، ئەمەش سروشتی هەموو دینەکانە. هەرچەندەش قەبووڵی ئەم پرسە بۆ ئێمە دژوار بێت، نابێ بەمبۆنەوە بەتوندی ئیمانداران سەرزەنشت بکەین — خەڵکانێک کە بە خەمساردانە یان بە بێ بڕوایانە لە ڕووی دەروونییەوە دۆخێکی زۆر باشتریان هەیە. ئەگەر ئەمڕۆ دژایەتی خەڵکانی بیرجیاواز وەک سەدەکانی پێشوو بەشێوەی توندوتیژ و بێ ڕەحم دەرناکەوێت، بە ئەستەم دەتوانین بێژین کە ڕەفتار و ئاکاری مرۆڤ نەرم و نیانتر بووە. هۆکاری ئەم پرسە زیاتر لە لاوازبوونی هەست و سۆزی دینی و پێوەندی لبیدۆیی پاڵپشتی ئەو دایە. ئەگەر پێوەندێکی گرووپی دیکە لەجیاتی پێوەندی دینی جێگیر ببێت —وادیارە لەم بابەتەوە پێوەندی سۆسیالیستی شانسی سەرکەوتنی زیاترە — ئەو جار هەمان دژایەتی و توندوتیژی لەئاست بیانیان دەبینین کە لە سەردەمی جەنگەکانی ئایینی دا هەبوو.

هەڵەی فرۆید لە لێکدانەوەی سیاسی دا، یانی تاوانبارکردنی «سۆسیالیستەکان» بەهۆی کارێک کە دوژمنانی ئاڵمانییان کردیان، ئەوندە بەرچاوە وەک پیشبێژی ئەو لەمەڕ سروشتی روخێنەری فاشیزم و غەریزەی لەنێوبردنی کەسانی دەرەوەی گرووپ وایە. لە راستیدا، نەمانی کاریگەری دین رێک وەک خاڵی بەرانبەری شتێکی لێهاتووە کە فرۆیدی رۆشنبین چاوەڕوانی دەکرد: جیایی نێوان بڕواداران و بێ بڕوایان پارێزراوە و رفید (reified) بووە. دین وەک پێکهاتەیەکی زاتی و سەربەخۆ لە هەر چەشنە ناوەرۆکی فکری (ideational) دەرکەوتووە و لەو کاتەوە کە ئیمانی دەروونی لەنێوچوو تەنانەت زیاتر داکۆکی لێدەکرێ. هەر لەم سەردەمەدا، کاریگەری قەرەبووکەرەوەی بیری دینی عشقیش لەنێو چوو. ئەم پرسە بنەما و گەوهەری فێڵی "مەڕ و بزن"ـە کە لە لایەن هەموو فریوکارانی فاشیستەوە بەکاردەبرێ. بۆوەی ئەوان هیچ جۆرە پێوەرێکی مەعنەوی بۆ هەڵبژاردن یان دەرکردنی تاکەکان ڕەچاو ناکەن، بۆیە جۆرێک پێوەری شێوە تەبیعی وەک نەژاد[٦] جێگیر دەکەن کە جەبرییە و لەئەنجامدا دەتوانێ وەک چەمکی لە دین وەرگەڕانی چاخی نێوەڕاست تەنانەت بێ ڕەحمانەتر بەڕێوە ببرێ. فرۆید لە ڕوونکردنەوەی رۆڵی شەهوانی ئەم فێڵەدا سەرکەوتوو بووە. ئەم فێڵە وەک جۆرێک وزەی نگەتیڤی جۆشدەر ڕۆڵ دەگێڕێ. بۆوەی کە لبیدۆی پۆزەتیڤ بەتەواوی بۆ دیمەنی باوکی سەرەتایی، یان پێشەوا دا، تەرخان دەکرێ و، بۆوەی تەنیا چەند ناوەرۆکێکی پۆزەتیڤی دەگمەن لەبەر دەست دان، دەبێ ناوەرۆکێکی نگەتیڤ بدۆزینەوە. «پێشەوا یان بیری پێشەوایی هاوکات دەتوانێ، بەجۆرێک، پرسێکی نگەتیڤ بێت، نەفرەت لە کەس یان سیستمێکی تایبەت ڕێک دەتوانێ بەشێوی جۆشدەر ڕۆڵ ببینێ و وەک هاودڵی پۆزەتیڤ، پێوەندی عاتفی لەم جۆرە ببزوێنێ.» گومانی تێدا نییە کە ئەم تێکەڵکردن یان یەکێتییە نگەتیڤە لە هەمان غەریزەی ڕوخێنەر سەرچاوە دەگرێ کە فرۆید لە دەروونناسی گرووپ دا بە ڕۆشنی ئاماژەی پێناکات، هەرچەند لە کتێبی شارستانیەت و ناڕەزایەتییەکانی دا ڕۆڵی دیاریکەری ئەم غەریزەیە ڕوون کردۆتەوە. دەربارەی ئەم بابەتە،

٦. دەکرێ ئاماژە بەم خاڵە بکەین کە ئایدیۆلۆژی نەژاد بەڕۆشنی بیری برایەتی سەرەتایی دەگێڕێتەوە، ئەویش لە ڕێگەی گەڕانەوەی تایبەتی نهێنی لە پێکهاتنی جەماوەردا. چەمکی نەژاد لەگەڵ برایەتی دوو تایبەتمەندی هاوبەشی هەیە: یەکەم نەژاد پرسێکی «سروشتی» و گرێدراو بە «خوێن»ـە، دووهەم ئەم پرسەش لە سێکس تەکێندراوە.

فرۆید بە گەڕانەوە بۆ خۆپەرستی دژایەتی لەئاست کەسانی دەرەوەی گرووپ دا ڕاڤە دەکات:
لە ناخی ڕق و بێزاری خەڵک لەئاست ئەو بیانیانە کە بەناچار لەگەڵیان لە پێوەندی دان، دەکرێ جیلوەی عشق بە خۆ یان خۆپەرستی دیاری بکەین. ئەم خۆپەرستییە بوونی تاک دەسەلمێنێ و بەجۆرێک ڕۆڵ دەگێڕێ کە هەر جۆرە لادانێک لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی تایبەتی ئەم تاکەدا پێویستی بە نرخاندن و خواستی گۆڕینی لادانەکانە.
زۆر ڕۆشنە کە پڕوپاگەندەی فاشیستی دەبێتەهۆی دەرکەوتن و دامرکاندنی هەست و سۆزی خۆشەیدایی. ئەم پڕوپاگەندە بەشێوەی بەردەوام و هەندێ جار بەشێوەی زۆر سەیر ئەم هەستە ئیلهام دەکات کە تاکی پێڕەو، تەنیا بەهۆی ئەندام بوونی لەنێو گرووپ، باشتر و پاکتر و سەرتر لەو کەسانەیە کە لە گرووپ دەرکراون. لەم کاتەدا، هەرجۆرە نرخاندن و وشیاربوونەوەیەک، وەک جۆرێک خەسار بۆ خۆشەیدایی دەزانرێ و قەدەغە دەکرێ و هەبوونی ڕق و توورەیی دەبزوێنێ. ئەم پرسە هۆکاری دژکردەوەی هەموو فاشیستەکان لە ئاست ئەو شتە کە بە (zersetzend) ناودەبرێ ڕۆشن دەکاتەوە، یانی هەموو ئەو شتانە کە بەها دوگمەکانی ئەوان خەوشدار دەکاو هەروەها دژایەتی کەسانی دوگم لە ئاست هەر چەشنە دەروونبینی ڕاڤە دەکات. چەقبەستنی دوژمنی بۆ کەسانی دەرەوەی گرووپ، هاوکات دەبێتە هۆی سازگاری و تەبایی لە نێو گرووپ دا، گرووپێک کە بەدەر لەم حاڵەتە پێوەندی تاک لەگەڵ ئەو ئاڵۆز و دژوار دەبوو.
بەڵام تێکڕای ئەم ناکۆکی و توندوتیژییە بەهۆی پێکهاتنی گرووپێک و، لە گرووپێک دا، بەشێوەی کاتی یان هەمیشەیی، لەنێودەچێ. تا کاتێ کە گرووپ لە ئارا دایە و لە حاڵەتی گەشە دایە، تاکەکان بەجۆرێک هەڵسوکەوت دەکەن کە گۆیا هەموو یەکسان و بەرابەرن. ئەوان لەگەڵ خەسڵەتەکانی یەکتر ڕادێن و هەموو پێکەوە هاوپلە و هاوئاست دەبن و، لەئاست یەکتر قەت هەست بە بێزاری ناکەن. بەپێی دیدگای تیۆریکی ئێمە، وەها ئاستەنگێ بۆ خۆشەیدایی تەنیا دەتوانێ بەرهەمی هۆکارێک بێت، پێوەندیکی شەهوانی لەگەڵ خەڵکانی دی.
ئەمە هەر ئەو ڕەوتەیە کە وتەبێژانی فاشیزم بە یارمەتی "فێڵی یەکبوون" خۆیان مەبەستیانە. ئەوان لەسەر جیاوازی خۆیان لەئاست کەسانی بێگانە پێدادەگرن بەڵام جیاوازییەکانی نێو گرووپی خۆیان دەشارنەوە و دەیانەوێ بێجگە لە جیاوازی پێگەیی، جیاوازییەکانی دیکە لە گرووپی خۆیاندا داپۆشن. "ئێمە هەموومان لە بەلەمێک دانیشتوین"، نابێ دۆخی هیچ کەسمان لە وانیتر باشتر بێت. بەمهۆیە، هەمیشە کەسانی ڕۆشنبیر، بەتەمەن و لەزەتخواز دەکەونە بەر هێرشەوە. ڕەوتی نیوە نهێنی یەکسانیخوازی زۆڵانە و برایەتی گشتی لە پەستی دا، یەکێ لە فاکتەرەکانی فاشیزم و پڕوپاگەندەی فاشیستی پێکدێنێ. دەستووری بەناوبانگی هیتلەر Eintopfgericht (یەکرەنگ کردن) هێمای ئەم پرسە بوو. هەرچەند ویستی ئەوان بۆ گۆڕینی پێکهاتەی دەروونی کۆمەڵگە کەمتر بێت، زیاتر دەربارەی یەکسانی کۆمەڵایەتی کاوێژ دەکەن و، ئەڵبەت مەبەستیان ئەوەیە کە نابێ هیچ کەسێک لە ئەندامانی "جڤاتی نەتەوە" بۆ لەزەتی تاکی بگەڕێ. یەکسانیخوازی سەرکوتکار، لەجیاتی ئەوەی بە نەهێشتنی سەرکوت یەکسانی ڕاستەقینە دەستەبەر بکات، بەشێکی زاتی بیرکردنەوەی فاشیستییە و لە فێڵی وتەبێژانی فاشیزم دا ڕەنگ دەداتەوە، فێڵی "ئەگەر تەنیا بتزانیبا" کە مزگێنی ئەوە دەدات هەموو ئەو لەزەتانەی کە خەڵکی تر ئەزموونیان

کردووە بەشێوەی رقئەستورانە ئاشکرا بکات. فرۆید ئەم دیاردەیە بەپێی گۆڕینی تاکەکان بۆ ئەندامانی کۆمەڵایەتی سایکۆلۆژیکی "برایانی مێگەل" ڕاڤە دەکات. یەکێتی و تۆکمەیی ئەوان جۆرێک دژکردەوەی پێچەوانە (reaction formation) لەئاست بەخیلی سەرەتایی خۆیان بە یەکترە کە بەناچار لە خزمەت یەکێتی گرووپ دا جێگیر بووە.

ئەو شتەی کە دواتر لە کۆمەڵگەدا لە شکڵی esprit de corps، "ورەی کۆیی" و ئەو شتانەدا دەردەکەوێ، ئەم ڕاستییە ناشارێتەوە کە سەرچاوەی ئەم شتە سەرەتا هەستی بەخیلی بووە. هیچ کەسێک نابێ خوازیاری ئیمتیاز بێت، دەبێ هەموان لە هەموو شتێک دا بەرابەر بن. مانای یەکسانی کۆمەڵایەتی یانی ئەوە کە ئێمە زۆر شت لە خۆمان حەرام دەکەین تا خەڵکی دیکەش چاوپۆشی لێبکەن، یان بە وتەیەکی تر، نەتوانن داوای ئەو شتانە بکەن.

دەکرێ ئەم خاڵەش زیاد بکەین کە هەستی دوالیستی لەئاست برا بەشێوەی بەرجەستە و بەردەوام لە تاکتیکی وتەبێژانی فاشیزم دا دەرکەوتووە. فرۆید و رانک (rank) ئاماژەیان بەم پرسە کردووە کە لە چیرۆکی پەرییان دا، بوونەوەرانێکی بچووکی وەک مێروولە و هەنگەکان "هاوتای برایان لە مێگەلی سەرەتایی دان، ڕاست بەوجۆرە کە لە هێماسازی خەونەکان دا، مێشوولەکان هێمای خوشک و براکانن (کە بەشێوەی پڕ لە سوکایەتی، بە منداڵ دەژمێردرێن)." بۆوەی کە ئەندامانی نێوخۆی گرووپ بە فەرز "توانیویانە بە یارمەتی عشقێکی هاوشێوەی شتێکی تاقانە، لەگەڵ یەکتر یەک بگرن"، بەم هۆیە ناتوانن ئەم هەستی سوکایەتییە لەئاست یەکتر بەکاربێنن. لە ئەنجام دا ئەم هەستە لە ڕێگەی کتکسیسی (cathexis) تەواو نگەتیڤی ئەم بوونەوەرە پەستانەوە بەیان دەکرێت، لەگەڵ نەفرەت لەئاست کەسانی دەرەوەی گرووپ تێکەڵ دەبێت و بەرەو ئەم کەسانە دەهاوێژرێت. لە ڕاستیدا یەکێ لەو فێڵانەی کە وتەبێژانی فاشیست زۆر خۆشیان دەوێ – کە لیۆ لۆڤنتال بەدرێژی شرۆڤەی کردووە – ئەوەیە کە کەسانی دەرەوەی گرووپ، هەموو بیانین و، بەتایبەت پەنابەران و جولەکەکان، لەگەڵ مێشوولە و بوونەوەرانی پەست بەراورد دەکەن.

ئەگەر لەنێوان بزوێنەرانی پرۆپاگەندەی فاشیستی و ئەو مکانیزمانەی کە فرۆید لە دەروونناسی گرووپ دا شرۆڤەی کردووە هاوسەنگییەک ببینین، دەبێ ئەم پرسیارە لە خۆمان بپرسین: وتەبێژانی فاشیست، کە کەسانێکی خاوتەبع بوون و پلەی خوێندەوارییان کەم بوو، چۆن توانیان ئەم مکانیزمانە بناسن؟ ئاماژە کردن بە کاریگەری خەباتی من بەرهەمی هیتلەر لەسەر خەڵک فریودەرانی ئەمریکی ئەم پرسە ڕۆشن ناکاتەوە، چونکە ئیمکانی نییە کە تێگەیشتنی تیۆریکی هیتلەر لەمەڕ دەروونناسی گرووپ لە نزمترین ئاستی تۆژینەوەکانی لوبۆن لەمەڕ ڕوایەتی عامیانە بەرزتر بووبێت. ناشکرێ ئەم فەرزە قەبووڵ بکەین کە گوبلێز لە پرۆپاگەندەدا بیرمەندێکی شارەزا بوو و پێشەکەوتووترین دەسکەوتەکانی دەروونناسی وردبینی مۆدێرنی دەناسی. ئەگەر سەرنجێکی وتەکان و بژاردەیەک لە بیرەوەرییەکانی کە تازە چاپکراوە بدەین، دیمەنی کەسێک دەبینین کە بۆ بەشداری لە سیاسەت — دەسەڵات دا بە ڕادەی پێویست زیرەکە، بەڵام لە پرسەکانی کۆمەڵایەتی یان سایکۆلۆژیک کەسێکی ساویلکەیە. ئەم بیرە کە گوبلێز کەسێکی بیرمەندێکی قووڵ و ڕادیکاڵ بووە، بەشێک لە ئەفسانەیەکی درۆیین بووە کە ڕۆژنامەنووسانی چنۆک هەڵیانبەستووە. ئەفسانەیەک کە لە خۆیدا بەرەو شرۆڤەی

دەروونشیکارانە دەمانبات. گوبلێز خۆی کلیشەیی بیردەکاتەوە و بەتەواوی لەژێر کاریگەری پرسۆناژیزم دایە. کەوابوو بۆ ڕاڤەکردنی دەسەڵاتی فاشیستەکان بەسەر تێکنیکی ڕەوانی مێشک گۆڕینی جەماوەردا، کە زۆر باسی لێکراوە، دەبێ بۆ چەندین سەرچاوە بگەڕین کە جیاوازن لە شارەزایی زانستی. وادەنوێنێ یەکەم سەرچاوە هەر هەمان یەکێتی بنەڕەتی پێشەوا و پێڕەو بێت کە یەکێ لە ڕەهەندەکانی دیاردەی یەکبوون ڕاڤە دەکات. پێشەوای فاشیست دەتوانێ خواست و پێویستییە دەروونییەکانی ئەو کەسانەی کە پڕوپاگەندەی ئەویان بۆ گرنگە مەزندە بکات، چونکە خۆی لەڕووی دەروونناسانەوە لەوان دەچێت، جیاوازی لەگەڵ پێڕەوان ئەوەیە کە دەتوانێ پرسە شاراوەکانی دەروونی ئەوان بە ئاشکرا باس بکات، نە هیچ ئیمتیازێکی زاتی. ئەم ڕێبەرانە بەگشتی پێوەندییان بە جۆری کەسێتی ئۆرالییەوە هەیە، هاوکات لەگەڵ جۆرێک زەختی غەریزی بە پەیڤینی بەردەوام و فریودانی خەڵکی تر. ئەوان زیاتر بەشێوەی زارەکی پێڕەوانی خۆیان تەلیسم دەکەن: خودی دیاردەی زمان، بێوەر لە هەر جۆرە هێمایەکی ئەقڵانی، بەشێوەی ئەفسوونی دەور دەبینێ و دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرەودواچوونی ڕادیکاڵ کە تاکەکان بۆ ئاستی ئەندامانی گرووپێک نزم دەکاتەوە. بۆوەی کە زاتی ئەم خەسڵەتە، یانی خەسڵەتی کەلامی ڕەها بەڵام پشتبەستوو بە تەداعی، لانیکەم پێویستی بە جۆرێک بێ کونترۆڵی بەسەر "خود/ego"دا هەیە، بە ڕۆشنی دەتوانین ئەم شتە بە نیشانەی لاوازی بزانین نە دەسەڵات. لە ڕاستیدا پڕوپاگەندەی وتەبێژانی فاشیست لەمەڕ هێزی خۆیان، زۆر جار بەشێوەی ڕەمزی ئاماژە بە وەها لاوازییەک دەکات، بەتایبەت کاتی گەدایی بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی ماڵی. ئەڵبەت گومانی



تێدا نییە کە ئەم ئاماژانە بەشێوەی پسپۆڕانە لەگەڵ ئایدیای دەسەڵات تێکەڵ دەکرێن. وتەبێژی فاشیست، بۆوەی کە خواست و ویستی ناوشیاری بەردەنگی خۆی بەشێوەی سەرکەوتوانە فەراهەم بکات، بە وتەیەک، تەنیا نەستی خۆی ئاشکرا دەکات. سێندرۆمی (syndrome) کەسێتی تایبەتی ئەو ڕێگەی پێدەدات تا ڕاست وەها کارێک بکات، هەروەها ئەزموونەکان فێریان کردووە تا بەشێوەی وشیارانە لەم وزە دەروونییەی خۆی سود وەرگرێت و بەشێوەی ئەقڵانی لە ئەقڵپەرێزی و بێ ئەقڵی خۆی بەهرە ببات، ڕێک وەک ئەو ئەکتەر و ژورنالیستانە کە دەزانن بە چ شێوەیەک هەست و هەیەجانی دەروونی خۆیان بفرۆشن. کەوابوو، وتەبێژی فاشیست دەتوانێ بە بێ ناسینی تیۆری سایکۆلۆژیک بەپێی ئەم تیۆریە بدوێت و پراتیک بکات، ئەمەش بە پێی ئەم بەڵگە سادەیە کە تیۆری سایکۆلۆژیک ڕاستگۆیە. تەنیا کارێک کە ئەو دەبێ بۆ ناسینی دەروونناسی بەردەنگانی بیکات، ئەوەیە کە بەشێوەی زیرەکانە لە دەروونناسی خۆی بەهرە ببات.




سازگاری تاکتیکی وتەبێژانی فاشیست لەگەڵ بنەمای سایکۆلۆژیکی ئامانجەکانیان بەهۆی هۆکارێکی ترەوە زیاتر پەرە دەستێنێ. هەروەک دەزانین، پڕوپاگەندە و هەڵخڕاندنی فاشیستی، ئەمڕۆ وەک پیشە، یان بە وتەیەک، وەک جۆرێک خۆ بەرێوەبردن دەرکەوتووە. ئەم جۆرە پڕوپاگەندە کاتی زۆری هەبووە تا ڕۆڵی سەرنجڕاکێشی و فێڵەکانی تاقی بکاتەوە و، سەرئەنجام، بەپێی جۆرێک هەڵبژاردنی سروشتی، تەنیا گرنگترینیان ماونەتەوە. دەروونناسی بەکارهێنەران، ڕۆڵ و کاریگەری فێڵەکان دیاری دەکات. بەهۆی جۆرێک پرۆسەی «بەستوویی»، کە لە هەموو تێکنیکەکانی فەرهەنگی جەماوەری مۆدێرن

دا دەبینرێ، خاڵە سەرنجڕانیشەکان ستاندارد کراون، ڕێک وەک دروشمەکانی ڕیکلامی بازرگانی کە لە گەشەی کار و مامەڵەدا ئێجگار گرنگ و کاریگەرن. ئەم ستاندارد کردنە بە نۆرەی خۆی لەگەڵ بیرکردنەوەی کلیشەیی جووت دەبێ، یانی لەگەڵ «هەست و سۆزی کلیشەیی» (stereopathy) ئەو کەسانە کە لەئاست ئەم پڕوپاگەندە هەستیارن و ویستی منالانەیان دەیەوێ ئەم پڕوپاگەندە بەشێوەی یەکدەست و بەردەوام دوپات ببێتەوە. پێشبینی ئەم پرسە دژوارە کە ئایا ویستی سایکۆلۆژیکی سەرەوە نابێتە ئاستەنگ تا فێڵە ستانداردەکانی وتەبێژانی فاشیست بەهۆی بەکارهێنانی لەڕادەبەدەر هێور ببێتەوە. لە ئاڵمانی نازی دا هەموو خەڵک ڕاهاتبوون تا گاڵتە بە هەندێ وشەی پڕوپاگەندەیی وەک "خوێن و خاک" بکەن، کە بە شۆخی بە "خوخا" دەگوترا. نموونەیەکی دیکە چەمکی نەژادی نۆردیک (Nordic) بوو کە فرمانی هەجوی "باکوری کردن" (aufnorden) لێ وەردەگیرا. سەرەڕای ئەمەش، وادیارە ئەم شتانە هێشتا گرنگی خۆیان پاراستووە. بەڵکوو بەپێچەوانەوە، ڕەنگە بەردەنگان بەجۆرێکی سادیستی و سێنیکاڵ (cynical) زاتی "درۆینەی" ئەم شتانەیان هەست کردووە، ئەویش وەک خەسڵەتێک بۆ ئەم ڕاستییە کە لە سەردەمی ڕایخی سێهەم دا ئەوە تەنیا دەسەڵاتە کە چارەنووسی مرۆڤ دیاری دەکات، دەسەڵاتێکی ڕەها لە کۆت و بەندی ئۆبژکتیڤیتەی ئەقڵانی.

بێجگە لەو خاڵانەی سەرەوە، دەتوانین بپرسین: بۆچی دەروونناسی گرووپی پراتیکی مەبەستی ئێمە زیاتر گرووپی فاشیستی دەگرێتەوە نە زۆربەی بزاڤەکانی تر کە پاڵپشتی جەماوەری دەخوازن؟ تەنانەت بەراوردی سادەی پڕوپاگەندەی فاشیستی لەگەڵ پڕوپاگەندەی پارتە لیبراڵ و پێشکەوتنخوازەکان پیشان دەدات کە بارودۆخ بەڕاستی بەمجۆرەیە. بەڵام نە فرۆید و نە لوبۆن گرنگییان بە وەها جیاوازییەک نەدا. ئەوانیش زیاتر چەمکەکانی کۆمەڵناسی فۆرمی (formal)یان بەکاردێنا و، "بەگشتی" باسی گرووپەکانیان دەکرد، بێ هیچ جۆرە جیاوازییەک لەنێوان ئامانجی سیاسی و ئەم گرووپانەدا. لە ڕاستیدا، ئەوان هەر دوویان زیاتر بیریان لە بزاڤەکانی سۆسیالیستی کلاسیک دەکردەوە، نە هێزەکانی دژبەریان. هەرچەند دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەرتەش و کلیسا – ئەم دوو نموونە کە فرۆید بۆ سەلماندنی تیۆری خۆی هەڵیبژارد – دوو ئۆرگانی تەواو کونسێرڤاتیڤ و زنجیرە پلە و پێگەیین. لە لایەکی ترەوە، لوبۆن زیاتر گرنگی بە گرووپانی خۆڕسک و ڕێکنەخراو و بێ ڕیشە دەدات. تەنیا تیۆریەکی ڕۆشن و تایبەت بە کۆمەڵگە، کە بە تەواوی لە ڕەهەندی دەروونناسی واوەتر دەچێ، دەتوانێ بە باشی وڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. ئێمە لێردا تەنیا چەند پێشنیارێک گەڵاڵە دەکەین. یەکەم ئەوە کە ئامانجەکانی فاشیزم بە زۆری نائەقڵانین، چونکە ئەم ئامانجانە، بەپێچەوانەی گەشەی ئابووری یەکەم ساڵەکانی ڕێژیمی هیتلەر، بەرژەوەندی مادی کۆمەڵێکی بەرین لە خەڵکی پێڕەوی خۆیان پێشێل دەکرد. مەترسی بەردەوامی سەرهەڵدانی جەنگ کە لە زاتی فاشیزم دایە هێمای ڕوخاندن و وێرانی بەرفراوانە کە جەماوەر لانیکەم بەشێوەی ناوشیارانە دەیزانن. کەوابوو دەکرێ ئاماژەی فاشیزم بە هێزە نائەقڵانییەکانی بە تەواوی بە درۆ بزانین، سەرەڕای درۆینە بوونی ئەو ئەفسانەیە کە پرسی نائەقڵانی بەشێوەی ئایدیۆلۆژیک بە ئەقڵانی پیشان دەدات. بۆوەی کە فاشیزم ناتوانێ بە یارمەتی بەڵگاندنی ئەقڵانی داکۆکی جەماوەر بۆ خۆی فەراهەم بکات، پڕوپاگەندەی فاشیستی بەناچار دەبێ چاوپۆشی لە

ئەندێشەی لۆژیکی بکا و، بە هەڵگرتنی هەڵوێستی سایکۆلۆژیک، پرۆسەکانی نائەقڵانی و ناوشیار و چەپێندراو ڕێک بخات. دەرفەتی گەیشتن بەم ئامانجە بەهۆی قاڵبی زەینی هەموو ئەو توێژانەی کۆمەڵگە فەراهەم دەبێت کە بەهۆی ناکامی نائەقڵانی ئازار دەچێژن و بەمهۆیە بیرکردنەوەیان بەشێوەی نائەقڵانی و بێ گەشە پێکدێت. ڕەنگە ڕەمزی ڕاستەقینەی پڕوپاگەندەی فاشیستی لەم شتەدا بێت کە مرۆڤەکان بەوجۆرەی کە هەن دەبینێ: ڕۆڵە ڕەسەنەکانی فەرهەنگی جەماوەری و ستانداردکراوی ئەمرۆ کە لە سەربەخۆیی خۆیان بێ بەش کراون، ناتوانن ئامانجێک بۆخۆیان دیاری بکەن و دۆخی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیکی ئێستایان تێپەڕێنن. پڕوپاگەندەی فاشیستی تەنیا دەبێ بیرکردنەوەی ئێستا لەپێناو مەبەستەکان دوبارە بەرهەم بێنێتەوە – بە بێ ئاماژەکردن بە هیچ گۆڕانێک – و دووپاتکردنەوەی زۆرەملی کە بەرچاوترین خەسڵەتی ئەم جۆرە پڕوپاگەندەیە لەسەر پێویستی ئەم بەرهەمهێنانەوە بەردەوامە پێدادەگرێت. پڕوپاگەندەی فاشیستی بە تەواوی بەپێی پێکهاتەی گشتی و هەروەها یەکە یەکەی تایبەتمەندی پاژی کەسێتی دەسەڵاتخواز پێکهاتووە. کەسێتییەک کە خۆی بەرهەمی دەروونیکردنی ڕەهەندە نائەقڵانییەکانی کۆمەڵگەی مۆدێرنە. لە ژێر کاریگەری زاڵی ئەم دۆخەدا، دژبەئەقڵ بوونی پڕوپاگەندەی فاشیستی لە دووتۆیی جۆرێک دان و – ستانی غەریزی دا وەک پرسێکی ئەقڵانی دەردەکەوێ: چونکە ئەگەر ئەم دۆخە بە پرسێکی فەرزی و نەگۆڕ بزانرێت، کۆششی پێویست بۆ ناسینی شەفافی ئەو زۆر زیاترە لە هەوڵ کۆشش بۆ خۆڕێکخستن لەگەڵ ئەو و گەیشتن بە لانیکەمی ئاستێک لە ڕەزامەندی لە ڕێگەی یەکبوون لەگەڵ ئەم دۆخەدا – کە لە ڕاستیدا خاڵی بنەڕەتی پڕوپاگەندەی فاشیستییە. ئەم کارە دەتوانێ پێمان بڵێ کە بۆچی بزاڤی فاشیستی هەرە کۆنەپەرستانە لە بەراورد لەگەڵ ئەو بزاڤانەی کە بڕوای زیاتریان بە جەماوەر هەیە، "دەروونناسی جەماوەر" لە ئاستێکی زۆر بەرینتردا بەکاردێنن. سەرەڕای ئەمەش گومانی تێدا نییە کە تەنانەت پێشکەوتووترین بزاڤی سیاسیش، ئەگەر ناوەرۆکی ئەقڵانی ئەو بەهۆی وەرسوڕان بەرەو دەسەڵاتی ڕەها وێران بێت، دەتوانی بۆ ئاستی "دەروونناسی جەماوەر" و دەستکاری گرووپ دابەزێت.

دەروونناسی فاشیستی بە زۆری بەرهەمی دەستکاری و مێشک شۆری جەماوەرە. ئەو فێڵ و تێکنیکانەی کە بەپێی مەزندەی ئەقڵانی پێکهاتوون دەبنەهۆی دەرکەوتنی ئەو شتەی کە بەشێوەی ساویلکانە بە دژایەتی کردنی ئەقڵی "سروشتی" جەماوەر ناودەبرێ. ئەم ڕاستییە ڕەنگە لە چارەسەری ئەم پرسەدا یارمەتیمان بکات کە ئایا دەتوانین فاشیزم وەک دیاردەیەکی جەماوەری بەپێی دەروونناسی ڕاڤە بکەین. ئەگەرچی بەدڵنیاییەوە خواست و پۆتانسیەل بەرەو فاشیزم لە نێو جەماوەردا هەیە، کەوابوو گومانی تێدا نییە کە دەستکاری و دەستەمۆ کردنی نەستی ناوشیار، یانی هەمان ئیلهام کە فرۆید ڕیشەکانی ڕاڤە کردووە، بۆ ئەکتیڤ بوونی ئەم وزە و پۆتانسیەلە پێویستە. بەڵام ئەم خاڵە ئەم فەرزە دەسەلمێنێ کە فاشیزم لە خۆیدا پرسێکی سایکۆلۆژیک نییە و هەر کۆششێک بۆ ناسینی ڕیشەکان و ڕۆڵە مێژووییەکەی بەپێی چەمک و بنەمای سایکۆلۆژیک تەنیا لە هەمان ئاستی ئەو ئایدیۆلۆژییانە کە فاشیزم بانگەشەیان دەکات – لە وانە ئایدیۆلۆژی "خواست و وزەی دژەئەقڵانی" (شاراوە لە جەماوەردا) – دەمێنێتەوە. ئەگەرچی وتەبێژی فاشیست هەندێ ویستی تایبەتی

بەردەنگانی خۆی بەکاردێنێ، بەڵام لە بناغەدا وەک نوێنەر و پارێزەری بەرژەوەندی بەهێزی ئابووری و سیاسی ئەم کارە دەکات.
لە ڕاستیدا خواست و ویستی سایکۆلۆژیک هۆکاری سەرهەڵدانی فاشیزم نین، بەڵکوو فاشیزم ئەو فەزا سایکۆلۆژیکە پێناسە دەکات کە هەندێ لە هێزەکان دەتوانن بەشێوە سەرکەوتوانە بەهۆی تەواو ناسایکۆلۆژیک لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا سودی لێوەربگرن و پەرەی پێبدەن. کاتێ کە جەماوەر گیرۆدەی پڕوپاگەندەی فاشیستی دەبن، ئەوەی بە ئاشکرا ڕوودەدات، دەرکەوتنی خۆڕسکی ویست و غەریزەکان نییە، بەڵکوو جۆرێک ژیاندنەوەی دوبارە و شێوە زانستی دەروونناسی ئەوانە – یانی هەمان پاشڤەچوونی دەسکرد کە فرۆید لە توێژینەوەی گرووپە ڕێکخراوەکان دا ڕاڤەی دەکات. دەروونناسی جەماوەر لە لایەن ڕێبەرانییەوە داگیر کراوە و وەک ئامێریک بۆ زاڵ بوون بەسەریاندا دەرکەوتووە. ئەم دیاردە پرسێکی تەواو تازە نییە، چونکە تارمایی ئەو پێشتر لە هەموو بزاڤە دژە شۆڕشەکانی سەرتاسەری مێژوودا دەبینرێ. دەروونناسی زۆر زیاتر لەوە کە سەرچاوەی فاشیزم بێت، تەنیا یەکێ لە توخمەکانی پێکهێنەری سیستمێکی سەپێندراوە کە زاتی گشتێتی و گشتگیربوونی، لە پۆتانسیەلی بەرەنگاری جەماوەری و، ئەقلانیەتی جەماوەرەوە سەرچاوە دەگرێ. ناوەرۆکی تیۆری فرۆید، جێگیرکردنی خۆپەرستی تاکی لە جیاتی دیاردەی یەکبوون لەگەڵ دیمەنی پێشەوا، بە شتێکەوە بەستراوە کە دەکرێ بە داگیرکردنی دەروونناسی جەماوەر بەهۆی دەسەڵاتداران پێناسەی بکەین. بێگومان ئەم پرۆسەیە ڕەهەندێکی سایکۆلۆژیکی تێدایە، بەڵام لە هەمان حاڵدا هێمای ڕەوتێکی گەشندە بەرەو هەڵوەشاندنەوەی بزوێنەری سایکۆلۆژیکی کلاسیک و لیبراڵییە. وەها بزوێنەرێک بەشێوەی ڕێکوپێک بەهۆی مکانیزمی کۆمەڵایەتی ڕێنوێنیکراو لە سەرەوە رکێف دەکرێ و وەردەگیرێ. کاتێ کە ڕێبەران دەروونناسی جەماوەر دەناسن و کونترۆڵی دەکەن، ئەم دەروونناسیە بە وتەیەک بزر دەبێت. ئەم پۆتانسیەلە لە ناخی بۆچوونەکانی دەروونشیکاری دایە، بەتایبەت بەمهۆیە کە بۆ فرۆید چەمکی دەروونناسی چەمکێکی نگەتیڤە. ئەو دەڤەری دەروونناسی بەپێی ئیمتیازی نەستی ناوشیار پێناسە دەکا و ئەم تێزە گەڵاڵە دەکات کە دەبێ نەست (id) ببێت بە هەست (ego).
ڕزگاربوونی مرۆڤ لە دەسەڵاتی وابەستەی نەستی خۆی بەکردەوە بە مانای سڕینەوەی "دەروونناسی" مرۆڤە. فاشیزم ئەم پرۆسەی سڕینەوە بە مانای پێچەوانە بەرین دەکاتەوە، یانی بەهۆی درێژەدان بە وابەستەیی لەجیاتی بەدیهێنانی پۆتانسیەلی ئازادی، بەهۆی داگیرکردنی نەست بەپێی کونترۆڵی کۆمەڵایەتی، نە وشیارکردنەوەی سوژەکان لە نەستی خۆیان. چونکە هەرچەند کە دەروونناسی هەمیشە ئاستێک لە کۆیلەتی تاک پێناسە دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا چەمکی ئازادی بە مانای جۆرێکی تایبەت لە سەربەخۆیی تاک، وەک بنەما وەردەگرێ. لەخۆڕا نییە کە سەدەی نۆزدەهەم سەردەمی مەزنی بیری سایکۆلۆژیک بوو. لە جڤاتێک دا کە بە تەواوی تووشی رفیکاسیۆن هاتووە، کە لەودا هیچ جۆرە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێو تاکەکاندا نەماوە و هەر تاکێک وەک ئەتۆمێکی کۆمەڵایەتی لێهاتووە، پرۆسەکانی سایکۆلۆژیک، هەرچەند هێشتا لە هەر

تاكێک دا هەن، ئیدی وەک هێزی بنەڕەتی پرۆسەی کۆمەڵایەتی دەرناکەون. بەمجۆرە، دەروونناسی ئەقڵ، (لەم سەردەمەدا) هەمان شتی لە دەست داوە کە هێگل بە گەوهەر (substance) پێناسەی دەکرد. ڕەنگە ئەمە گەورەترین ئیمتیازی کتێبەکەی فرۆید بێت کە ئەو سەرەڕای ئەوەی کە خۆی تەنیا لە دەروونناس تاکی دا بەستەوە و ئاقڵانە هۆکاری کۆمەڵایەتی نەهێنایە نێو باسەکانی خۆیەوە، بەڵام وەرچەرخانێکی خولقاند کە لەودا دەروونناسی ئوتۆریتەی خۆی لە دەست دەدات. دەروونناسی "هەژاربوونی" ئەو سوژەیە کە "خۆی تەسلیمی ئوبژەیەک" کردووە کە ئەوی "لەجیاتی گرنگترین فاکتەری خۆی داناوە"، یانی هەمان "سوپێر ئێگۆ"، بە جۆرێک دەسەڵاتی غەیببێژییەوە، سەرتر لە دەروونناسی، هەواڵی سەرهەڵدانی ئەو ئەتۆمە کۆمەڵایەتیانە دێنێت، کە لە تاکێتی تەکێندراون، هەر ئەو ئەتۆمانە کە گرووپە فاشیستەکان پێکدێنن. لەم ئەتۆمە کۆمەڵایەتیانەدا دینامیزمی سایکۆلۆژیکی پێکهاتنی گرووپەکان، بە کردەوە لە خۆیان تێپەڕیون و ئیدی بەشێک لە ڕاستییەکان نین. چەمکی "درۆینە بوون" هەم ڕێبەرانی فاشیست و هەم پرۆسەی یەکبوونی جەماوەر لەگەڵ ڕێبەران و هیستری و هەڵچوونەکان دەگرێتەوە. باوەڕی دەروونی جەماوەری فاشیست بە ئەهریمەنی بوونی جولەکەکان بە قەد باوەڕی ئەوان بە پێشەوا لاوازە. ئەوان بە ڕاستی لەگەڵ پێشەوا نابن بە یەک، بەڵکوو وادەنوێنن کە یەکێکن، شور و شەوقی خۆیان پیشان دەدەن و، بەمجۆرە لە شانۆیەک دا کە پێشەوا بەڕێوەی دەبات بەشداری دەکەن. ئەوان بەهۆی ئەم شانۆیەوە هاوکێشییەک لەنێوان مەیلە غەریزییەکانی خۆیان و قۆناغی مێژوویی ڕۆشنگەری و ئاڵوگۆڕی فکری خۆیان دا دەبینن، قۆناغێک کە پێ گەیشتوون و ئیدی ناکرێ بەشێوەی دەسکرد بستێندرێتەوە. ڕەنگە هەر ئەم درۆینە بوون و خەیاڵی بوونی "دەروونناسی گرووپی" جەماوەری فاشیستە کە ئەوان ئاوا بێ ڕەحم و سامناک لێدەکات. ئەگەر ئەوان بۆ ساتێک بوەستن و بیربکەنەوە، تێکڕای شانۆ لێکدەترازێ و ئەوان لەئاست ترس و سام دا بە تەنیا دەمێننەوە.

فرۆید لە پشتخانێکی چاوەڕوان نەکراودا لەگەڵ توخمی "درۆینە بوون" بەرەوڕوو بوو، یانی لە تێزەکەی خۆیدا لەمەڕ هیپنوتیزم وەک جۆرێک گەڕانەوەی تاکەکان بۆ پێوەندی نێوان مێگەلی سەرەتایی و باوکی سەرەتایی:

هەروەک لە دژکردەوەکانی ترەوە فێر بووین، تاکەکان ئاستێکی بگۆڕ لە ویست و توانای شەخسی بۆ ژیاندنەوەی دۆخەکانی کۆنی لەم جۆرەیان لە خۆیاندا پاراستووە. ڕەنگە لە هەر حاڵ دا، ئاستێک لە ناسین لەم شتە بمێنێتەوە کە هیپنوتیزم بەپێچەوانەی هەموو شتێک تەنیا یارییەکە، جۆرێک بەرهەمهێنانەوەی کارتێکراوی کۆن و، هەر ئەم ناسینە گارانتی دەکات کە لە ئاست ئاکامە هەرە جدییەکانی وەستانی هێزی ئیرادە لە هیپنۆتیزم دا هێشتا بەرنگارییەک لە ئارا دایە.

ئەڵبەت لەم ماوەیەدا، ئەو یارییەی سەرەوە بۆتە پرسێکی کۆمەڵایەتی (socialized) و، ئاکامەکانیش ئێجگار جدی دەرکەوتوون. فرۆید بە پێناسەکردنی هیپنوتیزم وەک کارێک کە تەنیا لەنێوان دوو کەسدا ڕوودەدات، هیپنوتیزمی لە دەروونناسی گرووپی جیاکردەوە. بەڵام دەسەڵاتی




ڕێبەران بەسەر دەروونناسی جەماوەردا و، ڕۆڵ و وردبینی فێڵەکانیان، ئەو توانایە پێداون تا تلیسمی هیپنوتیک وەک پرسێکی کۆمەڵایەتی لێبکەن. بانگەوازی شەڕی نازییەکان، "ئاڵمانیا ڕاپەڕە"، لەڕاستیدا ڕێک پێچەوانەی ئەم شتەی لە خۆیدا هەڵگرتووە. بەڵام لە لایەکی ترەوە، کۆمەڵایەتی بوون و ڕەگداکوتانی تلیسم، دیاردەی گواستنەوەی زیاتر لە پێشوو ناڕاستەوخۆ و گوماناوی کردووە، بەجۆرێک کە ڕەهەندی شانۆیی ڕوداوەکە، "درۆینەبوونی" یەکێتی دڵخوازانە و هەموو دینامیزمێکی کلاسیکی دەروونناسی جڤاتی، بەشێوەی سامناک زیادی کردووە. ڕەنگە ئەم زیادبوونە لە وشیاری لەناکاو لەمەڕ درۆینەبوونی تلیسم و، سەرئەنجام لە لێکترازانی تلیسم دا، بە کوتایی بگات. هیپنوتیزم کۆمەڵایەتیکراو لە ناخی خۆیدا ئەو هێزانە پەروەردە دەکات کە لە ڕێگای کونترۆڵ لە دوورەوە کاری تارمایی گەڕانەوە یەکلایی دەکەنەوە و سەرئەنجام ئەو کەسانە بێدار دەکەنەوە کە بە ئەنقەست پێڵوەکانیان دادەخەن، هەرچەند کە ئیتر هەستاون.

**سەرچاوە:**

ارغنون فصلنامه فلسفی، ادبی، فرهنگی شماره ۲۲، صص ۱۰۹-۱۳٤

T.W. Adorno،»Freudian Theory and the Pattern of Fascist Propaganda« ،the Essential Frankfurt Reader ،Urizen Books، new York ،1978 ،pp. 118-138.

# کەمە نەتەوەییەکانو هاوڵاتیبوون لە جیهانی عەرەبیدا

نووسینی: هاشم ساڵح
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

لەناو هەمو نەتەوەیەک لە نەتەوەکاندا شتێک هەیە پێیدەوترێت ڕاستڕەوی توندڕەو، ئەم ڕاستڕەوە لەوانەیە تایفی یان ڕەگەزپەرستی یاخود پێکەوە هەردوکیان بێت. بۆ نمونە تەماشای ڕێخراوە فاشییەکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ئەوانی دیکە بکە تا دەگاتە سەر جان ماری لۆپێن سەرکردەی بەرەی نەتەوەیی لە فەرەنسا. بەشێوەیەکی گشتی ڕاستڕەوی کاسۆلیکی دەمارگیر ئەو سەرکردەیەیان خۆشدەوێت، هەروەها لەلای نەتەوەپەرستە شۆڤێنییەکانی فەرەنساش خۆشەویستە. ئەوان دەنگی پێدەدەن، چونکە ئەو کار لەسەر غەریزەکانی ژێرەوە و ڕەچەڵەکە کۆنەکان و خۆبەزلزانینی فەرەنسا و ڕق لەوانی دیکە دەکات، بە تایبەتی رق لە عەرەبو ڕەشپێستو بەشێوەیەکی گشتی لە پەناهەندەکان.

**پێویستە ئەوە بزانین یەکەم پرنسیپ لە پرنسیپەکانی عەلمانییەت و مافەکانی مرۆڤ و دانانی یاسا تازەکان، بریتییە لە یەکسانی تەواوەتی نێوان هاوڵاتیان، بێ گوێدانە ڕەچەڵەکیان و ئاینەکانیان، تەنانەت ئەگەر هیچ ئاینێك یان مەزهەبێکیشیان نەبێت**



هاشم سالح

هەمان شت لەسەر ڕاستڕەوی توندڕەوی عەرەبییش ڕاستە. ئەمانیش کاتێ بەوپەڕی سوکایەتیو بێڕێزییەوە قسە لەسەر کەمەنەتەوەییەکانی کۆمەڵگاکانمان دەکەن، وا هەستدەکەیت ئەوانە «جان ماری لۆپێن»ن کە قسە لەسەر مەغریبییەکان یان ڕەشپێستەکان یاخود ڕەوەندە عەرەبی و بیانییەکانی دیکەی فەرەنسا دەکات. بگرە «لۆپێن» لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە ژێر باری لێپرسینەوەی یاساییەوە، ناوێرێت هەندێ دەستەواژەی سووک و ناشرین دژ بە کەمەنەتەوەییە ئیتنییەکان یان ئاینییەکان بەکاربێنێت کە لە کۆمەڵگای فەرەنسیدا بوونیان هەیە. لە فەرەنسادا یاسایەک هەیە دژ بە ڕەگەزپەرستی و تایفەگەری و لێپرسینەوەیەکی توندیان لەگەڵدا دەکرێت. وەلێ لە جیهانی عەرەبیدا هیچ جۆرە یاسایەکی لەو شێوەیە نییە. لەبەر ئەوە حوکمە پێشوەختەکانی ڕەگەزپەرستی و تایفەگەری، هێندە بەربڵاو بووەتە وێردی سەر زمانەکانو ڕۆژنامەو گۆڤارو میدیاکانی پڕ کردووە، ئەمە جگە لە کەناڵە ئاسمانییە زەبەلاحەکان.

ئەگەر بەخت یاوەرت نەبێت و لە ناوچەی زۆرینە لەدایکنەبوبیت، ئەوا هێندە بەسە لەگەڵ یەکێکیاندا، لەبەر هەر هۆیەک بێت، ناکۆک بیت و کەمەکێک ناکۆکییەکە پەرەبسێنێت، تاکو بدرێیتە بەر ڕێژنەی تۆمەتی ڕەگەزپەرستی یان تایفگەری و دەمودەست ڕشتبکاتەوە یان بە لێدانێکی گورچکبڕ سەرکەوێت بەسەرتدا. نمونە لەسەر ئەوە لە ژماردن نایەت.

هەندێ لە ڕەوتە ڕاستڕەوەکان کە سیمایەکی فێندەمێنیتالیستی یان نەتەوەچییەتی یاخود هەردوکیان هەیە، لەو بڕوایەدان کەمەنەتەوەییەکان هۆکاری هەمو کێشەکانی جیهانی عەرەبین. ئەو پرسیارەی لێرەدا دەخرێتەڕوو ئەمەی خوارەوەیە: ئەگەر ئەم کەمەنەتەوەییانە لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنران و لەناوبران، ئاخۆ هەمو کێشەکان بە یەکجار چارەسەردەکرێن؟ ئەگەر کوردەکانمان لە ڕۆژهەڵات و ئەمازیغیەکانمان لە مەغریب وەک کەمەنەتەوەیی ئەتنی و زمانەوانی لەناوبرد، ئایا نەتەوەی عەرەبی سەردەکەوێت یاخود ئایا یەکێتی عەرەبی کە باسدەکرێ دەمودەست بەدیدێت؟ ئەگەر

مەسیحییە عەرەبەکان و هەمو تایفە شیعی و ئەبازییەکانمان بەبێ ئاوارتە لەناوبرد، ئایا کێشەکانی ئیسلام لەگەڵ خۆیداو لەگەڵ مۆدێرنەی گەردونی، بە چاوتروکانێک چارەسەر دەبێت؟ ئاخۆ لە ئیسلامدا کێ هۆکاری سەرەکی چەقبەستنە: کەمینە یاخود زۆرینە؟ کێیە دەستی بە قەدەغەکراوە ئاینییەکان و ڕێورەسم و سروتە ڕووکەشە تاقەتپڕوکێنەکانەوە گرتووە؟ ئەوە کێیە بە شێوەیەکی حەرفی دەستی بە توێکڵی دینەوە گرتووە نەک بە جەوهەرە ڕۆحانییە قووڵەکەیەوە؟ ئایا ئیخوان و سەلەفییە کۆنەپارێزەکان یان بن لادن یاخود ئەیمەن زەواهیری یا زەرقاوی و دەیانی دیکە، ئینتیمایان بۆ کوێیە؟ کێ لە ئێستادا هۆکاری پێکدادانی ئێمەیە لەگەڵ خۆرهەڵاتو خۆرئاوا و تەواوی جیهاندا؟ کێیە لە سەرجەم ناوچەکانی جیهاندا وێنەی عەرەب و موسڵمانی شێواندووە؟ کێ بەربەستە لەبەردەم بزاوتی مێژوویی عەرەبی و ڕۆشتنی بەرەو پێشەوە دوادەخات؟

پێویستە لەسەر بەڵگەنەویستەکان ڕێبکەوین و پرسیارەکان بێ ئەملاوئەولاو ترس و لەرز بخەینەڕوو: کێ ڕابەرایەتی بزاوتی مێژوویی عەرەب دەکات: کەمینە یان زۆرینە؟ ئەوەی تایبەتە بە جیهانی عەرەبی، دەکرێ بڵێین زۆرینەی عەرەبی ئیسلامی سونە مەسەلەکان بەڕێوەدەبات. ئەوەی تایبەتە بە جیهانی ئێرانی، دەکرێ بڵێن زۆرینەی فارسی ئیسلامی شیعە مەسەلەکان بەڕێوەدەبات. کەواتە شکستی مێژوویی بە پلەی یەکەم دەکەوێتە سەر شانی زۆرینە. کۆمەڵگا لەلایەن مەزهەبی زۆرینە و ئایدۆلۆژیا ڕەگداکوتاوەکەیەوە دەبرێت بەڕێوە، نەک لەلایەن کەمینەوە، کەمینەیەک زۆرجار لەبەر تۆمەتبارکردنی پێشوەختی بە تۆمەتی گومڕایی یان زەندەقە یان هەر ناوێکی دیکە کە دەتەوێت، تەنانەت ناوێرێت دەمی خۆی بکاتەوە.

بەڵام ئەو شتەی زاناکانی کۆمەڵناسی و ئەنترۆپۆلۆجیا تێبینیان کردووە، ئەوەیە کاتێ شکستێکی مێژوویی لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕوودەدات، ئەوا زۆر بەخێرایی کەمەنەتەوەییەکان تۆمەتبار دەکرێن، بگرە دەکرێنە قۆچی قوربانی تاکو تۆڵەیان لێبکرێتە و وەک دەڵێن ڕیسوا بکرێن. ئەو دەیەوێت لە ڕێگەی قوربانی دانی بەم کەمەنەتەوەییە یان بەوەی دیکەیان، تۆڵە لە شکست و سەرنەکەوتنەکانی خۆی بکاتەوە. ئەم دیاردەیە لە هەمو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە، نەک تەنها لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا. ئەوە دیاردەیەکی ئەنترۆپۆلۆجییە: واتە دیاردەیەکی مرۆڤانەی گەردونییە.

لەبەر ئەوە من ئەمەی خوارەوە بە هەمو کۆنەپارێزە تازەکان و ڕۆشنبیرانی ڕاستڕەوی عەرەبی دەڵێم: بەسە چیتر بۆ داپۆشینی شکست و کەمتەرخەمی و سەرنەکەوتنە مێژووییەکانی خۆتان، لەبەردەم ئەوروپا و تەواوی خۆرئاوادا، کەمەنەتەوەییەکان تۆمەتبار مەکەن. بەرپرسی یەکەم لەم شکستە ئێوەن، ئایدۆلۆژییە هەڵەکەتانە کە باوی نەماوە و زەمەن بەجێیهێشتووە. بەرپرسی ئەو شکستە مێژووییە ئەو داخرانە مەزهەبییەیە کە موعتەزیلە و فەیلەسوفەکانی، بەتەواوی لەناوبردو وەک ئەوەی خۆی ئیسلامی ڕاستەقینەبێت و خۆی تاکە دەستەی فریادڕەس بێت، فرەیی بیرکردنەوەی لەناوبرد کە یەکێک بوو لەو سیمایانەی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی، لەسەردەمی شکۆمەندی و زێڕینی خۆیدا پێیدەناسرایەوە. ئەوەی ئیبن سینای تەکفیر کرد لەبەر ئەوەی عارەقی دەخواردەوە و بەشێوەیەکی فەلسەفی عەقڵانی ئازاد لە ئاین گەیشتبوو، ئەو بەرپرسی شکستی مێژوویی عەرەبە. ئەوەی تەکفیری فارابی و ئیبن روشدو برایانی سەفا و ئیبن باجە و تەوحیدی و مەعەری و ئەبوبەکری ڕازیو هەمو بیرمەندە ئازادیخوازەکانی دیکەی ئیسلامی کرد، ئەو بەرپرسە لە شکستی مێژوویی. بەرپرسی ئەو شکستە مێژووییە ئەو مەزهەبەیە کە سەرکەوت و بەئاگر و

ئاسن هەمو مەزهەبەکانی دیکەی، بەبێ ئاوارتە، چەوساندەوە و لەسەر ئەو بنەمایەی خۆی حەقیقەتی ڕەهایە، هەیمەنەی خۆی سەپاندو لەسەر ئەم بڕوابونەشی، بە دڵنییاوە خەوێکی بێهۆشی قووڵی لێکەوت، وەک خەوی دانیشتوانی ناو ئەشکەوتەکە. ئیدی ئەوانی دیکە بۆڕیاندانینەوە و ئێمەش دواکەوتین و تا ئێستاش هەر پەلەقاژەمانە و نازانین چۆن و بە چ شێوەیەک سەرلەنوێ دەستپێبکەینەوە. لێرەوە و لە ئێستادا، هەڵوەشاندنەوەی مێژویی و فەلسەفی بە ناچاری خۆی بەسەرماندا دەسەپێنێت کە ناتوانین خۆمانی لێ بدزینەوە. ئێمە پێمانخستووەتە ناو قۆناغێکی لێکهەڵوەشاندنەوەوە سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی نییە، لانی کەم لە ئاسۆی بینراودا. هاتنی ڕزگاربوونی گـەورەش نایەت تەنها دوای لێکهەڵوەشاندنەوەی گەورە نەبێت.

## عەلمانیەت بنچینەی هاوڵاتیبوونە

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین یەکەم پرنسیپ لە پرنسیپەکانی عەلمانییەت و مافەکانی مرۆڤ و دانانی یاسا تازەکان، بریتییە لە یەکسانی تەواوەتی نێوان هاوڵاتیان، بێ گوێدانە ڕەچەڵەکیان و ئاینەکانیان، تەنانەت ئەگەر هیچ ئاینێک یان مەزهەبێکیشیان نەبێت. تەنانەت کەسێکی بێ باوەڕ، لەڕووی مافە مەدەنییەکانەوە، لەگەڵ ئەو کەسەدا یەکسانە کە هەمو ڕۆژێ دەڕوات بۆ کڵێسا، بەمەرجێک ئەرکەکانی بەرامبەر بە کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست بەڕێوەبباتو لەهەڵسوکەوتو ڕەفتاریدا ڕاستگۆبێت. بێگومان هەمو ئایندارێک هاوڵاتییە، بەڵام هەمو هاوڵاتییەک ئایندار نییە یان ڕێوڕەسم و سروتەکان جێبەجێ ناکات، ئەمەیە چەمکی تازەی هاوڵاتیبوون. زۆربەی هاوڵاتیان لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، لە جۆری دووەمن نەک یەکەم. ئەمانە کۆمەڵە شتێکە لە نێوان خۆت و یەزدانی خۆتدا و لە ڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکات، ئەمە ئەگەر ڕۆژی

**بەم دواییانە و بە بۆنەی بوونی ئۆباما بەسەرۆکی ئەمریکا، لە بەرنامەی (گفتوگۆ)ی تەلەفزیۆنی لەسەر کەناڵی بیستوچواری فەرەنسی، بەشە عەرەبییەکەی، بانگکرام. لە بەرنامەکەدا پێم سەیر بوو ئەوانەی بانگکرابوون، بەلایانەوە بوونی ئۆباما بەسەرۆکی ئەمریکا، مەسەلەیەکی ئاسایی بوو! ئەگەر چی دوو لە بەشداربووان لە نیویۆرك و واشنتۆنەوە قسەیان دەکرد و قسەکانیان خراپ نەبوو، بەڵام ئەوان ڕازینەبوون لەسەر دیاردەی سەرکەوتنی یەکەم سەرۆکی ڕەشپێست بۆ سەر عەرشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاوەستن**

قیامەت هەبێت، بۆیە هیچ کەسێک لەسەر زەوی بۆی نییە دەستیتێوەردات. بەڵام ئێمە لێرەدا قسە لە کۆمەڵگا شارستانییە پێشکەوتووەکان دەکەین، نەک ئەو کۆمەڵگایانەی تا ئێستاش چەندین توێژی بەرفراوانی تێدایە سەر بە فێندەمینیتاڵیستەکانی سەدەکانی ناوەڕاستن. ئەو توێژانە هەمو تایفەکان دەگرێتەوە نەک تەنها تایفەی زۆرینە. (ئەو لێکهەڵوەشاندنەوەیەی بانگەشەی بۆ دەکەم، بیروباوەڕی هەمو کەمینەکانیش دەگرێتەوە بێ ئاوارتە کردن، نەک تەنها بیروباوەڕی زۆرینە).

ئێمە قسە لەو کۆمەڵگایانە دەکەین کە لەلایەن فەلسەفەی سیاسی مۆدرێنەوە دەبرێن بەڕێوە، نەک لەلایەن حاکمیەتی لاهوتی مەودودی یان ویلایەتی فقهی خومەینی و عەلی خامەنەئی. مرۆڤ لەژێر سایەی ئەم فەلسەفە رۆشنگەرەدا، بۆ خۆی بەهایەکی هەیە، بۆیە پێویستە لەبەر ئەو بەهایەی رێزی لێبگیرێت، سا سپی بێت یان ڕەش، موسڵمان بێت یان مەسیحی، عەلەوی یان سونی یان دورزی یان ئەبازی...هتد بێت. لەم تێڕوانینەدا گروپێک لە گروپێکی دیکە باشترنییە. هیچ کەسێک پێشتر و بەشێوەیەکی پێشوەخت دیاری نەکراوە کە لە کەسێکی دیکە باشترە. یاخود بڵێ هیچ گروپێک لەم گروپە ئاینی و مەزهەبیانە نییە، خۆی بە خەڵکانی باش و بەڕێز و دڵسۆز دابنێت. هەموان لە هاوڵاتیبوون و مافەکانی مرۆڤدا، لەبەردەم یاسادا یەکسانن. ئا ئەمەیە دەوڵەتی مۆدرێن کە خەونی پێوە دەبینین، نەک دەوڵەتی تیۆکراتی لاهوتی کە لانی کەم نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر تا ئەمرۆش، دەستی خستووەتە بینەقاقامان و حوکمان دەکات. ئێمە پێویستمان بە شۆڕشێکی ڕۆشنگەری ڕادیکاڵانە هەیە ڕێگا بۆ هاتنی گۆڕانی سیاسی ڕاستەقینە خۆشبکات. ئەمجارەیان گۆڕان (سەوابتەکان و موقەدەسەکانی ئومە)ش دەگرێتەوە، یان ئەو شتانەی بە وەهم وا دەزانین جێگیر و موقەدەس و ئەبەدییە، کەچی تەنها هەڵبەستراوێکی مێژوییە و لە ڕەگوڕیشەوە دووچاری گۆڕان دەبن، وەک ئەوەی فەرەنسا و ئەڵمانیا و هەمو جیهانی ئەوروپی شارستانی ئەنجامیاندا. لەسەر پاشماوەی داروپەردوی ئەوان، کۆمەڵێ سەوابت و موقەدەسی تازە جێگیردەبن کە کەرامەتی مرۆڤ و مرۆڤبوونی مرۆڤ لەسەر و هەمو شتەکانەوە دادەنێت. ئیدی کەلتوری ئیسلام ڕوویەکی لێکبوردەیی جوان و مەزنی تازەی دەبێت، نەک ئەم ڕووە ڕەش و ناشرینەی کە لەسەروبەندی پێخستنە ناو سەردەمی پاشەکشەوە و نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر تا ئێستا، کۆنترۆڵی کردوین و زاڵە بەسەرماندا.

## ئێش و ئازاری کەمینەکان

پێویستە ئێش و ئازاری کەمینە ئاینی و نەتەوەییەکان، بە درێژایی مێژوو، بەکەم سەیر نەکەین. پێویستە بە چاوێکی سوک و ڕقاوییەوە لێیان نەڕوانین، وەک ئەوەی ڕۆشنبیرانی ڕاستڕەوی توندڕەوی عەرەبی یان غەیرە عەرەبی ئەنجامیدەدەن. هەندێجار گوێم لە قسەی کۆمەڵێ ڕۆشنبیر دەبێت، گوایە دیموکراسی و ڕۆشنفکرن، بەڵام ئەگەر ئەو قسانەیان، لێرە لە فەرەنسا یان لە هەر وڵاتێکی دیکەی ئەوروپی پێشکەوتوو بکەن، ئەوا بە تۆمەتی هاندانی ڕەگەزپەرستی یان تایفی لێپرسینەوەی یاساییان لەگەڵ دەکرێت. هەندێک لەو بڕوایەدان، هەمو کێشەکان و هەمو دۆڕاندنەکان، لە کەمینەکانەوە دێن! ئەگەر ئەو کەمینانە لەناوببرێن یان لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵکێشرێن و پاکتاوبکرێن، ئەوا کۆمەڵگا ئیسراحەت دەکات و تەواوی کێشەکان بە یەکجار چارەسەر دەکرێن. ڕەنگە بۆ ڕوونکردنەوەی وێنەکە، کەمەکێک زیادەڕۆیم لە وێنەکەدا کردبێت. بەڵام ئەم هەستە بوونی هەیە، یاخود لە بارودۆخەکەدا بە شێوەیەکی نهێنی یان بە ئاشکرا هەستی پێدەکرێت. پێویستە بزانرێت دواکەوتنی عەرەبی یاخود

پاشەکشەکردنی، لە یەککاتدا دووچـاری کەمینە و زۆرینە دەبێتو هیچ کەسێک لێی دەرناچێت. ئەگەر کەسێک هەبێت بەرپرسیاری یەکەم بێت، ئەوا زۆرینەیە کە بە درێژایی چەندین سەدە حوکمی کردووە و چارەنوسی مێژوویی بەڕێوەبردووە، جگە لە چەند ماوەیەکی کورت کورت یان هەندێ ئاوارتەی سنوردار نەبێت. بە دانپیانانی هەمو مێژونوسان و فەیلەسوفانی جیهان، سەردەمی پاشەکشەکردن لە سلجوقییەکانەوە و لە سەدەی یانزەهەمی زاینییەوە دەستیپێکردووە، واتە پێش نۆسەد ساڵ لەمەوبەر. دواتـر ئـەم پاشەکشەیە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بەردەوامبوو کە ڕاستەوخۆ درێژکراوەی ئەوانە و لە بوارەکانی داهێنانی زانستی و فەلسەفی یان بوارەکانی دۆزینەوە و داهێنانەکاندا هیچی زیاد نەکردو هیچ دانەهێنا، بە پێچەوانەی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی کلاسیک لە سەردەمی زێڕینیدا.
هەندێکیان دەیانەوێت ئەوە بڵێن کە ئینتیمابوون بۆ کەمینەیەک یان هەستکردن بە چەوسانەوەی مێژویی یان بە ئازارە مێژوییەکان، بووەتە شتێکی بێنرخ و شورەیی! برۆ ئەم قسانە بە ڕەشپێستەکان بڵێ کە لەلایەن ئێمەی عەرەب و موسڵمانەوە یان لەلایەن ئەوروپییەکانەوە، بۆ چەندین سەدە کرابوون بە کۆیلە، بگرە وەک کاڵایەکی هەرزان بازرگانیان پێوەدەکرا. برۆ بۆ لای ئەو و پێی بڵێ: براکەم عەیبناکەی! ئەم گلەیی و گازندەیەت لە چییەو بۆچی ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشی؟ کوا کێشەکە؟ وسبە و دەمت داخـە، برۆ داوای لێبوردن لەوانە بکە کە چەوساندیتیانەوە و ئازاریاندای و پێیان پیانای و کەرامەتو ناخی مرۆڤانەتیان روخشاند و بریندارکرد. لێرەدا ڕۆڵبینینەکان هەڵدەگەڕێنەوە و لۆژیک پێچەوانە دەبێتەوە. لە وڵاتانی شارستانیەتی پێشکەوتودا، تەواو پێچەوانەی ئەوە دەکەن. ئەگەر نا بۆچی پاپا یۆحەنا پۆڵسی دووەم، داوای لێبوردنی لە قەسابخانەکەی سانت بارتلیمی کرد کە زۆرینەی

**چیتر بۆ داپۆشینی شکست و کەمتەرخەمی و سەرنەکەوتنە مێژوییەکانی خۆتان، لەبەردەم ئەوروپا و تەواوی خۆرئاوادا، کەمەنەتەوەییەکان تۆمەتبار مەکەن. بەرپرسی یەکەم لەم شکستە ئێوەن، ئایدۆلۆژییە هەڵەکەتانە کە باوی نەماوە و زەمەن بەجێیهێشتووە. بەرپرسی ئەو شکستە مێژوییە ئەو داخرانە مەزهەبییەیە کە موعتەزیلە و فەیلەسوفەکانی، بەتەواوی لەناوبردو وەك ئەوەی خۆی ئیسلامی راستەقینەبێت و خۆی تاکە دەستەی فریادڕەس بێت، فرەیی بیرکردنەوەی لەناوبرد کە یەکێك بوو لەو سیمایانەی شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی، لەسەردەمی شکۆمەندی و زێڕینی خۆیدا پێیدەناسرایەوە.**

کاسۆلیک دژ بە کەمینەی پرۆتستانت، پێش زیاد لە چوار سەدە لەمەوبەر ئەنجامیاندا؟ وەلێ ئێمە لێرەدا قسە لە وڵاتانی شارستانی و گەلانی پێشکەوتوو دەکەین، قسە لەو ئاینانە دەکەین ڕیفۆرمیان کردو خۆیان چاککرد.

بەڵێ من کاتێ گوێ لە کەناڵە ئاسمانییە چەقەبازەکان و ڕۆشنبیرانی ڕەوتی نەتەوەپەرستی فێندەمینیتالزم، واتە ڕۆشنبیرانی ڕەگەزپەرستی-تایفی دەگرم، هەست بە ترس و نیگەرانی دەکەم، ئەوانە مەسەلەکان ئاوەژوو دەکەنەوە، ئیدی قوربانی دەبێت بە جەلاد و جەلادی مێژوویش دەبێت بە قوربانی! هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری عەرەبیدا کە بە دەست تێکەڵ و پێکەڵی و چەواشەکاری و ساختەکارییە و دەناڵێنێت، پێویستە مەسەلەکان ڕوونبکرێنەوە. بەڵام خۆشبەختانە لە هەمو وڵاتانی عەرەبیدا، کۆمەڵێ ڕۆشنبیری نێر و مێ، لێرە و لەوێ، وەک مەشخەڵی پرشنگدار دەردەکەون. ئەوانە مانای تازەگەری و ڕۆشنگەری ڕاستەقینە دەزانن و وەک ڕووکەشێکی تەنک، بۆ داپۆشینی ڕەگەزپەرستییان و تایفەگەرییان و مەیلە خۆبەزلزانەکەیان بەکارناهێنن. بێگومان جەنگەکەیان جەنگێکی سەخت و دژوارە، چونکە لایەنگرای ڕەوتی ڕەگەزپەرستی تایفی، تەنها هەر ئەوە نییە ژمارەیان زۆرە، بەڵکو خاوەنی مەشروعیەتێکی مێژوویین کە هیچ دەستی ئێمەی تێدانییە.

ڕابردوو لەگەڵ ئەوانە و ئایندە دژیانە، وەلێ ئێمە ئایندە لەگەڵمانە و ڕابردووی سەلەفی دژمانە.

لەبەر ئەوەی ڕیفۆرمی ئاینی تا ئێستا ڕوینەداوە و ڕۆشنگەری فەلسەفیش هێشتا بەدینەهاتووە، بۆیە ئەوان جارێ هەر سەرکەوتودەبن. بەڵام ئاخۆ ئێمە دەزانین ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا لە سەدەی هەژدەهەمدا، ٢٨ ملیۆن کەس بووە و ژمارەی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، لە سی بۆ چل کەس تێنەپەڕیووە و ژمارەی لایەنگرانیشیان لە پاریس لە سێ هەزار کەس و لە تەواوی مەملەکەتی فەرەنسا لە ١٥ هەزار کەس زیاتر نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا جەنگە فیکریەکەیان بردەوە، دواتر و لە کۆتایدا جەنگە سیاسییەکەشیان بردەوە؟ لێرەوە سەرەڕای هەمو شتێ، بوارەکە لەبەردەم ڕۆشنگەرانی عەرەب و موسڵماندا کراوەیە. بەڵام ئەوان جەنگێکی تاقەتپڕوکێن بەڕێوەدەبن کە تێیدا قوربانی گەورەی پێویستە. چونکە تۆ ناتوانیت بێ جەنگێکی ڕاستەقینەی ئێسک شکاندن، ئەو داخستنانە بکەیتەوە کە هەزارانساڵە بەسەریەکدا کەڵەکە بوون.

بڕۆ ئەو قسانەی نەتەوەپەرستە توندڕەوە خۆبەزلزانەکان، بە هەمو ئازاردراوەکانی زەوی بڵێ، یان بڕۆ بە هەمو ئەوانەی بڵێ کە بە هۆکاری نەژادی یان تایفی یاخود مەزهەبییەوە چەوسێنراونەتەوە. بڕۆ بە هەمو تایفەکانی شیعە و ئەبازی و ئیسماعیلی و دورزییەکانی جیهانی عەرەبی بڵێ. بڕۆ بە بەربەرە ئەمازیغیەکانی مەغریبی گەورە و کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی گەورەی بڵێ، ئەو کوردانەی مافە زمانەوانی و کەلتورییەکانیان پێ ڕەوانابینن و لەبەر ئەوەی زمانی دایکیان خۆشدەوێ و پەیوەستن پێیەوە، دەچەوسێنرێنەوەو ڕیسوادەکرێن. ئایا بیستوتانە عەرەبێک فێری زمانی کوردی یان ئەمازیغی بوبێت؟ مەحاڵە یان زۆر بە دەگمەن. ئەمە لە کاتێکدایە ملیۆنان کورد و ئەمازیغی فێری زمانی عەرەبی بوون، بگرە داهێنانیان تێداکردووە و زۆرجار لە ئێمەش سەرکەوتوترن. بڕۆ بە هەمو کەمینە سونەکانو ئەتنیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی فارسی شیعە بڵێ. لەوێ تەنها ئیسلامی ڕاست و دروست مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامە. لەوێ گروپی باڵادەست و سەرکەوتوو ئەهلی شیعەیە نەک سونە: واتە تەواو پێچەوانەی ئەوەی لە جیهانی عەرەبیدا بەربڵاوە. بڕۆ بەو مەسیحییە عەرەبانە بڵێ کە تا سەدەی یانزەی زاینی لە سوریاو لەوانەیە لە میسریش زۆرینە بووبن.

کێ ئەوە دەزانێ؟ دواتر سوریا بوو بە ئیسلامی، چونکە خەڵکی لەسەر ئاینی پادشاکانیان. لێرەوە زۆربەمان باوباپیرانمان مەسیحی بوون، پێش ئەوەی ببن بە ئیسلام. برۆ بە ئەرمەنەکان و تایفەکانی دیکەی مەسیحی بڵێ کە لە مێژوی هاوچەرخدا و لەسەر دەستی بەکرێگیراوانی سەڵتەنەتی عوسمانی شارستانی، دووچاری درێوترین کوشتوبڕ بوونەوە. خۆشبەختانە نوخبە ڕۆشنبیرییەکانی تورکیا، بە گوڕوتینێکی بەهێزەوە کەوتونەتە جووڵە بۆ داواکردنی لێبوردن لەو کوشتوبڕە، بەم دواییانە ژمارەی واژۆکانیان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت سی هەزاری تێپەڕاندووە. ئافەرین بۆ نوخبەی شارستانی تورکیا! بەڵام نوخبەی سوری یان بەشێوەیەکی گشتی نوخبەی عەرەبی چی دەکەن، ئایا هیچ سۆزێکی بەزەیی یەزدانیتان تێدانییە؟ بەسوکتەماشاکردنی کەمینەکان یان قسەکردن لەبارەیانەوە وەک ئەوەی مێش و مەگەزبن!

برۆ ئەو قسانە بە پرۆتستانتە فەرەنسییەکان بڵێ کە لویسی چواردەهەم، لەسەدەی چواردەدا تێکوپێکی شکاندن، ئەم تێکشکاندنە لەو کات و ساتەدا ڕویدا کە لویسی چواردەهەم دروشمە بەناوبانگەکەی سەپاند بەسەریاندا: یەک مەزهەب! یەک یاسا! یەک پاشا! ئاشکرایە پاشای خۆر لە کەسایەتی خۆیدا حاکمیەتی ئیلاهیانەی مەسیحی بەرجەستە دەکرد، یان خۆی بەسێبەری یەزدان لەسەر زەوی دادەنا. بەڵام خۆشبەختانە ڕۆشنگەرە فەرەنسییەکان بەخێرایی هاتن تاکو ئەو پرۆژە لاهوتیەی لویسی چواردەهەم لە بنچینەوە هەڵتەکێنن. پاشان شۆڕشی فەرەنسی هات تاکو بیروڕای ئەو ڕۆشنگەرانە لەسەر زەمینی واقع بەرجەستە بکات و ڕژێمی کۆن بە تەواوی بروخێنێت. ئیدی لەو کات و ساتەدا سەوابتە لاهوتییە پیرۆزەکانی گەلی فەرەنسی هەرەسیانهێنا و لە شوێنیان سەوابتە تازەکان جێگایان گرتەوە کە بریتین لە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون کە لە ساڵی ١٧٨٩ بڵاوبوەوە و لە خودی شۆڕشی فەرەنسییەوە سەرچاوەی گرتبوو. بەدیهاتنی ئەو دەستکەوتانە بۆ فەیلەسوفە گەورە و مەزنەکانی ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوە، بە تایبەتی بۆ مڵۆزمی گەورەی پرۆتستانتی جان جاک رۆسۆ، پێغەمبەری سەردەمە تازەکان. ئەوە ئەو فەیلەسوفانە بوون ڕەوایەتی کۆنیان بۆمبرێژکرد، تاکو دواتر لەناوییەرنو لە جێگایدا ڕەوایەتییە تازەکە دابنێن. هەر ئەمەشە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا و لە چەند ساڵی داهاتودا ڕوودەدات، دوای ئەوەی شەپۆلی شعوبی فێندەمێنیتاڵیزم بە هەمو هاتوهاوار و قیڕەقیڕییەکانیەوە پاشەکشە دەکات و بەرتەسکدەبێتەوە.

## ڤۆڵتێر و کەمینەکان

بۆچی هەندێجار دەڵێم پێویستە ڤۆڵتێر وەک نمونەیەک بۆ خۆمان وەربگرین؟ چونکە ئەو ژیانی بە قسەوتن بە کەمینەکان یان ناونانی خەڵک بە کەمینە، نەبردەسەر، بەڵکو ژیانی بۆ بەرگریکردن لەوان بردەسەر، گەرچی خۆی سەر بەوان نەبووە. ئەو ژیانی بۆ ئیدانەکردنی دەمارگیری کوێرانەی ئاینی زۆرینەی کاسۆلیکەکان تەرخانکرد کە لە باوباپیرانییەوە سەر بەو زۆرینەیە بووە و لە ئامێزیدا گەورە بووەو ژیاوە. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو دەمارگیری زۆرینە مەترسیدارتر بووە و توانای لێدان و ئازاردانی زیاتری هەبووە. ئەوە زۆرینەیە کە یاساکانی خۆی بەسەر کۆی کۆمەڵگادا دەسەپێنێت. ئەوە ئەوانن بەو پەڕی لوتبەرزی و خۆبەزلزانەوە جیاوازی ڕەگەزپەرستی یان تایفی پیادە دەکەن. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە کەمینە مەترسیدار نییە، بگرە هەندێجار کەمینەش زۆر مەترسیدار و دڕندەیە، بە تایبەتی کاتێ گەشتە دەسەڵات. لێرەوە لەوانەیە قوربانیانی دوێنێ ببنە جەلادەکانی ئەمڕۆ. بۆیە لە هەمو حاڵەتەکاندا مەسەلەی تایفی لە

هەرلایەکەوە بێت، وەک ڕەگەسپەرستی، شوێنی ئیدانەکردنە. بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ ڤۆڵتێر

ڤۆڵتێر بەهۆی دژایەتیکردنی بۆ تایفەی مەسیحی، ژیانی خۆی خستە مەترسییەوە، چونکە فێندەمێنیتالیستەکان زیاد لە جارێک هەڕەشەیان لێکرد و هەندێجار هەڕەشەکەیان زۆر بە جدیی بوو. ڤۆڵتێر دەیتوانی چاوی خۆی دابخات و ژیانێک بژی وەک ژیانی پاشاکان، بەبێ ئەوەی خۆی سەخڵەت بکات و سەریەشە بۆخۆی پەیدا بکات. بەڵام ئەو ژیانی خۆی کردە قوربانی بۆ بەرگریکردن لە حەقیقەت و دژایەتیکردنی چەوساندنەوە و ستەم لە هەرلایەکەوە بێت، تەنانەت ئەگەر لەلایەن کۆمەڵەکەی خۆی و تایفەکەی خۆشیەوە بێت. لە بنچینەدا مەزنی ڕۆشنبیر ئالێرەدایە، ڕۆشنبیری راستەقینە نەک ئەو ڕۆشنبیرەی بەدرێژایی ڕۆژ بەرگری لە تایفەکەی دەکات و بەسووک لە تایفەکانی دیکە دەڕوانێ. ئەمەیان ئاسانە و دوچاری هیچ ناخۆشییەکی ویژدانی نابیت، بەڵکو بە پێچەوانەوە. دەمارگیری ئاسانە و لە دەروونەوە نزیکە و تامەکەشی خۆشە، بەڵام لەناخی هەر یەکێکماندا سەرکەوتن بەسەر ئەو دەمارگیریەدا، کارێکی زەحمەتە. لێرەوە ڕۆشنبیری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە شەڕ لەگەڵ دەمارگیرییە شاراوەکانی ناخیدا دەکات و ڕووبەڕوی تایفەکەی خۆی دەوەستێتەوە، بگرە ئەگەر پێویستیشی کرد تەحەدای دەکات. براکەت سەرخە ئەگەر زاڵم بێت یان مەزڵوم، وتی ئەگەر زاڵم بێت چۆن سەریخەم؟ وتی مەهێڵە زاڵم بێت.

دروست ئائەمە بوو ڤۆڵتێر ئەنجامیدا، هەروەها دروست ئا ئەمەبوو جان پۆل سارتەر، لەم سەردەمەماندا دژ بە فەرەنسای ئیمپریالیزم لە جەزائێر ئەنجامیدا. بەسەرهاتی ڤۆڵتێر لەگەڵ خێزانی «کالاس»ی پرۆتستانتی بەناوبانگ، بخوێنەرەوە کە زۆرینەی کاسۆلیکەکان لە شاری تۆلۆز هێرشیان کردە سەریان و هێندەی نەمابوو پارچە پارچەیان بکەن. ئەمە لە کاتێکدا بوو فەرەنسا هێشتا لە ڕووی ئاینییەوە دەمارگیر بوو، وەک ئەمڕۆی ئێمە. فەرەنسا لەو سەردەمەدا هێشتا ڕۆشننەکرابووەوە و هێشتا نە گەشەی کردبوو نە پێشکەوتوبوو. یۆسۆعیەکان: واتە ئیخوانە مەسیحییە کاسۆلیکەکان، دەستیان بەسەر پرۆگرامەکانی خوێندن و ڕۆشنبیری باو و پەیمانگاکان و دامودەزگاکانی زانکۆکاندا گرتبوو، لەو سەردەمەدا ئایدۆلۆژیای تایفی زۆرینە دەستی بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا گرتبوو. هیچ پرۆتستانتییەک نەیدەوێرا فزە لە دەمیەوە بێت. کەچی ئێستا بووەتە هاوڵاتییەک وەک کاسۆلیک تەواوی مافەکانی هاوڵاتیبوونی هەیە، هەمو مافەکانی هەیە و هەمو ئەرکەکانیشی لەسەر شانە. هەنووکە چیتر لەسەر بنەمای تایفی بوونی کەمینە و زۆرینە نەماوە، بەڵکو لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژی یان سیاسی یاخود پرۆگرامی سیاسی و هەڵبژاردن بوونی هەیە. پرۆتستانتی دەتوانێ لەسەر هەمو ئاست و لایەنەکان، وڵات بەرێوە ببات، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک گومان لە نیشتیمانپەروەریەکەی یان هاوڵاتیبونەکەی بکات. تەماشای میشێل رۆکار و لیۆنێل جۆسپار و ئەوانی دیکە بکە. ئۆباما کە بەم دواییانە چووتە سەر عەرشی ئەمریکا، ئایا لەو بڕوایەدان ڕاستڕەوی توندڕەوی ئەمریکی بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشە؟ ئایا لەو بڕوایەدان بە ئاسانی چونە ژێر باڵی ئەو هەواڵەوە؟ ئەوان بەو پەڕی پێناخۆشبوونە بێدەنگن، چونکە زۆرینەی گەلی ئەمریکی ڕۆشنفیکرن و دژ بە ڕەگەزپەرستین، پێش دە ساڵ لەمەوبەر مەسەلەکە زۆر زەحمەت بوو، ئەمە ئەگەر مەحاڵ نەبوبێت. وەلێ ئێستا مەسەلەکە ئاسانە، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە عەقڵیەتەکان بە ڕادەیەکی باش پێشکەوتون، دوای ئەوەی ئەبراهام لینکۆلن و مارتن لۆسەر کینگ و ئەوانی دیکە باجەکەیان دا.

لای ئێمەش مەسەلەکە گەشەدەکات و بەرەو پێشەوە دەڕوات، لای ئێمەش ڕۆژێ لە ڕۆژان تایفەگەری کەمدەبێتەوە یان بە تەواوی دەمرێت. بەڵام ناتوانین

داوا لە کۆمەڵگاکانمان بکەین، ئـەوەی کۆمەڵگا شارستانییە پێشکەوتوخوازەکان بە درێژایی سێ سەد ساڵی ڕۆشنگەری و خۆڕۆشنبیرکردن بڕیویانە، ئەمان لە چەند ساڵێکدا ببڕن و هەمو کرانەوەکانی مۆدێرنەی فەلسەفەی و زانستی و سیاسی وەربگرن. کەواتە کەمەکێک ڕوخسەت! گومانی تێدا نییە ساتەوەختی پێشکەوتنی عەرەبی و ڕۆشنگەری عەرەبی بەڕێوەیە.

## ئۆباما و بڕینی مێژویی

دواجار ئەمەی خوارەوە دەڵێم:

بەم دواییانە و بە بۆنەی بوونی ئۆباما بەسەرۆکی ئەمریکا، لە بەرنامەی (گفتوگۆ)ی تەلەفزیۆنی لەسەر کەناڵی بیستوچواری فەرەنسی، بەشە عەرەبییەکەی، بانگکرام. لە بەرنامەکەدا پێم سەیر بوو ئەوانەی بانگکرابوون، بەلایانەوە بوونی ئۆباما بەسەرۆکی ئەمریکا، مەسەلەیەکی ئاسایی بوو! ئەگەر چی دوو لە بەشداربووان لە نیۆیۆرک و واشنتۆنەوە قسەیان دەکرد و قسەکانیان خراپ نەبوو، بەڵام ئـەوان ڕازینەبوون لەسەر دیـاردەی سەرکەوتنی یەکەم سەرۆکی ڕەشپێست بۆ سەر عەرشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاوەستن. لە تێڕوانینی ئـەوانـدا ئـەوە گێژەڵوکەیەکی ناو کوپێکی قاوەیە و تەنها شایەنی ئەوەیە بەدەم ڕێوە قسەیەکی سادە و ساکاری لەسەر بکەیت! من پێچەوانەی ئەوە دەبینم، ڕەمزیەتی ڕوداوەکە، هیچی لە مەترسی و بایەخی ئەو سیاسەتە کەمتر نییە کە ئۆباما پەیڕەوی لێدەکات. ئۆباما لەوانەیە سەرکەوێت و لەوانەشە سەرنەکەوێت، ڕەنگە ئێمەی عـەرەب سیاسەتەکەیمان بەدڵ بێت و ڕەنگە بە دڵیشمان نەبێت. بەڵام هەرچۆنێک بێت لەوانەی پێش خۆی خراپتر نابێت. مەحاڵە لەو سیاسەتە خراپتربێت کە کۆنەپارێزە تازەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، بێگومان باشتر دەبێت. لەبەر ئەوەی ئۆباما نەک تەنها لەڕووی ڕەچەڵەکەوە جیاوازە، بەڵکو لە ڕووی ئاینیشەوە جیاوازە، بۆیە لە کۆمەڵێ تێڕوانینی فەلسەفی دیکەوە دەستپێدەکات. ڕاستە ئەو وەک زۆرینەی ئەمریکییەکان کەسێکی مەسیحی پرۆتستانتە، بەڵام باوکی «حسێن ئۆباما» موسڵمان بووە. لێرەوە ئەو ڕەگ و ڕیشەیەکی ئیسلامی هەیە. جگە لەوە بەدڵنیاییەوە شتێکی دیکە هەیە، ئەویش ئەوەیە ئۆباما ئەو سنورە ڕەگەزپەرستانەیەی شکاند کە ڕێگەی نەدەدا کەسێکی نا سپی و نا پرۆتستانتی بگاتە عەرشی کۆشکی سپی. ئاشکرایە جۆن کەنەدی سەر بە کەمینەی کاسۆلیک بوو، هەندێک ڕازینەبوون بگاتە کورسی سەرۆکایەتی چونکە پرۆتستانتی نەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی سپی پێست و لە خێزانێکی گەورە و دەوڵەمەند بوو، توانی بە ئاسانی بەسەر ئەوەدا سەرکەوێت. هەرچی بارک حسێن ئۆبامایە، لە تێڕوانینی ڕاستڕەوی خۆرئاوادا لە کەسایەتی خۆیدا «دزێوترین» سیفەتەکانی لەخۆگرتووە: ئەو ڕەشپێستە و باوکی ڕەچەڵەکێکی ئیسلامی هەیە، واتە یەک دژی کۆنەکردوەتەوە بەڵکو دوو دژی کۆکردوەتەوە! لەگەڵ ئەوەشدا توانی بەربەستە گەورەکان ببڕێت و مەحاڵ بێنێتەدی.

بۆچی ئۆباما لەژێر سێبەری پەیکەرە گەورەکەی ئەبراهام لینکۆل ڕاوەستا. لەبەر ئـەوەی ئەمەی دواییان ڕزگارکەری کۆیلەکانی ئەمریکا بوو. ئەو لە ساڵی ١٨٦٥ یاسای کۆیلایەتی ڕەتکردەوە، واتە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا یان کەمەکێک دواتر. بۆچی مارتن لۆسەر کینگ لەژێر سێبەری هەمان پەیکەردا گوتارە بەناوبانگەکەی خۆی خوێندەوە: من خەونێکی گەورەم بۆ ئێوە هەیە؟ چونکە ئەویش مانای ئەبراهام لینکۆل و مەزنی ئەو پیاوەی لە کاروانی مێژوی ئەمریکادا دەزانی. ئەویش دەویست وەک ئۆباما سەلامێکی لێ بکات. هەردوکیان، واتە لۆسەر و لینکۆل بەهۆی بەرگریان لە کەرامەتی بریندار و ڕووشاوی مرۆڤی کەمینەی

ڕەشپێست تیرۆرکران. ئەبراهام لینکۆل لەکاتی ئامادەبوونی بۆ شانۆگەرییەک نامەردانە تیرۆر کرا، ڕەگەزپەرستەکان لە پشتەوە بۆی هاتن و دایانە بەر دەستڕێژی دەمانچە. مارتن لۆسەر کینگ-یش لە تەمەنی چل ساڵیدا، درایە بەر دەستڕێژی دەمانچەی ڕەگەزپەرستەکان. هەردوکیان ژیانیان کردە قوربانی بۆ بیروڕاکانیان و بۆ بڕوابونیان بە نمونە باڵاکان. ئۆباما هیچ نییە جگە لە بەرهەمی ڕاستەوخۆی ئەو تێکۆشانە و ئەو قوربانیدانە. گەر ئەوان نەبونایە، ئەوا ئەم نەدەگەیشت بەمەی ئێستا.

چی لە هەمو ئەومانە بەدەستدێنین؟ شتێکی مەزن و زۆر گرنگ بەدەستدێنین، ئەویش بریتییە لە: لە مێژودا پێشکەوتن کارێکی مومکینە. ئەوە بەدەستدەهێنین مرۆڤایەتی توانای پێشکەوتن و گەشەکردنی هەیە و دەتوانێ مەیلە ڕەگەزپەرستی و تایفەگەریەکەی تێپەڕێنێت. ئەوە بەدەستدەهێنین کە زەمەن هەرچەندە بخایەنێت، دواجار ئەوە بەها ڕۆحانی و هیومانستییە باڵاکانن سەردەکەون. ئەوە بەدەستدەهێنین سەرکەوتن بەسەر غەریزە شەڕانگێزە بەرتەسکەکاندا کە لە قوڵایی ناخی هەر تاکێکماندا ئامادەیە، شتێکی مومکینە. ئەمەیە ناوی دەنێم جەنگێکی بێ ئامان لەگەڵ خود دا، سەرکەوتن بەسەر خود دا. ڕاستە ئەوە پرۆسەیەکی سەخت و زۆر دژوار و تاقەتپڕوکێنەرە، چونکە تۆ ئەو کات لەگەڵ خودی خۆتدا، لەگەڵ خۆشەویسترین شتی خۆت، دەکەویتە ململانێوە نەک لەگەڵ دوژمنێکی دەرەکی. ململانێ لەگەڵ خود زۆر لە شەڕی پیاوان زەحمەتترە، وەک ئەوەی ئارسەر رامبۆ لە دیوانە بەناوبانگەکەیدا (بەشێک لە دۆزەخ) دەیڵێت.

بەڵام ئەمریکییەکان لەم تاقیکردنەوە سەختەدا سەرکەوتو بوون و بەسەر ڕەگەزپەرستییە شاراوەکەیاندا سەرکەوتن و ڕازیبوون کەسێکی ڕەشپێست سەرۆکایەتیان بکات، پاشان ڕازیبوون بەوەی بۆ ماوەی چوار ساڵ و لەوانەیە زیاتریش،

**بەڵێ من کاتێ گوێ لە کەناڵە ئاسمانییە چەنەبازەکان و ڕۆشنبیرانی ڕەوتی نەتەوەپەرستی فێندەمینیتالزم، واتە ڕۆشنبیرانی رەگەزپەرستی-تایفی دەگرم، هەست بە ترسو نیگەرانی دەکەم، ئەوانە مەسەلەکان ئاوەژوو دەکەنەوە، ئیدی قوربانی دەبێت بە جەلاد و جەلادی مێژویش دەبێت بە قوربانی! هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە لە گۆڕەپانی رۆشنبیری عەرەبیدا کە بە دەست تێکەڵ و پێکەڵی و چەواشەکاری و ساختەکارییەوە دەناڵێنێت، پێویستە مەسەلەکان ڕوونبکرێنەوە**

خانمی یەکەم ئافرەتێکی ڕەشپێست بێت. ڕاستە ئەو خانمە ڕۆشنبیر و قەشەنگ و بەڕێزە، بەڵام ڕەشپێستە. ئێستا ئەو خانمە ڕووکاری ئەمریکایە لەبەردەم تەواوی جیهاندا. سەردەمی لۆرا بۆشی سپیپێستی قژ زەرد کۆتاییهات. ئایا ئەوە جوان و ناپاب نییە؟ ئایا شایەنی ئەوە نییە ئاماژەی پێبدرێ و کەمەکێک لەسەری ڕاوەستین؟ ئایا دڵ پڕ ناکات لە خۆشی و کامەرانی و دڵنیایی بە ئایندەی مرۆڤایەتی؟ لەبەر ئەوە وتومە و دەیڵێمەوە و دووبارەی دەکەمەوە: براڤۆ بۆ گەلی ئەمریکی! سەرۆکە تازەکەیان پیرۆزبێت. ئەم سەرکەوتنەیان بەسەر خود دا بەخۆشیبێت.

وەلێ زۆر بەداخەوە «محەمەد حەسەنێن هەیکەل» بەسەر خودی خۆیدا سەرنەکەوت، بگرە لەکاتی لێدوانە سادە و هیچ و پوچەکەیدا بە بۆنەی هەڵبژاردنی یەکەم سەرۆکی ڕەشپێست بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ڕەگەزپەرستیە شاراوە و دزێوەکەی ناو ناخی دەرخست. ئەو پێیوابوو هەڵبژاردنی ئۆباما نیشانەیەکە بۆ بونی قەیران لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا، لە بری ئەوەی نیشانەیەک بێت بۆ تەندروستی و باشی ئەو کۆمەڵگایە. تەماشای (بلیمەتی) هەیکەل لە تێگەشتنی بۆ دیاردە گەورەکان بکەن! ئەم نوسەرە سادەیە یان بۆ ئەوەی زۆر زوڵمی لێنەکەین ئەم نوسەرە مامناوەندە، ئەوە لانی کەم پەنجا ساڵە فیکری سیاسی عەرەبی بەڕێوەدەبات!!

بە بڕوای من لێرەدا شێوە یان ڕوخساری ئۆباما، لە هەمو ناوەڕۆکەکان گرنگترە. سەربارەت بە ناوەڕۆکی سیاسی، ئەوا لەو بڕوایەدام پێویستە ئۆباما فەلسەفە سیاسییەکەی لە ریشارد بۆلییت وەربگرێت کە مامۆستای مێژوو و زانستە سیاسییەکانە لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیۆیۆرک و دوژمنی هەرە سەرسەختی سامویل هانتیگتۆن و بێرنارد لویس و هەمو قەلەباچکەکانی پێکدادانی شارستانیەتەکانە کە لەسەردەمی «بۆش»دا باڵادەستبوون. ڕەنگە مردنی سامویل هانتیگتۆن بە چەند ڕۆژێک پێش ئەوەی ئۆباما دەسەڵات وەربگرێت، مانایەکی ڕەمزی هەبێت بۆ مردنی تەواوی سەردەمێک. با بزانین بۆلییت چی دەڵێ؟ زۆر بە کورتی ئەمەی خوارەوە دەڵێ: هەرچەندە بە درێژایی مێژو، پەیوەندییەکانی خۆرئاوا و عەرەبە موسڵمانەکان، ململانێکان بەڕێوەی بردوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ڕەگوڕیشەی شارستانی هاوبەش لەنێوان خۆرئاوا و عەرەبە موسڵمانەکاندا هەیە. بگرە مەسەلەکە لای بۆلییت دەگاتە ئەو ئاستەی بڵێ ئەوانە دوو لق یان دوو چڵی یەک شارستانیەتن: شارستانیەتی ئیسلامی — مەسیحی کە دەستی بەسەر ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاستدا گرتبوو! شتێکی سەرسوڕهێنەرە ئاوا بڵێت و ناچێتە عەقڵەوە.

دواتر دەڵێ ئەو ئیسلامەی هاوشانە بە مێژوی تازەی جیهانی عەرەبی، ئیسلامێکی فرەییە و بەشێوەیەکی گشتی پێشکەوتوخوازە و دەمارگیر و توندڕەوەکانی ناوی، هەرگیز زۆرینە نین، بگرە کەمینەن. ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەیە کە میدیاکانی خۆرئاوا بانگەشەی بۆ دەکەن. لێرەوە دەکرێ هەردوو جیهانی خۆرئاوا و جیهانی عەرەب و ئیسلام پێکەوە بژین و هیچ مانایەک و هیچ ئایندەیەک بۆ تیۆرەی پێکدادانی شارستانیەتەکان لە ئارادا نییە. گومانی تێدا نییە ئیسلام پێویستی بە ریفۆرمێکی گەورە هەیە، وەک ئەوەی پێشتر بەسەر مەسیحییەتی ئەوروپادا هات. بەڵام ئەم ریفۆرمە بەڕێوەیە و جیهانی عەرەبی یان ئیسلامی، لە ساڵانی داهاتودا کەسایەتییە گەورەکان بەرهەمدەهێنێت کە دەتوانن ئەم وەرچەرخانە یان ئەم بازدانە جۆرییە بەدیبێنن. لێرەشدا دەڵێین براڤۆ بۆ مامۆستای زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیۆیۆرک! دەبا سەرۆک ئۆباما لە کێشانی هێڵە پانەکانی سیاسەتەکەیدا سودی لێوەربگرێت، نەک سود لە برنارد لویس و سامویل هانتیگتۆن و کۆنەپارێزە تازەکان وەربگرێت. بەڵام ئاخۆ تۆ بڵێی ئەو پێویستی بەم ئامۆژگارییە بێت؟

سەرچاوە: الاوان، ١٧ تەموز، ٢٠٠٩

# کوردەکانی عێراق

نووسینی: ئەدمۆندز **Edmonds G.J**

و. لەعەرەبییەوە: عبدالکریم عوزیری

## کورتە پێشەکییەکی وەرگێڕ

G.J Edmonds لەناو کوردەواریدا بە ئەدمۆن ناسراوە. دۆستێکی دێرینی گەلی کوردبووە. کەسایەتیەکی دانا و لێزان بووە. لە ساڵانی ١٩٢٢ بۆ ١٩٤٥ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە، زۆریش لە کوردستان ژیاوە و گەلی کوردی باش ناسیوە. کوردییەکی باش فێربووە بە کوردی لاتینی نووسیویەتی. لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا وانەی کوردی لە زانکۆی لەندەن وتۆتەوە و لەسەر کورد نووسینی زۆری بڵاوکردۆتەوە.

**سنووری باشووری ڕۆژئاوای کوردستان دەشتاییە. دەشتێکی تەخت و دوورودرێژە وەلێ کە دەگاتە باشووری ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش دەگۆڕێ، دەسبەجێ بەرزایی و گردی قەدپاڵی شاخ دێنەڕێ، ئینجا ڕیزە شاخی سەخت دەردەکەوێ، زنجیرە چیای هاوشان و هاوڕێك یەك لە پاڵ یەکدا درێژ دەبنەوە و ئەو دەڵێ من لەوی تر بەرزترم.**

## بەشی یەکەم

کوردستان نیشتەجێی کۆمەڵگەیەکی بێ گەردە کە بە کورد ناسراوە، لەلایەن تورکیا و ئێران و عێراقەوە دابەشکراوە. دوو بەشی تری ئەم خاکە دەکەوێتە سوریا و یەکیەتی سۆڤییەتەوە. کورد نە سنووری نێو دەوڵەتی هەیە و نە دەوڵەتی تایبەت بەخۆی.
کوردستانی عێراق لە باکوورەوە هاوسنووری تورکیایە و لە ڕۆژهەڵاتەوە هاوسنووری ئێرانە. لە هەردوو دیوی ئەم سنوورانەوە زۆرینەی کورد نیشتەجێن. لە باشووری ڕۆژئاوادا سنوورەکەی هاوجووتی «هێڵی ئاسنین» ی نێوان موسڵ و سوریایە. شاری موسڵ دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە.
لە موسڵەوە بەرەو باشوور، سنووری ئەم خاکە بە هێڵێکی ڕاست دەگاتە مەندەلی کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران، بەم شێوەیە کوردەکان لە چوار لیوادا گرد بوونەتەوە. ئەم چوار لیوایە، لە زەمانی عوسمانیدا، ویلایەتی موسڵیان پێکدەهێنا. کورد (٣٥٪ دانیشتوانی موسڵ) و (٩١٪ ئەربیل) و ( ٥٢٪ کەرکوک) و ( سلێمانی سەدی سەد) پێکدێنێ. هەروەها کورد زۆرینەی دانیشتوانی دوو قەزای تەنیشت خۆی پێکدێنێ، قەزاکان خانەقین و مەندەلین. جگە لە کوردەکان چەند گوندێکی تر هەن دانیشتوەکانی مەسیحی کلدانین و دەکەونە باکوور و ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵەوە. نزیکەی ٢٥ هەزار ئاسووری پێکەوە گردبوونەتەوە لە ناوچە بڵندەکانی ئامێدیدا نیشتەجێبوون؛ هەروەها کۆمەڵی تورکمانی هاوڕەگەز لە زنجیرە شارۆچکەیەکی گەورە و بچوکدا کە دەکەونە قەراغ ئەو جادە مەزنەی لە موسڵەوە دەستپێدەکات و بە هەولێر و ئاڵتون کۆپری و کەرکوک و کفریدا تێپەڕدەبێت و دەگاتە بەغدا.
لە لایەکی تریشەوە، شوێنی تر هەن کە دەکەونە دەرەوەی سنووری کوردستان وەلێ دانیشتوانەکەی کوردن. لە هەموویان گرنگتر چیای شەنگالە، دەکەوێتە ڕۆژئاوای موسڵ و زۆربەی دانیشتوانی




**خواستەکانی کورد، بە دۆڕاندنی سەربازی تورکیا لە ساڵی ١٩١٨دا، بزەیەکی تازەی بەخۆیەوەدی. دوانزە خاڵەکەی سەرۆک Woodrow Wilson's ودرۆ ویلسۆنی ئەمریکیش هاتنە پاڵی، ئەم خاڵانە پێکهاتەی پرۆگرامی ئاشتی نێو دەوڵەتی بوو کە بە "programme of world peace" ناسراوە و لە مانگی کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا بڵاوکرانەوە**

یەزیدین و خەڵکی بە لێنەزانی ناوی شەیتان پەرستیان بریوە بەسەریاندا. نفووسی کوردی عێراق، دەکرێ بە هەژمارێکی عادیلانە و بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ بە نۆسەد هەزار کەس مەزەنە بکرێ و نزیکەی یەک لەسەر پێنجی هەموو دانیشتوانی عێراق دەبن.

سەرژمێری لە کوردستانی ئێراندا نەکراوە بەڵام درووست و شیاوە ئەگەر بە هەمان ژمارەی کوردی عێراقییان بخەمڵێنین. سەر ژمێری تورکی ساڵی ١٩٤٥ دەڵێ ئەوانەی زمانی دایکیان کوردە ملیۆن* و نیوێک دەبن، هۆکار هەیە کەوا تێبگەین ژمارەی کوردەکان لەمە زیاترە و لانی کەم دوو ملیۆن دەبن. ئاینی هەرسێ بەشەکەی کوردستان ئیسلامی سوننەیە، دیاردەی تەسەوفی دەروێشی هەموو پارچەکانی کوردستانی گرتۆتەوە. لە شارە گەورەکاندا: سلێمانی سەراپا کوردە، هەولێریش زۆربەی هەرە زۆری کوردە. شارۆچکە بچووکەکان کە هەموو دانیشتوانی، یان زۆربەی زۆریان، کوردن ئەمانەن: خانەقین، کفری، کۆیسنجەق، ڕەواندووز، ئاکرێ، ئامێدی و دهۆک. شاری کەرکوک زۆر تێکەڵاوە بەڵام پێکهاتەی هەرە گەورەی کوردە.

چینی پیشەگەر و ڕۆشنبیر، وەک ژمارەیەکی زۆری خاوەن موڵک سروشتییە حەز لە ژیانی شار و شارۆچکەکانی دەکەن. بەردەوام بەشێک لەمانەش کۆچ دەکەن بۆ بەغدا. زۆربەی خەڵکانی گوندەکان ئێستەجێگیربوون، کۆچەرەکان کە جاران زۆرینەبوون، ئێستە ڕێژەیەکی بچووک پێکدێنن. هەر چەندە گوندنشینەکان هەموو عەشایەر نین، بەڵام سیستمی ژیانی کۆمەڵایەتیان خێڵەکیانەیە ـ لادێ نشینەکان وەلا بۆ ئاغا دەردەبڕن، بەشێکی تریان

دوای یەکێک لە شێخەکانی تەریقەت دەکـەون و دەبن بە دەروێش یاخود دەبنە ڕەنجبەری ئاغاکانی خێڵەکی کە بە زۆر خۆی سەپاندوە بەسەریاندا.
بەهۆی پتەوبوونی ڕەوشـی پێشکەوتووخوازانەی دەسەڵاتی ئیداری دەوڵەت و پەرەسەندنی پرۆسەی پەروەردەوە، کارێکی ناسروشتی و نائاسایی نەبوو کە خەڵکی گوندەکان دەستیانکرد بە ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی خۆسەپاندنی ئەم بارۆنە تازانە کە بە ئاغا ناودەبرێن و مافی ڕەوای مولْکایەتییان نییە و بەزۆرەملێ پێگەی خۆیان قایم دەکەن، لەهەمان سۆنگەشەوە ترادسیۆنی کۆنیشیان ( هەر چەندە هیچ یاسایەک ناچاری پەیڕەوکردنی نەکردوون) لەناوبرد و نەیانهێشت ببێتە ڕێگر لەدەربازبوون لە ڕژێمی کۆنی کۆمەڵایەتی.

**بەشی دووەم**

سنووری باشووری ڕۆژئاوای کوردستان دەشتاییە. دەشتێکی تەخت و دووردرێـژە وەلێ کە دەگاتە باشووری ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش دەگۆڕێ، دەسبەجێ بەرزایی و گردی قەدپاڵی شاخ دێنەڕێ، ئینجا ڕیزە شاخی سەخت دەردەکـەوێ، زنجیرە چیای هاوشان و هاوڕێک یەک لە پاڵ یەکدا درێژ دەبنەوە و ئەو دەڵێ من لەوی تر بەرزترم. ئەم چیایانە لە (لایم ستۆن) واتە بەردە گەچ پێکهاتوون. زنجیرە چیای زاگرۆس لە باشوورەوە دەستپێدەکات و بەرەو باکوور دەکشێ و سنووری سروشتی لەگەڵ ئێراندا دەنەخشێنێ. ئـەم زنجیرەیە، لەوپەڕی باکووریدا، پاڵ دەدا بە شانی ڕۆژهەڵاتی کۆمەڵە چیای تـۆرۆسـەوە. لوتکە شاخی گـەردن کەش، ئەوەندەی زۆرن ئەوەندەش بڵندن، گەلێکیان لە دە هەزار پێ تێدەپەڕن. گۆڕانی سروشت گۆڕانی کەش و هەوای بە دوادا دێ.
٣ ڕووباری گرنگ بەخاکی ئەم وڵاتەدا تێدەپەڕن و دەڕژێنە دیجلەوە، زابی مەزن لە تورکیاوە سەرچاوە دەگرێ، زابی بچووک و سیروان (دیالە) لە ئێرانەوە* هەڵدەقوڵن.
هێڵی شەمەندەفەر لە بەغدا و لە پاڵ جادەڕێی کۆنی کفرییەوە بەرەو کەرکوک و ئەربیل دەکەوێتە ڕێ و خزمەتی ئەو بەشەی کوردستان دەکا کە دەکەوێتە دامێنی زابی گـەورەوە. هێڵی ئاسنینی سەرەکی دەکەوێتە لای ڕاستی دیجلەوە و دەگاتە موسڵ کە دەکەوێتە ئەو پەڕی باکووری ڕۆژئاوای عێراقەوە. ئێستاکە زۆربەی شارۆچکە تیجارییەکان ئۆتۆمبێلیان پێدەگا. گواستنەوە لە شوێنە دوورە دەستەکاندا بە هێستر و گوێدرێژ دەکرێ. «گا» بۆ کاری بارهەڵگرتن هێشتاکە لەلایەن کۆچەرەکانەوە بەکاردێت.
ئابووری کوردستان بە زۆری پابەندە بە ئاژەڵ بەخێوکردن و کشتوکاڵەوە. کۆچەرەکان لە مەڕ و بزندا دەوڵەمەندن. داواکارییەکی زۆر لەسەر خوری مەڕ و مـووی بزن و شیر و ماستەکەیان هەیە. فەرش و قوماش بۆ ناوماڵ و جلوبەرگ، لەلایەن کۆچەرەکان و دانیشتوانی گوندەکانەوە دروست دەکرێت و بەکاردەهێنرێت. چنین و ڕستن هێمایەکی ترادسیۆنیە.
دانەوێڵەی سەرەکی زستان گەنم و جۆن. دەشتی هەولێر و ناوچەی موسڵ لەم بەرهەمانەدا بەناوبانگن و گەنم بە نرخێکی باش دەفرۆشن، گەلێ ساڵ بەرهەم زۆرە و دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنانی تر، وەلێ هەمیشە مەترسی وشکەساڵ و برسێتی لە ئارادایە. لە هاویندا، لە هەچ شوێنێک ئاو زۆربێ لەوێ چەڵتوک دەچێنرێ بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە هۆشیاری دانی حکومەت کە مەلاریای لێدەکەوێتەوە. چونکە ئەو شوێنەی چەڵتوکی زۆرە مێشوولەشی زۆرە، ئەو بەرهەمە کەمانەی کە لە هاویندا بەئاودان دێنە بەرهەم؛ گەنمەشامی، هەرزن و نیسکە.

بەرهەمی هەرە بەنرخ تووتنە، لە ساڵی ١٩٥٤دا، نۆ هەزار تەن وەبەرهێنرا بەشی هەموو وڵاتی کرد و لێشی زیادبوو. بەرهەمی خۆماڵیش هەن، وەکوو گوێز و بەڕوو، بنێشت و کەتیرە و ترشەسماق. ڕیزە خانوو بە ڕۆخی ڕوبارە گەورەکاندا دێنە خوارەوە بەتایبەتی لە قەراغ زێی بچووک. کەڵەک هێشتا هەرزان ترین کەرەسەی گواستنەوەیە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، گەنم و بەرهەمی تر دەگەیەنن. بەرهەمی باشی تازە کەوتۆتە کوردستانەوە، لەوانە؛ لۆکەو چەوەنەری شەکر. بەغدا بازاڕی هەرە گشتگرە بۆ ئەم بەرهەمانە. مێوژ و توو لە شوێنە شاخاوییەکاندا بەرهەمدێنن و لە دەشتە نزیکەکاندا بەگەنم و جۆ ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێ.

بێجگە لە پیشەسازی مەزنی نەوت کە لە دەوروبەری کەرکوکدا گەشە دەکات، لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٧ وە، لەو ڕۆژەوە کە لە نزیک ئەم شارەوە نەوت بۆ یەکەم جار فیچقەی کرد، گەشەکردن بەردەوامە و پیشەسازییش لەو دەوروبەرەدا پەرە دەسێنێ. زۆرن ئەو کوردانەی کە لەلایەن کۆمپانیای نەوتی عێراقەوە مەشقیان پێکراوە لە بەشەکانی ئەندازیاریدا، هەروەها گەلێ کۆلێژی هونەری و پراکتیکی لە موسڵ و هەولێر و کەرکوک بۆ کاروباری نەوت کراونەتەوە. ئەم کۆلێژانە ناوبانگیان پەیدا کردەوە و گەلێ قوتابی کورد ڕادەکێشن. پڕۆژەی تایبەتیش چاوەڕێ دەکرێ بۆ ئەوەی ببنە تەواوکەری پڕۆگرامە بەرز خوازەکانی حکومەت.

ئەم پڕۆگرامە بەو قازانجە بەرجەستە کرا کە لەداهاتە بە پیتەکەی نەوتەوە، لە ساڵی ١٩٥٢ وە دەست حکومەتی عێراق دەکەوێ و بەردەوام لە زیادکردندایە (ساڵی ١٩٥٥ گەیشتە ٢٥٠ ملیۆن دۆلار) هەر لەم داهاتەوە لیواکانی باکوور وەکو هەموو شوێنەکانی تری وڵات سوودمەند بوون. ئەم شارانە قازانجی گەورەیان بەدەستهێناوە، لەوانە: هێنانی شارەزایانی بیانی، هاتوون و سەرقاڵی ڕێنمایی کردنن بۆ چاککردنی مێتودەکانی کشتوکاڵی و بەخێوکردنی تووتن.

کێڵگەی تەجریبی دووەم لە نزیک شاری سلێمانی بۆ بەرهەم هێنانی تووتن کراونەتەوە، عەمباری ئاویش بۆ ئاو و ئاودێری هاوردە کراوە و لە شوێنانی گونجاودا دادەنرێن. ڕێگا کۆنەکان قیرتاو کراونەتەوە و جادەی تریش دروستکراون، پرد لەسەر ڕووبار و چەمەکان ڕایەڵکراون، خانووی شارەوانی و کارەبا و ئاو بەهەرزان دەستەکەون، بە پەرۆشەوەبوون لە ئاستی قوتابخانە و خەستەخانەدا هەیە، کارگەیەکی چیمەنتۆ لە نزیک سلێمانی لە تەواو بووندایە. وێستگەیەکی کارەبا، لەساڵی ١٩٥٨ لە دوبز لەسەر زێی بچووک بە وزەی شەست هەزار کیلۆ وات دەکەوێتە کار کردن «لە داهاتوودا وزەی بەرهەمهێنانی دەگاتە سەدو پەنجا هەزار کیلۆوات»،بەشی هەموو ناوچەی باکوور کارەبا دەدات.

دوو پڕۆژەی گەورەی پڕۆگرامی گەشەکردن، کە زۆر سەرنج ڕاکێشن؛ بەنداوی دوکانی مەزنە کە لەسەر زێی بچووک دەبێ و بەنداوی دەربەندیخان لەسەر ڕووباری سیروانە و هەردووکیان لە سلێمانی، کوردستانن، وە قازانجێکی کاتی بۆ خەڵکانی دەوروبەر وەک کرێی کرێکار دابین دەکات. وەلێ ئامانجی سەرەکی ئەم دوو پڕۆژەیە پاراستنی بەغدایە لەلافاو، ئامانجی لاوەکیش عەمارکردنی ئاوە و بەکارهێنانی لە قەراغ ئەو چەم و ڕووبارانەی کە پێیاندا تێدەپەڕن.

لەسەرووی ڕووبارەکانەوە زەوی و زارێکی زۆر ئاو دایـان دەپۆشی و چەندین گوند چۆڵ دەکرێن. حکومەت بەو پەڕی وریاییەوە ئاگای لەم بارودۆخە دەبێت، زەوی کشتوکاڵی و خانووبەرە لە شوێنی گونجاودا بۆ ئەم «ئـاوبـردووانـە« دابین دەکات کۆمەکیان دەداتێ.

ئەو ئیشە زۆرەی کە لە ئاکامی ئەم پڕۆژانەوە

دەکەونە ئاراوە، سوود بەخش دەبن بۆ دانیشتوانی شوێنە بەرزەکان. داهاتی هەمیشەییان بۆ دابین دەکەن. ئەگەر ئەم کارانە شکست بێنن ئەوە چاوەڕێی پەشێوی و ئاشوبە دەکرێ.

**بەشی سێیەم**

کوردەکان لە کاریگەری تەوژمی ناسیۆنالیزمی بەدەر نەبوون، ئەم شەپۆلە کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە جۆشی سەندوە، وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی گرتۆتەوە. بۆ ئەوەی لە هەڵوێستی کوردی عێراق لە حکومەتی مەرکەزی بەغدا تێبگەین، دەبێ کورتە چاو خشانەوەیەک بە مێژووی ناوچەکەدا، لە پێش و لەدوای ساڵی ١٩١٨، بکەین.

هەرچەندە سیاسەتەکانی عوسمانییەکان و ئێرانییەکان مەرکەزی بوون، وەلێ ژمارەیەک میرنیشنی نیمچە سەربەخۆ لە هەردوو وڵاتدا هەتاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە خۆیان داگرت. دوو خانەوادەی میرزادەی کورد، لە نزیکەوە ئاوێتەی پەرەسەندنی ناسیۆنالیزمی کوردی بوو بوون. ئەم دوو خانەوادەیە؛ بەدرخانی بۆتان «هێشتا لە تورکیایە»، کە پایتەختەکەیان جزیرەی ئیبن عومەرە« ئێستە ناوی جەزیرەیە« . ئەوی دووەم بابانی سلێمانییە.



حاجی قادری کۆیی

کارێکی ئاسان نییە هیچ بەروارێک دەستنیشان بکرێ یان بارودۆخێکی تایبەت بکرێتە دەستپێک بۆ پەرەسەندنی ناسیۆناڵیزمی کورد یاخود خاڵی وەرچەرخانی، پوختە پێوەری مۆدێرن بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم لە پێش و لەدوای کپکردنی ئەم ئیمارەتانەدا، وەک بارێکی سروشتی چەندین شۆڕش دژ بەدەسەڵاتی مەرکەزی هەڵگیرساوە، لەم شۆڕشانەدا پێشەواکان دوودڵییان نەکردوە هەست و سۆزی ڕەگەزی نەتەوەیی ببزوێنن بۆ ئەوەی جەماوەر شوێن خۆیانبخەن.

ناسیۆنالیزمی سەردەم، جیاوازترە لە دەرخستنی

جارانی هەمان ڕۆحیەت. ئێستە ئەم هەست و سۆزە بەندە بەزمانەوە و گرنگی گەورە بەزمان دەدا. پڕ بە دڵ کارێکی باش دەبێ ئەگەر هەندێ گرنگی تابەتمەند بگەڕێنینەوە بۆ ساڵی ١٨٩٢ کە چەند ئەندامێکی خێزانی بەدرخان ڕۆژنامەیەکیان پەخش کرد بە ناوی «کوردستان» ەوەو ناوبەناو تاساڵی ١٩٠٢ لە شاری گەلێ دووری وەکو قاهیرە و لەندەن وە «چەند شوێنێکی چـاوەێ نـەکـراوی وەک» فۆلکستۆنی لە ئینگلتەرە. وەلێ لە ساڵی ١٨٩٢دا حاجی قـادری کۆیی «١٨١٧ - ١٨٩٤ژیـاوە« و شاعیرێک بووە کە هەڵبەستەکانی تاکو ئێستا وەکو دروشمی نیشتیمان پەروەری دەوترێنەوە، لە تەمەنی

**ناسیۆنالیزمی سەردەم، جیاوازترە لە دەرخستنی جارانی هەمان ڕۆحیەت. ئێستە ئەم هەست و سۆزە بەندە بەزمانەوە و گرنگی گەورە بەزمان دەدا. پڕ بە دڵ کارێکی باش دەبێ ئەگەر هەندێ گرنگی تابەتمەند بگەڕێنینەوە بۆ ساڵی ١٨٩٢ کە چەند ئەندامێکی خێزانی بەدرخان ڕۆژنامەیەکیان پەخش کرد بە ناوی "کوردستان" ەوەو ناوبەناو تاساڵی ١٩٠٢ لە شاری گەلێ دووری وەکو قاهیرە و لەندەن وە "چەند شوێنێکی چاوەێ نەکراوی وەك" فۆلکستۆنی لە ئینگلتەرە.**


کردستان

بسم الله الرحمن الرحيم



حەفتاو پێنج ساڵیدا توانی لەو ڕۆژانەی ئیمارەتی بابانییەکاندا مەشخەڵێکی ئەدەبی هەتاهەتایی هەڵکات، شاعیرێکی هاوچەرخی تریش ئەم شیعرەی بەسەر ئیماراتی باباندا وتووە:

«بەبیرم دێ سلێمانی دارولموڵکی بابان بوو
نە سوخرەکێشی عەجەم نە مەحکومی ئالی عوسمانی بوو*»

یەکەم یانەی سیاسی کورد لە ساڵی ١٩٠٨دا* لە ئەستەمبول لەلایەن ئەمیر عەلی بەدرخان شەریف پاشای سلێمانیەوە دامەزرێندرا.

چالاکی ئەدەبی کوردی، لە «مانگی شەکراو»ی دوای شۆڕشی گەنجە تورکەکان بووژایەوە، وەلێ ئەم شیرینە مانگە زۆری نەخایاند. لەوحاڵ و بارەشدا گۆڤار و هەڵبژاردەی هەڵبەست و چیرۆک «Anthology» بڵاو دەکرانەوە. نووسین بەزاراوەی کوردی باکوری بۆتان و دیالێکی سلێمانی لە باشوور بوو، لە ئەستەمبول دەردەچوون.

زاراوەی سلێمانی سۆرانی زاڵبوونێکی پیشاندا و بوو بە زمانی دەربڕینی ئەدەبی نەک هەر لە کوردستانی عێراقدا بەڵکو لەودیو سنووری ڕۆژهەڵاتیشدا لە ئێران دا. ئەمە ڕەنگە بەهۆی پشتیوانی کردنی دوا میرەکانی بابان بن کە نامەکانیان بە کوردی دەنووسی و لەلایەکی ترەوە بەهۆی دامەزراندنی قوتابخانەیەکی سەربازی بوو لە شاری سلیمانی لەلایەن تورکەکانەوە. دەرچووی ئەم قوتابخانەیە چوون بۆ خوێندنی ئەکادیمی و کۆلێژی ئەرکان و توانیان بگەنە ئاستێکی ڕۆشنبیری* کە کوردەکانی تری لێبێبەشبوون. سروشتییە کە ئەم ئەفسەرانە توانیویانە کادری بزوتنەوەی نەتەوەیی ئامادەکەن.

خواستەکانی کورد، بە دۆڕاندنی سەربازی تورکیا لە ساڵی ١٩١٨دا، بزەیەکی تازەی بەخۆیەوەدی. دوانزە خاڵەکەی سەرۆک Woodrow Wilson's ودرۆ ویلسۆنی ئەمریکیش هاتنە پاڵی، ئەم خاڵانە پێکهاتەی پرۆگرامی ئاشتی نێو دەوڵەتی بوو کە بە «programme of world peace» ناسراوە و لە مانگی کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا بڵاوکرانەوە، لەم پرۆگرامەدا هاتوە کە نەتەوەکانی غەیرە تورکی ئیمپراتۆریای عوسمانی دەرفەتێکی تەواویان بەبێ دەستهێنانە بەر دەدرێتێ بۆ بە دەستهێنانی حوکمی سەربەخۆ. لەم سۆنگەیەوە شەریف پاشا بەسەرۆکایەتی شاندێک ڕوویکردە پاریس بۆ ئامادەبوونی کۆنفراسی ئاشتی لە پایتەختی فەرەنسادا، هەر لەوێشدا توانی بەڵێنامەی سێڤەر (کە لە ١٠ ئابی ١٩٢٠) مۆرکرا بخاتە بەردەم کۆنفراسەکە. بەپێی بەندەکانی ئەم بەڵێنامەیە. دەبوایە کوردستانێکی سەربەخۆ لە ویلایەتی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا دامەزرایەت و کوردەکانی ویلایەتی موسڵیش بۆیان هەبوو ببن بە بەشێکی.

## بەشی چوارەم

کاتێ کە پەیمانی شەڕوەستان لە نێوان هاوپەیمانیەکان و تورکیا لە مودرۆس "mudros" لە ٣٠ ئۆکتۆبەری ١٩١٨*دا مۆرکرا، هێزەکانی بەریتانی، ٤٠ میل لە باکووری موسڵدا، کەوتبوونە دووی سوپای تورکی دۆڕاو. لەهەمان کاتیشدا بەریتانیەکان جادەڕێی نێوان کفری و ئاڵتوون کۆپریان کۆنترۆڵ کردبوو، هەندێ شارۆچکەش لەسەر ئەم ڕێگەیە بوون. داوا لە سوپای تورکی کرابوو کە هێزەکانی هەموو ویلایەتی موسڵ، لە ماوەی دوو هەفتەدا، هەموو ویلایەتی موسڵ چۆڵکات.

سیاسەتی ئەوسای بەریتانی هەڵقوڵاوی گرنگیە سەربازیەکان بوو، لەهەمان کاتیشدا پەیڕەوی تەواوی گیانی نموونەیی ئەو سەردەمەی دەکرد. لە سەرەتادا خۆی لە شاخەکان بەدوور گرت، زیاتر هەندی ناوچەی نیمچە سەربەخۆی کوردی لێدامەزراندن بەهیوای ئەوەی لە دوارۆژدا بیان بەستێتەوە بە

ئیدارەی دەستووری کە لە دەشتەکاندا، هەرچۆنێک بن، دادەمەزرێن.

تەنانەت لەپێش ڕۆژی ئاگربەستدا پەیوەندی بە شێخ مەحمودێکی ناسراوەوە کرابوو، ئەم شێخە پێشەوای خێزانی «سەید»ی کوردستانی باشوور بوو. زانیاری پێدرابوو کە هەچ گروپێک یان عەشرەتێک کە لە هەر ٣ لیوای سلێمانی، کەرکوک و هەولێر بژی بۆی هەیە لەژێر ئیدارەی شێخدا بێت ئەگەر خۆیان لاریان لێنەبوو. ئەو بەڵگەیە زوو دەرکەوت کە شێخ خۆشەویستیی جەماوەری بە زۆرتر هەڵسەنگاندوە وەک لە ڕاستیەکەی، ناوچەکەی خۆشی کەمێک زیاتر لە سلێمانی تێدەپەڕی، هیچ هەنگاوێکی دەست پێشکەری لەم شێوەیە، لە لیوای موسڵ نەنرابوو، چونکە هەڵوێستێکی یەکگرتووی کورد لەوێدا نەبوو. یەکەم تاقیکردنەوەی کورد لە ئۆتۆنۆمیدا سەرکەوتوو نەبوو لە هەلومەرجی تـازەدا، لە مـاوەی شەش مانگدا شێخ ناڕەزایی لە سنووورداریتی دەسەڵاتی خۆی دەربڕی، ئەیویست چی پێخۆشە ئەوە بکات و یاخی بوونی دەستپێکرد. دوابەدوای ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی کورت خایەن، دەستگیرکرا و دوورخرایەوە و لیواکەشی خرایە ژێردەستەڵاتی ڕاستەوخۆی داگیرکەرەوە.

وەلێ بە دوور لە خواستی شەخسی شێخ مەحموود، هەمیشە لەناو هەموو چینەکانی شاری سلێمانی، قایلبوونێک دەردەکـەوت کە گوایە شارەکەیان هەوێنی بووژانەوە و درێژەپێدانی دەوڵەتێکی کوردیە کە سلێمانی بۆ خۆی پایتەختی بووە. ئەم باوەڕە لەسەر بنەمایەکی بەهێز نەچەسپابوو، نە بەڕواڵەت وابوو، نە لە ڕووی بازرگانیەوە ئەوەندە گرنگ بوو، نە دەستکەوتی ئەکادیمی پێوە دیاربوو وە نە هاوڵاتیەکانی خاوەنی ئەزموونێکی سیاسی ئەوتۆ بوون، بەڵام ئەم سەودایە هەمیشە لە سەریاندا بوو. لـەبـەرئـەوە ئـەو پێشنیارەی کـە سلێمانی و دەوروبەرەکەی جاریکی تر دەکرێنە ناوچەی حوکمی زاتی بە کارێکی زۆر ئاسایی لە لایەن دانیشتوەکانیەوە وەردەگیرا.

بەلای پێشەوا سیاسیەکانی ترەوە، ڕوخانی مەحموود نەبوو بەهۆی ئەوەی حاشا لە پاداشتی بریقەداری سیڤەر بکەن کە تـەواو لە خواستەکانیان نزیک بووبووەوە. دڵنیاییەکی تەواو لە لایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە درا بە کوردەکان کە گوایا ناچار ناکرێن لەژێر حوکمی عەرەبدا بن ئەگەر خۆیان حەزیان پێنەکرد،کاتیک حکومەتی نیشتیمانی عێراقی، لە نۆڤەمبەری ١٩٢٠ دامەزرێندرا، سلێمانی لەژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی کۆمیشنەری باڵای بەریتانیادا مایەوە.

کـەرکـوک (کـە ئـەوسـا هەولێریشی دەگـرتـەوە) موتەسەریفێکی قوبووڵ کرد کە لە لایەن حکومەتی تازەی بەغداوە دەستنیشان کرابوو، وەلێ ئەم پیاوە، وەکو فەرمانبەرەکانی، خەڵکی شارەکە بوو، زمانی تورکی، کە زمانی چینی ڕۆشنبیر بوو — نەک زۆربەی دانیشتوانی شارەکە – بەردەوام لە کاروباری ئیداریدا بەکار دەهێنرا.

کاتێ کە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١ دا ئەمیر فەیسەڵ وەک کاندیدی پاشای عیراق، لەژێر سایەی بەریتانیادا گەیشتە عێراق، سلێمانی بەشداری نەکرد لە ڕیفراندۆمێکدا کە بۆ ئەو مەبەستە سازدرابوو. کەرکوک بەشداری کرد وەلێ زۆربەی دەنگدەران دژ بەم کاندیدە وەستان. هیچ نوێنەرێکی ئەم دوو شارە ئامادەی ئاهەنگی تاج لەسەرنان نەبوون.

ئەم بارودۆخە ناهەموارە ئەوەندەی تر ئاڵۆزکا، هۆکارەکەی بـڵاوبـوونـەوەی ئـەو بەیانە بـوو کە کابینەی تورکی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ دا بە ناوی ڕێکەوتنی نیشتیمانی (National pact) دەریکرد. لە کاتێکدا کە حکومەتی تورکی داندەنێ بە مافی چارەنووسی عەرەبەکانی باشووری



**ئەم شێخە پێشەوای خێزانی "سەید"ی کوردستانی باشوور بوو. زانیاری پێدرابوو کە هەچ گروپێك یان عەشرەتێك کە لە هەر ٣ لیوای سلێمانی، کەرکوك و هەولێر بژی بۆی هەیە لەژێر ئیدارەی شێخدا بێت ئەگەر خۆیان لاریان لێنەبوو. ئەو بەڵگەیە زوو دەرکەوت کە شێخ خۆشەویستیی جەماوەری بە زۆرتر هەڵسەنگاندوە وەك لە ڕاستیەکەی، ناوچەکەی خۆشی کەمێك زیاتر لە سلێمانی تێدەپەڕی**

هێڵی ئاگربەستی ١٩١٨، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە باس لە تەسلیم کردنی ویلایەتی موسڵ بکات.
ڕێکەوتننامەی سیڤەر، کە دوای نۆ مانگ نوێنەرانی سوڵتان مۆریانکرد، ڕۆژێ لە ڕۆژان نەخرایە بواری جێبەجێکردنەوە. تا پێنج ساڵیش دوای ئەم بەڵێننامەیە، کورد بووبوو بە مادەیەک بۆ پڕوپاگەندەی چڕوپڕی تورک، هەڕەشەی داگیرکردنیان دەکرا، پەیوەندی نهێنی دەکرا بە پێشەوا مەدەنیەکان و خێڵەکیەکانەوە، هاندەدران کە یاخی ببن، هەڕەشەوگوڕەشە دەکرایە سەریان گوایە خائینن، لە هەمووی بەدتر بانگەوازی ئاینی بوو کە دەیانگوت دەبێ هەموو تاعەتی خەلیفە بکەن و سوڵتان خەلیفەی ئیسلامە (بە هەرحاڵ ئەم خیلافەتە لە ئازاری ١٩٢٤ دا ڕووخا).
گروپی بچکۆلە بچکۆلەی سەربازی تورک، بە بەرگی مەدەنیەوە، لە گەلێ خاڵەوە سنووریان

دەبەزاند و دەهاتنە ناو عێراقەوە و هانی عەشیرەتە وردووژاوەکانیان دەدا. سنووری ئیدارەی هەولێر و بەشێک لە موسڵ هێنرانەوە دواوە بۆ دەشتەکان. لە ئەیلولی ١٩٢٢ دا سلێمانی بە تێکڕا چۆڵکرا. شێخ مەحموود گەڕێنرایەوە بۆ سلێمانی بەو مەبەستەی کە تورکەکان لە لیواکەی دەرکات و بەو مەرجەی دەستیوەردانی لیواکانی کەرکوک و هەولێر نەکات. بەڵام هەر ئەوەندەی بە هەوای چیا بەرزەکان کەیلومەست بوو، دەستبەجێ هەموو ئەم بەڵێنانەی لە بیر چووەوە. لە مانگی نۆڤەمبەردا خۆی ناونا مەلیکی کوردستان. داوای هەموو وڵاتەکەی کرد کە تا لە دامێنەوە دەگاتە جەبەل حەمرین بخرێتە سەر مەملەکەتەکەی.

لەباتی ئەوەی، وەک بەڵێنی دابوو، تورکەکان دەرکات، کردنی بە بیانوو بۆ بەدەستهێنانی مەرامەکانی. لە مانگی دیسێمبەردا، بەریتانیەکان و حکومەتی عێراقی، بەهیوای کۆکردنەوەی کوردە میانڕەوەکان و هاندانیان بۆ بەگژاچوونی دەستدرێژیکەر، بەیانێکی هاوبەشیان دەرکرد و ئاراستەی پێشەوا کوردەکانی سەربەخۆیان کرد و دەستنیشانی مافی کوردەکانی عێراقیان بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی کرد، دەبوایە ئەم حکومەتە بەزووی شاندێکی لێهاتووی بناردایە بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ لەسەر سنوور و پەیوەندیە ئابووری و سیاسیەکان. بەڵام کەس نەبوو بوێرێ ئەم پێشنیارە قوبووڵ بکات و پرۆژەکە سەری نەگرت.

بە ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی نێوان هاوپەیمانیەکان و تورکیا لە گەلاوێژی ١٩٢٢دا تەوژمی دوودڵی و نائارامی بەهێزتر کرد، بەتایبەتی دۆزی ویلایەتی موسڵ لەم ڕێکەوتنە بەدەربوو. لە ساڵی ١٩٢٤دا ئەم هەرایە گواسترایەوە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم). شاندێک نێردرا بۆ سەرنجدان لە شوێنی خۆیدا، لە دیسەمبەری ١٩٢٥دا ئەنجومەنەکە بڕیاری دا ئەم ویلایەتە بخاتە سەر عێراق. عێراقیش دەبێ گەرەنتی ئەوە بدات کە ڕێز لە خواستی کوردەکان بگرێ. بەرپرسەکانی وڵاتی کورد دەبێ کورد بن و خۆیان ئیدارە بەڕێوەبەرن، دادگا و قوتابخانەکان دەبێ بەدەست خۆیانەوە بێت، ئەم خزمەتگوزاریانە دەبێ هەموو بە زمانی کوردی بن. حکومەتی تورکی لە سەرەتادا ئەم بڕیارەی ڕەتکردەوە. بەڵام بە سێ قۆڵی حکومەتەکانی بەریتانیا و عێراق و تورکیا، لە حوزەیرانی ١٩٢٦دا ئەم ڕێکەوتنە ئیمزا کرا و تورکیا وازی لە سەروەری ویلایەتی موسڵ هێنا. ئیدارەی هەرسێ لیوا کوردەکان خرایە پاڵ حکومەتی بەغدا بەڵام دەبوایە ڕەگەزە فەرمیەکان و زمانی ڕەسمی کوردی بوانایە.

هەڕەشە و گوڕەشەی تورک هێشتا کۆتایی نەهاتبوو، گومانێکی گەورەتر بۆ پێشەوا کوردەکان خولقا، دەسەڵاتی بەریتانی بەسەر عێراقدا هاتە کۆتایی. کورد گومانی لەوە دەکرد لەو بەڵێنانەی کە پێیان دراوە. سکاڵا ناردنیش بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان بە خیانەت لە قەڵەم دەدرا (لە لایەن حکومەتی عێراقەوە؟ -وەرگێڕ) لە هەردوو ساڵانی ١٩٣٠ و ١٩٣١دا ژمارەیەک لە ڕۆشنبیرە پایەدارەکانی کورد لە بەندینخانە توندکران.

کە کاتی ئەوە هات داواکاری عێراق بۆ (عصبة الامم) هەڵسەنگێندرێ، لە ساڵی ١٩٣٢دا ئەنجومەن داوای بەڵگەنامەیەکی نوسراوی لە حکومەتی عێراق کرد کە ڕێز لە مافەکانی گەلی کورد، وەک ئەوەی لە ڕێکەوتننامەکاندا هاتوە، بگرێ و ئەم مەرجە بکرێ بە مادەیەکی دەستووری بۆ ڕێزگرتن لە مافەکانی کەمایەتیەکان. یاسایەکی تایبەت بۆ زمانی کوردی و تورکی، هەریەکە لەو شوێنانەی کە تیایدا دەژین و زۆرینە پێکدێنن، واژووکرا. بەپێی ئەم یاسایە ئەم دوو زمانە لە ئیدارە و دادگا و خوێندنی سەرەتاییەکاندا بەکاردەهێنرێن.

چەند ساڵێک دوای ئەم ڕووداوانە، دەرخستنی هەستی ناسیۆنالیزمی سستی بەخۆوە بینی لە عێراقدا. سەختی واقیع و تاڵی ڕاستیەکان، پێشەواکانی خستە بەردەم ئەو ڕاستیەوە کە بەدەستهێنانی مافەکانیان مەحاڵە ئێستە یان لە داهاتویەکی نزیکدا ڕووبدات. زۆربەی زۆریان ئارامگیر و بێدەنگ بوون، هۆشی نەتەوایەتیان جڵەودار کرد، پێدەچێت، هەرچەندە بیرۆکەیەکی لێڵ و تەمومژاویە، کە کێشەکانیان بە زەمانە سپاردبێ و ڕۆژێک بێت دەرفەتێکی باشتر بڕەخسێت بۆ کوڕەکانیان یان بۆ کوڕەزاکانیان. واتە لە ئێستادا گێرەشێوێنی هیچ سوودی نابێ ئەگەر زەرەری نەبێ.

لە ماوەی ئەو ساڵەی پێش هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم، نیشانە هەبوون کە دەزگای دیبلۆماسی ئەڵمانی لە بەغدا پڕوپاگەندە بڵاودەکاتەوە، بە تایبەتی لەناو گەنجە فەرمیەکانی حکومەتدا، گرنگیان بەوە دەدا کە حکومەتی بەریتانی، دوابەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، خیانەتێکی گەورەی لە کورد کرد، وەلێ ئەڵمانیای سەرکەوتوو لە داهاتوودا ئامادەیە بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ.

بەڵام پاش ئەوەی پێکدادانی ڕاستەقینە ڕووی دا، کوردە بەتەمەنە واقیع ناسەکان درکیان بەوەکرد کە هیچیان دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو هەموو عەرەبانەدا ناکات لەبەر خاتری گەلێکی وەکو کورد کە هیچ ئەهەمیەتێکی نێودەوڵەتی نیە، وایان بەلاوە باش بوو کە لەسەر هیچ لایەنێک نەکەنەوە.

لە بەهاری ١٩٤١دا، کاتێ کە ڕەشید عالی گەیلانی کودەتایەکی سەربازی دژ بە وەسی و حکومەتی شەرعی سازدا. شێخ مەحموود وەک دورخراوەیەکی شەرەفمەند لە بەغدا دەژیا، بە نهێنی بەغدای بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ کوردستان، لەوێدا توانی پشتگیری کۆمەڵی گەنج دەستەبەر بکات. بۆ ئەنجامدانی شۆڕش توانی عەشرەتەکان لەخۆی کۆبکاتەوە. بیرۆکەی شۆڕشەکەی ئەوەبوو کە (عەرەب جێی باوەڕ پێکردن نیە) بوو بە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر، هاوپەیمانیەکان چیدی لەوە دوودڵی ناکەن کە مافەکانی کورد بدەن. بەڵام بە هێنانەوەی وەسی، هاوڕی پشت ئەستوورەکەی هاوپەیمانیەکان، شۆڕشگێڕەکان، هەموو گوڕ و تینێکیان لە دەست چوو.

## بەشی پێنجەم

(چیت لێ دەکرێ تۆش وایان لێبکە) ئەو قسە باشە نیە کە لەوە دەچی گەلانی ژێر دەستە پەنایان بۆ بردبێ، لە ئاسیادا یاخود لە ئەوروپادا بێ، ئەو گەلانەی کە لە ساڵی ١٩١٨دا ڕزگارکران* ئەم بیرۆکەیەیان هەبوە و عەرەبەکانی عێراق لەم نموونانە بەدەرنەبوون. تەنانەت لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، هەرسێ ویلایەتەکە یەک یەکەیان (Unit) پێکدەهێنا.

لە وتووێژەکانی بەرپرسە بەریتانیەکاندا، عەرەبی تورکیا و پڕۆژەی جیاکردنەوە لەسەر ئاستی ڕەگەز هەرچەندە هاوجووتی هێڵی خواستەکانی کەمایەتیەکان بوو، بەڵام پەسەند نەدەکرا، لە شوێنانی تردا زۆرینەش دووچاری ڕەتکردنەوە دەبوون.

مشتومڕ لەسەر ئەوەبوو کاتێک کە پێشنیاری دانپیانان بە کوردەکاندا وەک گەلێک دەکرا، نەک وەک تاکەکەس کە لە هەموو شوێنێکدا بڕی مافی مەدەنیان هەیە، دەیان وت: ئاخر کوردەکان بەزۆری لە دەرەوەی سنووری عێراق دەژین و ئەگەر ئێمە ماف بەم کەمینەیە بدەین ئەوساکە داوای جیابوونەوە و بەستن بە کوردستانی گەورەوە دەکەن، لە هەمان کاتیشا مەیلی گروپی تری ئەتنی و ڕەگەزی و ئاینی بۆ هەمان دەسکەوت دەبزوێنێ.

لە تەرەفی کوردەکانەوە، تەواو جیاواز لە

نابەدڵیەکەیان کە ژێردەستەی عەرەبەکان بن، ئەو عەرەبانەی پێشتر وەک خۆیان ژێردەستەی تورکەکان بوون، هەست بەوە دەکەن کە ئەو گەرەنتیانەی بە (عصبة الامم) دراوە بە مەبەستی زامن کردنی مافە بنەماییەکانی کورد بوو لە عێراق و لە ساڵی ١٩٢٥و لە ساڵی ١٩٣٢دا داکۆکی لەسەر کراوەتەوە یا پشتگوێخراون یاخود بە ناتەواوی جێبەجێکراون.

ئامارەکان دەتوانن ئەوە بسەلمێنن کە ناوچە کوردنشینەکان، بە شێوەیەکی عادیلانە نە خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی تۆکمەیان بەرکەوتووە نە پرۆژەی گەشەکردن. شکستهێنان لە بەرهەمهێنان و دابەشکردنی کتێبی کوردیدا بووبوو بە گاڵتەچاڕی ڕێنمایی دەرکردن و پەیڕەونەکردنی، سکاڵای ئەوەش لە ئارادابوو کە قوتابخانەکانی ناوچە کوردیەکان لە هەردوو ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە کەموکوڕ بوون.

کوردەکان، لەوەش سکاڵایان دەکرد کە قوتابیە دەرچووەکانیان لە پەیمانگا باڵاکان وەرناگیرێن و زەمالەی خوێندنی دەرەوەی وڵاتیان نادرێتێ. بەشی فەرمانگەی ئاودێری — کە مەسرەفێکی زۆری بۆ دابین کرابوو — لە باکووری وڵاتدا، هەرگیز بوونی نەبوو. لە میانەی ئیشوکاری گشتیدا، شکات لەوەدەکرا کە تەنها پۆستی پۆلیس دەدرێ بە کورد. ڕاستیەکی زەقی تر ئەوە بوو کە جادە لێدان بە ماوەی چەند ساڵێک ڕاوەستێنرابوو، هۆکارەکەشی ستراتیژی بێ ورەی وەزارەتی بەرگری بوو کە کردنەوەی ڕێگای بە ئاسانکاری بۆ دەستدرێژیکەران لە قەڵەم دەدا نەک بۆ تۆکمە کردنی کاری ئیداری و قازانج گەیاندن بە میللەت.

ئەو سکاڵایەی دەدرایە (عصبة الامم) و شوێنانی تر لە بابەت ئەوەوە بوو کە ئیدیعای حکومەتی عێراقی، گوایە بە یەکسانی پۆستی وەزاری بە کورد دەدرێ، بێ بنەمایە و کارەکە ناپاکانە دەکرێت چونکە ئەو کوردانەی دەکرێن بە وەزیر کە بە پشتێکی دوور کوردبوون، نەوەی ئەو خێزانانەن کە لە مێژەوە کوردستانیان بەجێهێشتوە و زیاتر سۆزیان بۆ عەرەب هەیە وەک لە کورد.

بەو ڕادەیەی کە ئەم ناڕەواییە خاوەنی هەندێک بنەمایە، قسەشی زۆر لەسەرکراوە و ئەم حاڵەتی زاڵ بوونە دەگەڕێتەوە، بەشێکی بۆ بارودۆخێکی سیاسی کە لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتدا نیە و بەشەکەی تری بەهۆی نائارامی کوردەکان خۆیانەوەیە کە ماوەیەکی زۆر ئیدارەی حکومەتیان لە ناوچەکانی خۆیاندا لە پەلوپۆ خستبوو.

گومان لەوەشدا نیە کە یەکێ لە هۆکارەکانی پشتگوێ خستن، بەهۆی ڕق و کینەوە نیە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوو و حەزی خەڵکی کە دەیانەوێ لە ناوەڕاستی وڵاتدا ئیش بکەن نەک لە ناوچە دوورە دەستەکاندا. ئەم حاڵەتەش هەرچۆنێ بووبێ. ئاکامەکە لەوەوە بوو، ئەو کەسەی زووتر ئاشووبەچی بوو، بوو بە دەستەڵاتداری حکومەت لە تەمەنی پیریدا و ئەزموون هێمنی کردۆتەوە و چیدی جیابوونەوە نە بە گونجاو و نە بە پەسەندکراو دەزانێ، لە هەمان کاتیشدا جیلێکی تازە دێنە پێشەوە کە هەست بە کۆیلەیی و نیگەرانی دەکەن.

ڕق و کینە خەستتر دەبوەوە کاتیک سوکایەتی بە مەرجەعەکانی کەمایەتیەکان دەکرا لەلایەن وتەبێژانی (وڵاتی گەورەی عەرەب) کە خۆیان بە شکۆمەند ڕادەگرت و هەستی خەڵکانی کەمایەتیەکانیان بریندار دەکرد. لە هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ڕۆژئاواییەکان وا ڕەچاو دەکران کە پاڵپشتی پاشا و بەگە کۆنەپەرستەکان دەکەن کە بۆ خۆیان بەشی گەورەی دەسەڵاتی سیاسی وڵاتیان گرتبووە دەست (ئەم تۆمەتانە عادیلانە نیە بەڵام ئەم باسە زۆر درێژ دەکاتەوە ئەگەر لەم بارەوە بدوێین).

چاوەڕێی ئەوە دەکرێ کە گەنجە داخ لە دڵەکان ( بە تایبەتی گەنجانی کورد کە وێڕای مەینەتیی هەست بە جیاوازی ڕەگەزی دەکەن) ڕووبکەنە ڕووسیا بۆ

بەدەستهێنانی ئاواتەکانیان. لە مێژە ڕووسەکان، لە ناوچەی قەوقاس دراوسێی کوردن و وەکو دەیبینین پارچەیەکی گچکەی کوردستان دەکەوێتە ناو سنووری یەکێتی سۆڤیەتەوە. تەنانەت پێش ساڵی ١٩١٨ەش، ئەو کوردانەی کە لە حوکمی تورکەکان و فارسەکان بێزار بوون، وا ڕاهاتبوون کە ڕوو بکەنە ڕووسیا بۆ دالّدەدانیان.

لێرەشەوە دەزانین کە کەڵک وەرگرتن لە جموجۆڵی کوردەکان لەلایەن ڕووسەکانەوە شتێکی تازە نیە. لە ڕاستیدا، بۆ بەراوردکردن دەتوانین ئەوە بهێنینەوە یاد کە لەم دواییەدا ڕووسەکان یارمەتی (کۆماری کورد)یان لە مەهاباد لە کوردستانی ئێران دەدا، ئەم کۆمارە ماوەیەکی کورت ژیا. بە هەمان شێوە لە ساڵی ١٩٤٧ دا، پێشوازیان لە مەلا مستەفای بارزان، شۆڕشگێڕی هەڵاتووی عێراقی کرد و لە ئەرمینیای سۆڤیەتی ڕێزیان لێگرت و ڕوتبەی سەربازی بەرزیان پێبەخشی و هانیاندا کە پەخش بە زمانی کوردی لە ڕادیۆی ئەریڤانی پایەختی ئەرمینیاوە بکات.

وەلێ بە تێپەڕبوونی هەموو ساڵێک، کۆمەک کردن لەگەڵ شۆڕشی چەکداریدا لە عێراق دا نەگونجاوتر دەبێ. چینی بازرگانەکان درک بەوە دەکەن کە لەڕووی ئابووریەوە دەست و قاچیان بەستراوە بە بەغداوە، لەبەرئەوە پەرۆشی ئەوتۆیان نەبوو بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە باکووری عێراقدا. لەپاڵ ئەم ڕاستیەشدا، پرۆگرامی گەشەپێدان کە ئێستە بەڕێوەیە کاریگەری ئەوەی هەیە کە هەموو وڵات پێکەوە ببەستێتەوە. ئێستاکە شێخەکانی ئاین و سەرۆک عەشیرەتەکان ناتوانن وەک جاران خۆیان بکەن بە پێشەوا و بە پێوەرێکی بەرچاو پشتگیری بۆ کاری توندوتیژ دابین بکەن. داهێنانی چەکی پێشکەوتووی سەردەم زاڵبوونێکی بەرچاوی بەخشی بە هێزەکانی حکومەت، بە بەراورد لەگەڵ چەکدارە خێڵەکیەکاندا کە تەنها تفەنگ و تەقەمەنی کەمیان هەیە. بە هاتنەناوەوەی فڕۆکەی جەنگی و ئۆتۆمبێلی زریدار بۆ گواستنەوە، باڵادەستیان لە خەڵکی ناوچە شاخاویەکان سەندەوە.

پیرە سەرسەختەکان کە هێشتا لە ژیاندا ماون، بەرامبەر ژیانی خۆشگوزەرانی شار نەرمبوونەتەوە و حەز بە ژیانی خۆش دەکەن. کوڕەکانیشیان کە زۆربەی زۆریان خراونەتە بەرخوێندن لە قوتابخانەکانی حکوومەتدا، بەرەبەرە پابەندی دامەزراندن دەبن (وەکو هەموو چینەکانی تر) لەلایەن حکومەتەوە. گێرەشێوێنەرانی ناسیۆنالیستی لەوانەیە ڕووبکەنە کەڵک وەرگرتن لە نائاسوودەیی جوتیاران، لەمە بەدەر، مەگەر تەنها لە بازنەیەکی تەسکی نهێنیدا بجووڵێن کە پێی دەڵێن (کۆمۆنیست)، جاروباریش هانی قوتابیان و بێ ئیشەکانی ناو بازاڕ دەدەن.

عێراق، بە هەموو کەمووکوڕیەکیەوە و بەو هەڵانەی لە ڕابـوردودا تیایدا ئەنجامدراوە، وڵاتێکە بوونی کوردی، وەکو خۆی، تێدا ناسراوە و بە فەرمی دانی پێدانراوە. لە سلێمانی و هەولێر نەک هەر کوردی زمانی فەرمیە،بەڵکو هەموو کەش و هەوای ئیداری لەم دوو شارەدا کوردیە.

هەستکردن بـەوەی کە کەوتووبێتنە ژێر ڕکێفی بیرۆکراسیەکی تێ نەگەیشتووەوە لە دوورە پایەخت، لە بەغدا، بەم پێوەرە تازانە هۆگر کراوەتەوە. پێوەرەکان بەسەر هەموو وڵاتدا پراکتیزە دەکرێن. بە پێی یاسای ئـیداری تـازە، پـارەی کۆکراوە دەخرێتە ژێر دەستی ئیدارەی ناوچەکانەوە و بەپێی پێداویستی مەحەلی سەرف دەکرێن.

هەرچەندە کورد لە ڕابردوودا دەستوپێ بەسترابوو، ئێستە بەرزترین پۆستیان هەیە. ئەو ڕۆشنبیرەی کە لە ساڵی ١٩٣١ خرابوە بەندیخانەوە ئێستا وەزیری پەروەردەیە.

سەرچاوە: گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ـ ویلایەتە یەکگرتووەکان ـ وەرزی زستانی ساڵی ١٩٥٧

# ئەدەب و هونەر

* سیستمی نوێی جیهانی
* هاوڕێکان
* مەرزەکان...
* مادمازێل کەتی
* ئەفسانەی ئینانا و ...
* لەشم بە دەریا بسپێرن
* خەونی مرۆڤی پێکەنیناوی
* نامەی ریچارد داوکینز...

و. لە فارسیەوە: مەجید ساڵح

و. لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

و. لەئینگلیزییەوە:شێرزاد حەسەن

و. لەفارسییەوە: کەژاڵ ساڵحی

و: لەفارسییەوە: لەیلا ساڵحی

و: لەفارسییەوە: یوونس ڕەزایی

و: لە ڕووسییەوە، ئارام کاکەی فەلاح

وەرگێڕانی : ڕێبوار عارف

# سیستمی نوێی جیهانی

# The New World Order

نووسینی: هارۆڵد پنتەر

و. لە فارسییەوە: مەجید ساڵح

(پیاوێک کە چاوی بەستراوەتەوە لەسەر کورسیەک دانیشتوە. دوو پیاو (دس و لیوئیل) سەیری دەکەن)

دس: ئەتەوێت شتێک سەبارەت بەم پیاوە بزانی؟

لیوئیل: چی؟

دس: کابرا هەر بەخەویش نازانێ ئێمە دەمانەوێت چی پێبکەین.

لیوئیل: بەڵێ، بە خەویش نایبینێ.

دس: بەڵێ، هەر بە خەویش نایبینێ. ئەم زنجیرە کارانەی کە لەوانەیە ئێمە پێی بکەین، هیچ بەخەویش نایبینێ.

لیوئیل: ئەو کارانەی کە ئێمە دەمانەوێت پێی بکەین.

دس: ئەو کارانەی کە ئێمە دەمانەوێت پێی بکەین.

(وەستان)

دس: باشە، هەڵبەت ئێمە هەندێک لەو کارانەی پێ دەکەین.

لیوئیل: لەوانەشە هەمووی پێ بکەین.

دس: بەو جۆرە لەوانەیە بێ سود بێت.

لیوئیل: بێمانایە.

(سەیری پیاوەکە دەکەن، ئارامە)

دس: بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو لێرەیە، لێرەیە و بەقەد نوکە دەرزیەکیش نازانێ ئێمە دەمانەوێت چی لێبکەین.

لیوئیل: هەڵبەت لەوانەیە بە قەد نوکە دەرزیەک بزانێ.

دس: شتێکی زۆر نادیار، بەڵێ. لەوانەیە.

(دس بەسەر پیاوەکەدا دەچەمێتەوە)

دس: ئەزانی؟ بۆ خۆت چی دەڵێی؟

(دەوەستێ)

دس: بەڵێ با بەم جۆرە بیڵێین. ئەو شتێکی کەم سەبارەت بەو کارەی لەوانەیە ئێمە پێی بکەین دەزانێ، لە راستیدا ئەو کارەی کە دەمانەوێت پێی بکەین.

لیوئیل: یان لەگەڵ ژنەکەیدا. ژنەکەیت لە بیر نەچێ. ئەو شتێکی کەم سەبارەت بەو کارەی لەوانەیە ئێمە







هارولد پنتەر

له گەڵ ژنەکەیدا بیکەین دەزانێ.

دس: باشە، لەوانەیە شتێک بزانێت، ئەگەری ئەوەیە هەیە گەیشتبێتە هەندێک شت. ئاخر ئەو رۆژنامەی خوێندوەتەوە.

لیوئیل: کام رۆژنامە؟

(وەستان)

دس: ئەویش قسەیە.

لیوئیل: ئەم «گزگڵ»ە کێیە؟ چی کارەیە، لادێییە یان ئوستادی ئەدەبیات؟

دس: ئەمە ئوستادێکی ئەدەبیاتی زباڵەیە.

لیوئیل: ئەی ژنەکە؟

دس: خۆ ژنان حەزیان لە ئەدەبیات نییە.

لیوئیل: ئاە، نەمدەزانی. من هەمووجارێک لە گەڵ دایکمدا لەسەر ئەو مەسەلەیە دەبوە دەمەقاڵەمان، تەقریبەن هەمووجارێک.

دس: کام مەسەلە؟

لیوئیل: ئاە خۆت دەزانی، مەسەلەی مێینە و حەزکردنیان لە ئەدەبیات.

(وەستان)

دس: دایکت چیدەوت؟

لیوئیل: دەیوت...

دس: چی دەوت؟

(وەستان)

لیوئیل: لەبیرم نەماوە.

(دەگەڕێتەوە بۆ لای پیاوی سەر کورسیەکە)

لیوئیل: چەپەڵ

دس: نارەسەن.

(بەدەوری کورسیەکەدا دەسورێتەوە)

لیوئیل: ئەزانی بەلای منەوە چی لە هەموو شتێک زیاتر مرۆڤ بێ ئومێد دەکات؟

دس: چی؟

لیوئیل: ئەوەی کاروبارمان کەوتوەتە دەست کۆمەڵە خەڵکێکی نەزان... یەکێکیان ئەم ناپیاوە درێژی نەزانەیە.



دس: دواین جار پێت وت گزگڵ.

لیوئیل: چی؟

دس: دواین جار پێت وت گزگڵ. ئێستاش پێی دەڵێی گونە. چەند جار پێت بڵێم؟ دەبێ ئەو وشانەی بەکاری دەهێنی باش بناسی و ئەنجا بەکاری بهێنیت. نابێت جارێک پێی بڵێت گزگڵ و جارێکیش گونە. ئەو دوو وشە لە زمانەوانیدا جیاوازن. تۆ لە زمانەوانیدا بەقەد کەرێک نازانی. چیت پێدەڵێم لە گوێی بگرە.

لیوئیل: من تێناگەم؟

دس: بەڵێ وایە. تۆ کە نایزانی سودی چیە بۆت. تۆ کە دەزانی قسەکردن چ سودێکی بۆت هەیە.

لیوئیل: بەڵێ، دەزانم.

دس: بەڵێ دەبێ بزانی. وەک ئەم کابرایە سەیریکە. ئەمە نمونەیەکی پلە یەکە. تێدەگەی چی دەڵێم؟ پێش ئەوەی بگاتە ئێرە پیاوێکی سەرزل بوو، هەرپرسیارێک بە مێشکیدا بهاتبایە دەیکرد. ئێستا ـ لەبەرئەوەی نێگەرانی ئەو شتەیە کە بەسەریدا دێت ـ کپ و دامرکاوەتەوە، هیچی بۆ وتن پێ نییە. دەمەوێ بڵێم تا ماوەیەک پێش ئێستا پیاوێکی خاوەن ئیمان بوو، پیاوێکی بە ئەخلاق، بەڵام ئێستا چییە؟ تەنها لاق درێژێکە.

لیوئیل: یان گزگلێک.

دس: هێشتا کارمان پێی ماوە. بگرە هەر دەستمان پێ نەکردوە.

لیوئیل: بەڵێ، هێشتا کارمان پێی ماوە. بگرە هەر دەستمان پێ نەکردوە. باشە، دەستمان پێ نەکردوە.

دس: دوای ئەوەش نۆرەی ژنەکەی دێت.

لیوئیل: بەڵێ. هێشتا کارمان پێی ماوە. بگرە هەر دەستمان پێ نەکردوە. باشە، دەستمان پێ نەکردوە.

دوای ئەوەش نۆرەی ژنەکەی دێت.

دس: ئەسڵەن دەستی پێنەکردوە.

(لیوئیل دەست دەخاتە سەر دەموچاوی و دەست بە گریان دەکات)

دس: ئێستا تۆ بۆ دەگرێت؟.

لیوئیل: حەز دەکەم حەز دەکەم. حەز دەکەم.

(خۆی بە شانی دیسدا ئاوێزان دەکات)

لیوئیل: سەیرەکە. دەبێ شتێکت پێ بڵێم. دەبێ پێت بڵێم. ناتوانم بە کەسی دیکەی بڵێم.

دس: باشە. بیڵێ. چییە؟ بە من بڵێ؟

(وەستان)

لیوئیل: هەست دەکەم من زۆر پاکم.

(وەستان)

دس: باشە حەقی خۆتە. حەقی خۆتە هەست بە پاک بونی خۆت بکەی. دەزانی بۆ؟

لیوئیل: بۆ؟

دس: چونکە تۆ لە پێناوی دیموکراسی و یەکسانیدا هەموو شتەکان دەکوژی.

(سەیری چاوەکانی یەکتری دەکەن)

دس: حەزم لێیە تەوقەت لە گەڵدا بکەم.

(دس تەوقە لە گەڵ لیوئیلدا دەکات. دوایی زمان لەو پیاوە دەردێنێ کە لە سەر کورسیەکە دانیشتوە)

دس: ئەو ناپیاوەش دێتە سەر خەت.... (سەیری سەعاتەکەی دەکات).... نزیکەی سی و پێنج دەقەی دیکە...

# هاوڕێکان

**نووسینی: دینو بوتزاتی**

**و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد**

دەربارەی نووسەر:

بوتزاتی (١٩٠٦-١٩٧٢) لە نووسەرە بەناوبانگەکانی ئیتالیایە، دوای تەواوکردنی زانکۆی میلان ڕووی لە ئەدەبیات کرد، زۆر بە گەنجی شیعریی نووسی، لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا بووە هەواڵنێری ڕۆژنامەی کوریرە دیلاسرا، پاشان دەبێتە هەواڵنێری جەنگ لە هێزی دەریایی ئیتالیادا. دوای جەنگ لە میلان نیشتەجێ دەبێت و دەست بە نووسین و نیگارکێشان دەکات، تابلۆکانی بە تایبەتی لە فەرەنسادا پێشوازی چاکی لێدەکرێت.

لە ساڵی ١٩٤٩دا کتێبی "بیابانی تاتارەکان" بڵاودەکاتەوە کە پاشان دەکرێتە فیلم. ئەلبێر کامۆ ساڵی ١٩٥٦ یەکێک لە شانۆگەریەکانی ئەم نووسەرە "مەسەلەیەکی سەرنج ڕاکێش"ی ئامادەکرد و لە پاریس خستیە سەر شانۆ. بێجگە لە هەردوو کتێبی "بیابانی تاتارەکان" و

"عەشقێک" گشت نووسینەکانی تری چیرۆکی کورت و نمایشنامەن.

هۆی ناوبانگە جیهانگیریەکەی ئەم نووسەرە، لە سەرەتادا بیرە تایبەتیەکانیەتی کە سێلاوێکن لە بیری زەینی تێکەڵ بە تەنزێکی تایبەتی کە تایبەتمەندیەتی ئیتالیای تێدایە، دووەمیان کورت و پوختی چیرۆکەکانیەتی کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر مرۆڤ باوەڕ ناکات چۆن توانیویەتی بابەتێکی زۆر بایەخدار لە سەدوپەنجا دێڕدا جێ بکاتەوە. چیرۆکەکانی بوتزاتی مەگەر بە دەگمەن ئەگینا لە دەدوانزە لاپەڕە تێ ناپەڕێت.

بوتزاتی لە کاتی نووسیندا هەم نووسەرە و هەم فەیلەسووف و نیگارکێش. نیگارکێشی تایبەتمەندیە ئاکارییەکان، جەستەیی و رۆحی، لە هەمان کاتدا فەیلەسووفێکە بە قووڵی دەڕوانێت و، قەڵەمەکەی بێجگە لە "هەقیقەت، هەقیقەتی تاڵ" چی دی نانووسێت.

گەلێک ڕەخنەگر بوتزاتی و کافکا بەیەک بەراورد دەکەن، لەوەدا کە میکانیزمە نهێنی ئامێزەکان بە جۆرێکی هێند توند و زبر بەر بوونیان دەکەوێت و وردیان دەکات کە بەرگە گرتنیان زەحمەتەو ئەمەیش لە خەباتی شەخسی و زەینیانەوە سەرچاوە دەگرێت نەک لە دنیاکەی دەوروبەریانەوە.

* * * *

ئامادیا تورتی[1] ژەنیاری عود لەگەڵ هاوسەرەکەیدا قاوەیان دەخواردەوە. پێشتر منداڵەکانیان چووبوون بخەون. هەردووکیان وەک زۆر جاری تر بێدەنگ دانیشتبوون. ژنەکە لە پڕێکدا وتی:" حەزدەکەیت شتێکت پێ بڵێم..؟ لە بەیانیەوە تا ئێستا هەستێکی سەیرم تێ گەڕاوە... پێ دەچێت ئەمشەو ئاپاخێر[2] بێت بۆ دیدەنی کردنمان"

مێردەکەی بە بێزاریەوە سەری بۆ لەقاند و وتی:" تەنانەت بۆ گاڵتەیش ئەم قسەیە مەکە!" لەبەرئەوەی تۆنی ئاپاخێری ڤیۆلۆنیست و هاوڕێی کۆن و خۆشەویستی ئەو بیست ڕۆژ بوو مردبوو.

ژنەکە وتی:" دەزانم، دەزانم ترسناکە، بەڵام بیرێکە دەست بەردارم نابێت"

تورتی بە خەمێکی لێڵ و پێڵ بەڵام بێ ئەوەی بیەوێت مەسەلەکە تۆختر بکات لەبەرخۆیەوە وتی:" های، خۆزگا..." و سەری ڕاوەشاند.

بێدەنگ بوونەوە. سەعات نۆ و چل و پێنج دەقیقە بوو. پاشان زەنگی دەرگا لێیدا، دەنگێکی تا ڕادەیەک بەرز و خێرا بوو. هەردووکیان ڕاپەڕین. ژنەکە وتی:"چیە بەم شەوە؟" دەنگی پێی ئاینز[3] لە ژووری پێشەوە و دەنگی کردنەوەی دەرگا و پاشان دەنگێکی لەسەرخۆی چاک و چۆنی کردن بیسترا. کچەکە بە ڕەنگێکی تەواو پەڕیوەوە هاتە ژووری نان خواردن.

خانم لێی پرسی:" کێیە ئاینز؟"

کارەکەرەکە تەواو زمانی لاڵ ببوو، ڕووی لە پیاوەکە کرد و وتی:" جەنابی تورتی تۆ کەمێک وەرە، بۆ ئەوێ، ئەگەر بزانیت!"

هەرچەندە خانم بە چاکیی دەیزانی ئەو کەسە کێیە، بە تووڕەییەوە لێی پرسی:" ئاخر کێیە؟ کێ؟"

ئاینز وەک یەکێک قسەیەکی زۆر نهێنی هەبێت چەمایەوە، وشەکان زۆر خێرا لە دەمی دەردەپەڕین:" نا... نا... گەورەم تورتی تۆ وەرە ... مامۆستا ئاپاخێر گەڕاوەتەوە!"

---

1 Amadeo torti

2 Apakher

3 Ines

تورتی لەو هەموو تەشریفات بە خەرج دانە تووڕە بوو وتی:" چیرۆکێکی سەیرە!" بە هاوسەرەکەی وت:" من دەچم ... تۆ لێرە بمێنەرەوە!"
چوە ڕاڕەوێکی تاریکەوە، بەر هەندێک کەل و پەل کەوت. توند ئەو دەرگایەی کردەوە کە لەسەر هۆڵەکە بوو.
ئاپاخێر بە حاڵەتێکی کەمێک شەرمنانەوە لەوێدا وەستابوو. بەڵام نەک بە تەواوەتیی وەک ئاپاخیرەکەی جاران. بەڵکوو لەبەر ئەوەی ئەندامەکانی جەستەی دیار نەبوون، تا ڕادەیەک کەمتر وێنەی ماتەریاڵیان پێوە دیاربوو. ئایا ڕۆح بوو؟ رەنگە هێشتا وانەبێت. لەوانەیە هێشتا بە تەواویی لەوەی مرۆڤ ناوی ماتەریالی لێ ناوە ڕزگار نەبووبێت. ڕۆحێک بوو، بەڵام بە لەش و قەوارەوە. ئاسایی چاکەت و پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی و کراسێکی ڕێی ڕێی شینی لەبەردا بوو. بۆینباخێکی سوور و شینی بەستبوو، کڵاوێکی خوریی زۆر نەرمی بە تووڕەییەوە لەناو دەستیدا چرچولۆچ کردبوو. (هەڵبەتە: ڕۆحێکی بە پۆشاک، ڕۆحێکی بۆینباخ بەستوو و شتی تریش)
تورتی کەسێکی ترسنۆک نەبوو. بەڵکوو پێچەوانەکەی بوو. کەچی یەکسەر هەناسەی بەگیرهات. ئایا بینینی ئازیزترین هاوڕێی کۆن لە ماڵدا کە پێش بیست ڕۆژ بەرەو گۆڕستان کرابێتەوە گاڵتە نیە؟
ئاپاخێری کلۆڵ بۆ پاساوی وەزعەکە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:"ئامادیو!" "تۆ و ئێرە؟ تۆ و ئێرە؟"
تورتی وەک تێی بخوڕێت وابوو. چونکە لەگەڵ هەموو ئەو هەستە دژوار و تێک چرژاوانەدا خوا دەزانێت بۆ تەنیا تووڕەیی و پەلاماری تیا دروست دەبێت. ئایا دووبارە بینینەوەی هاوڕێیەکی لە دەست چوو، سوکنایییەکی گەورە نیە بۆ ئەو؟ ئایا بەڕاستیی بۆ دیدارێکی لەم جۆرە تورتی بەوپەڕی ئارەزووەوە هەرچیەکی هەبوو پێشکەشی نەدەکرد؟ چ گومانێک لەوەدا نیە، بێ بیرکردنەوە ئەو کارەی دەکرد. هەموو شتێکی لەو پێناوەدا بەخت دەکرد. ئەی بۆ ئێستا حەزی لەم شادمانیە نیە؟ تەنانەت بۆ ڕقێکی هێند ناژیارانە؟ دوای دڵتەنگیەکی زۆر، گریانێکی فرە، سەرئێشەیەکی ناچاریی ڕێ و ڕەسمەکە، ئایا دەبوو هەموو شتەکان لە سەرەتاوە دەست پێ بکرێتەوە؟ ڕۆژانی دوورکەوتنەوە، گشت هاوڕێیەتیەکەی ئەوی دامرکاندبوەوە. ئیدی گەردیلەیەک لەو خۆشەویستیە ی تیا نەمابوەوە.
ئاپاخێر کە لێواری کڵاوەکەی لەناو دەستیا زۆر زیاتر گرمۆڵە کردبوو، وەڵامی دایەوە:" چاکە. بەڵێ من لێرەم، بەڵام خۆت باش دەزانیت لە نێوان من و تۆدا ڕوو دەربایسی نیە ... ڕەنگە بێزارم کردبن."
تورتی کە تەواو چاوی پەڕیبوە تەوقی سەری، بە دوای قسەکەیدا چوو وتی:"بێزاریی؟ پێی دەڵێیت بێزاریی؟ تەنانەت نامەوێت بزانم لە کوێوە گەڕاویتەوە، ئەوییش بەم سەر و فەساڵەوە ... تازە باس لە بێزاریی دەکەیت! دەزانیت زۆر ڕوو قایمیت ها!" ئینجا، بەتەواوی بێزاریەوە بەخۆی وت:" ئێستا چی بکەم؟"
ئاپاخێر وتی:" بڕوانە ئامادیو، تووڕە مەبە ... سووچی من نیە... ئاخر ئەوێ (ئاماژە بۆ شوێنێکی نادیار دەکات) زۆر جەنجاڵە... بە کورتی دەبێت نزیکەی مانگێک لێرە بمێنمەوە... مانگێک ئەگەر زیاتر نەخایەنێت... تۆ خۆیشت دەزانیت کە ماڵەکەم پێشتر خاڵی بوە و بەکرێ دراوەتەوە بە یەکێکی تر..."
" کەواتە دەتەوێ بڵێیت بۆ نووستن لای من دەمێنیتەوە؟"
" نووستن؟ ئیتر من نووستنم نەماوە، مەسەلەکە

نووستن نیە ... سووچێکم بەسە ... هیچ بارگرانیەکم نیە، نە دەخۆم و نە دەخۆمەوە، نە ... ئیتر ... پێویستیم بە تەوالێتیش نیە ... دەزانیت؟ تەنیا بۆ ئەوەی ناچارنەبم هەموو شەوەکە لەبەر باران بسوورێمەوە"

" بەڵام باران ... تەڕت دەکات؟"

" من هەر بە سروشت تەڕ نابم" زەردەخەنەیەکی خۆشی بۆ کرد:" وەلێ هەمیشە نەگونجان ئازارم دەداتێ" "بۆیە ئەمشەو هاتوویتەتە ئێرە؟" " ئەگەر ڕێگام بدەی..."

" ئەگەر ڕێگات بدەم؟ ... من لەمە تێ ناگەم ... کەسێکی هۆشیار ... هاوڕێیەکی کۆن ... کەسێک تەمەنێکی بەڕێ کردوە ... چۆن ئاگادار نیە؟ ئایا تۆ هیچ کاتێک ژن و منالت نەبوە؟"

ئاپاخێر وڕ و گێژ بەرەولای دەرگاکە، بۆ دواوە دەڕۆیشت "بمبوورە وام دەزانی، تەنیا مەسەلەکە مانگێکە ..."

تورتی تارادەیەک بە بێزاریەوە وتی :"کەواتە تۆ ناتەوێت لە من بگەیت! نیگەرانیەکەم لەبەر خۆم نیە ... منداڵەکان! ... بەلای تۆوە گرنگ نیە خۆت پیشانی دوو منداڵی پاکیزە بدەیت کە هێشتا تەمەنیان نەگەیشتۆتە دە ساڵ؟ تۆ دەبێت ئاگات لەو هەل و مەرجە بێت کە تیایدایت. دەمبووریت بێ پێچ و پەنا ئەمە بڵێم. وەلێ تۆ، تۆی ڕۆح ... ئەو شوێنەی منداڵەکانمی تیایە، ناهێڵم، ڕۆحێک برواتە ئەو شوێنەوە، ئازیزم ..."

"ئەی چار چیە؟"

"ئازیزەکەم من نازانم چیت پێ ..." هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو. لەپڕێکدا ئاپاخێر لەبەرچاو وون بوو. تەنیا دەنگی پێیەک دەبیسترا کە بە خێرایی دەچوە خوارێ.

کات نیوەی شەو بوو کە مامۆستا ماریۆ تامبورلانی[4] ڕابەری کونسێر ڤاتور، کە لەوێشدا جێ نیشتەنیەکی هەبوو، لە کۆنسیرتەکەوە گەڕایەوە ماڵێ، کە گەیشتە دەرگای ئاپارتمانەکەی، کلیلەکەی لە قفڵەکەدا دەسووڕاند کە لە پشتیەوە گوێی لە ورتەورتێک بوو: "مامۆستا، مامۆستا!" ڕاست ئاوڕی دایەوە و ئاپاخێری دی.

تامبورلانی بە سیاسەتمەداریی، زرنگی، زیرەکی و توانای ژیان بەڕێ کردن، بەناوبانگ بوو. ئەو بەهرە و خەوشانەی زیاد لە لێهاتوە مام ناوەندیەکەی ئەویان سەرخستبوو، ئەو لە چرکە ساتێکدا بارەکەی هەڵسەنگاند. بە دەنگێکی زۆر میهرەبان و کاریگەرەوە لەسەرخۆ وتی: "ئاخ ئازیزم، ئازیزم" و ڕاست دەستی بەرەو ڤیلۆنەکە درێژ کرد کە نزیکەی مەترێک لێیەوە دوور بوو: "ئەگەر بزانیت دڵم چەند ..."

ئاپاخێر کە تارادەیەک کەڕبوو لەبەرئەوەی توانای هەستەکان لە ڕۆحەکاندا کەم دەبنەوە وتی: "چی؟ چی؟ لێگەڕێ، من ئێستا وەک جاران ناژنەوم ..."

"ئۆی تێدەگەم ئازیزم ... بەڵام ناتوانم بیکەم بە گاڵەگاڵ، ئادا[5] خەوتوە و تازە ..."

"ببوورە، ناتوانیت تۆزێک بچینە ژوورەوە؟ دەمێکە بەڕێوەم ..."

"نا نا بۆ خاتری خوا، ئای ئەگەر بلیتز[6] بزانێت!"

"چی؟ چیت وت؟" "ئەگەر بلیتز سەگە گورکەم بزانێت، دەیناسیت؟ ... دەیکات بە هەرایەک

4 Mario Tamburlani

5 Ada

6 Bletis

نەبێتەوە ... ئەم سەگە پاسەوانە زوو بەئاگادێت ... پاشان کێ چووزانێت ...“ ”کەواتە ناتوانیت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک ...“ ”لای من بمێنیتەوە؟ ئاخ ئاپاخێری ئازیز ڕاستە ڕاستە! ... بیری لێ بکەرەوە ئەگەر بۆ هاوڕێیەکی وەک تۆ ... بەڵام دەبێت بمبەخشیت، دەزانیت، ئاخر سەگەکە چی لێ بکەین؟“
ئەم دەست بە ڕوونانەوەیە بە تەواویی هەراسی لە ئاپاخێر هەڵگرت. بۆیە ویستی هەستی بجولێنێت:“ مامۆستا تۆ دەگریایت، بیست ڕۆژ پێش ئێستا لەسەر گۆڕستان کە قسەت دەکرد دەگریایت، پێش ئەوەی بمنێژن ... لەبیرتە؟ من گوێم لە هەنسک هەڵدانت بوو، تۆ ئەڵێی چی؟“
”ئاخ ئازیزم بیرم مەخەرەوە، هەر ئێستا دەخنکێم (دەست بۆ سنگی خۆی درێژ دەکات) ... خواگیان وابزانم بیلتز ...“
لەناو ئەپارتمانەکەوە مرەمرێک هات.
”ڕاوەستە ئازیزم، تۆزێک دەچم ئەو حەیوانە ناپەسەندە بێدەنگ دەکەم ... هەرئاوا تۆزێک ئازیزم“ وەک مارماسی، زۆر خێرا خۆی خزاندە ئەودیو و لایەکی دەرگاکەی لە دوای خۆی داخست و پاشان جووتی کرد. ئیتر دنیایەکی خامۆش.
ئاپاخێر چەند دەقیقەیەک چاوەڕوان بوو، پاشان لەسەرخۆ وتی:“تامبورلانی، تامبورلانی!“ لەودیو دەرگاکەوە هیچ دەنگ نەبوو، ئەوسا بە پەنجەی لە دەرگاکەیدا، بەڵام بێدەنگیەکی تەواو کڕ بوو.
شەو بەرەوپێش دەچوو. ئاپاخێر بیری کردەوە سەر لە جانا[7] بدات_ئەو کچە هاوڕاز و دڵپەسەندەی ماوەیەک لەگەڵیا پەیوەندیی هەبوو_ جانا لە دوو ژووری چکۆڵەدا، لە کۆمەڵگەیەکی شلۆق و کۆن و دووردا دەژیا. کاتێک گەیشت سەعات لە سێ تێپەڕیبوو. خۆشبەختانە وەک زۆربەی ئەو کۆمەڵگەیانەی کەماڵی زۆریان تیایە، دەرگای دەرەوە نیوە داخراوبوو. ئاپاخێر بە زەحمەت گەیشتە قاتی پێنجەم. هات و چۆ شەکەتی کردبوو.
لە پێش دەرکەدا، هەرچەندە زۆر تاریک بوو، بەڵام زەحمەتی زۆری بۆ دۆزینەوەی دەرگاکە نەکێشا. لەسەرخۆ لە دەرگایدا، دەبوو بوەستایە تا گوێی لە دەنگێک دەبوو. پاشان گوێی لە دەنگێکی زۆر خەواڵوانەی کچەکە بوو:“کێیە؟ کێیە لەم کاتەدا؟“
”تەنیایت؟ بیکەرەوە ... منم ... تونیم“
کچەکە بێ وازانە بەڵام بە مل دانە بێ سێ و دوە هەمیشەییەکەی دووبارەی کردەوە:“لەم کاتەدا؟ ڕاوەستە ... ئێستا دێم“ بە دەم ڕۆشتنێکی خاو و خلیچک و داگیرساندنی کارەباوە:“چیە لەم کاتەدا دێیت؟“ جانا دەرگاکەی کردەوە و ئەرکی داخستنەکەی دایە بەر ئەو. بەڵام لەو دەمەدا کە بەرەو جێ خەوەکەی هەنگاوی دەنا، قەڵافەتە سەیرەکەی ئاپاخێر لە شوێنی خۆیدا چەقاندی، بە ساکاوی وەستا و تەماشای کرد و هەر لەو کاتەدا، لەنێو خەواڵوویی و بیرەوەریە ترسناکەکە ڕابوو:“بەڵام تۆ ... تۆ ... بەڵام تۆ ...“ دەیویست بڵێت:“بەڵام تۆ مردوویت، ئێستا بیرم هاتەوە“ وەلێ نەیدەوێرا، بەرەو دواوە چوو، دەستی وەک خۆی بۆ بەردەمی درێژ کردبوو بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو هاتە پێشەوە ئەم پاڵی پێوە بنێت:“بەڵام تۆ ... بەڵام تۆ!“ پاشان هاواری کرد و پاڕایەوە:“بۆ دەرەوە ... بۆ خاتری خوا بچۆ دەرەوە!“ لە ترسا چاوی دەرپەڕیبوو. ئەویش دەیوت:“تکات لێ دەکەم جانا

7 Gianna

... تەنیا ویستم کەمێک ماندوویەتیم بحەسێتەوە"

"نـا، نا. بۆ دەرەوە! تۆ چۆن بیردەکەیتەوە .. دەتەوێت شێتم بکەیت، دەرەوە، دەرەوە! دەتەوێت هەموو خەڵکەکە لە خەو هەستێنیت؟"

لەبەر ئەوەی ئاپاخێر نیازی ڕۆشتنی نەبوو، کچەکە بەبێ ئەوەی چاوی لێ کەلا بخات، لە پشت سەریەوە و لەسەر تاقێک، هەروا بە دەست گێران مقەستێکی دۆزیـــەوە. ئاپاخێر کە گێژبووبوو وتـــی: "دەڕۆم، دەڕۆم" بەڵام کچەکە غیرەتیی وەبەرخۆیدا و چەکە پێکەنین هێنەرەکەی بە سنگیدا کرد. هەردوو سەری مقەستەکە کە چ بەرەنگاریەکی نەهاتەرێ، زۆر بە هێوری هەمووی چوە ناو ڕۆحەکەوە. کچەکە بە سەرسامیەوە وتی: "ئای تۆنی ببوورە، نەم دەویست لە کاتێکدا کە ئاپاخێر دەیـوت: "نـا، نا، ئاخ چ ختووکەدانێک بوو، بمبوورە ... چ ختووکەیەک!"

پاشان وەک شێتێک، لەگەڵ تووڕەییدا دایە پێکەنین. لە حەوشەی دەرەوە پەنجەرەیەک بە گازەگاز کرایەوە. لەو کاتەدا دەنگێکی تورە هات: "ئاخر دەبێت بزانین چ خەبەرە؟ ئیدی سەعات چوارە، ڕسواییە، ئای وای خودایە!" ئاپاخێر وەک با بۆی دەرچوو.

ئێستا ئاپاخێر بۆ لای کێ بچێت؟ بۆ لای سن کالیستوی[8] جێگری قەشە لە دەرەوەی دەروازەکە؟ لای دون ڕایموندوی[9] میهرەبان، هاوڕێی سەردەمیی دواناوەندیی کە لە کاتی سەرەمەرگیدا ئەو دوا سرود و دروودی مەزەبی بۆ خوێند؟ هەر ئەوەندەی ئاپاخێری بینی، قەشە بەم جۆرە پێشوازیی لێ کرد: "برۆ دواوە، شەیتان برۆ دواوە!"

"وەلێ من ئاپاخێرم، نامناسیت؟ ... دون ڕایموندو لێگەڕێ لات بمێنمەوە. کەمێکی تر دنیا ڕوناک دەبێتەوە، کەس دام ناکات ... هەموو هاوڕێکان دەست بەردارم بوون ... هیچ نەبێت تۆ ..."

قەشەکە بە دەنگێکی خەمۆکانە و بە تواناوە وەڵامی دایەوە: "نازانم تۆ کێیت؟ لەوانەیە شەیتان بیت، یان ئەو واهیمانەی خەیاڵەکانم بەرهەمی دەهێنن. نازانم. بەڵام ئەگەر تۆ بەڕاستیی ئاپاخێریت، باشە، وەرە ژوورەوە. ئەوە قەرەوێڵەکەمە. ڕابکشێ و بحەسێوە ..."

"سوپاس گوزارم، سوپاس دون ریموندو. دەمزانی ..."

قەشە دلۆڤانانە لەسەر قسەکانی ڕۆشـت: "لـەوە نیگەران مەبە کە من پێشتریش هەر لەبەرچاوی ئوسقوف جێگای گومان بووم ... تکات لێ دەکەم نیگەران مەبە ئەگەر بوونی تۆ لێرە ببێتە هۆی بەدبەختیم ... بە کورتیی گـوێ بە من مـەدە، تەنانەت ئەگەر تۆ بۆ نەهێشتنی منییش بۆ ئێرە نێردرابیت، ئەمە خواستی خودایە! ... دەتەوێت چی بکەیت؟ لێرە دەڕۆیت؟"

هەر لەبەر ئەمەیە کە ڕۆحەکان_ئەو ڕۆحە داماوانەی بە پێ داگریەوە دەیانەوێت لەسەر زەویی بمێننەوە_ نایانەوێت لەگەڵ ئێمەدا بژین. بەڵکوو پەنا دەبەنە بەر خانوە پشت گوێ خـراوەکـان، وێرانەی قەڵا کۆنەکان، گۆڕستانە دوورەکان، نێو بێشەڵانەکان، سەر ئەو تاشە بەردە دوورانەی دەریا دەیان کوتێ و لەسەرخۆ وێرانیان دەکات.

سەرچاوە:

شصت داستان- تاران – نشر مرکز ١٣٧٩

---

8 San Calisto
9 Don Raimondo



# مەرزەکان

# (یان ماڵئاوایی)

شیعری:خۆرخە لویس بۆرخیس ـ ئەرجەنتین (١٨٩٩-١٩٨٦)

و. لەئینگلیزییەوە:شێرزاد حەسەن

دێرە شیعرێکی"ڤێرلین" هەیە کە من بۆ جارێکی دیکە یادم ناکەوێتەوە

نزیک بە ئێرە شەقامێک هەیە کە لە هەنگاوەکانی من قەدەغە کراون.

ئاوێنەیەک کە بۆ دوا جار منی بینی و ئیدی تەواو!

دەرگایەک کە من تا بە کۆتابوونی دونیا دامخستووە.

لە نێو هەموو ئەو کتێبانەی ناو کتێبخانەکەم

(کە من تەماشایان دەکەم)

جارێکی دیکە.. لاپەڕەی هەندێکیان هەڵنادەمەوە.. هەرگیزاو هەرگیز.

ئەم هاوینە من پەنجا ساڵ تەواو دەکەم:

مەرگیش هەمیشە گەمارۆم دەدات و..

بێوچان هێرشم بۆ دێنێت..!



# دڵبەندانە

شیعری:هێنریکتا لیسبوا – بەرازیل ( ١٩٠١-١٩٨٥)

ئەی خودا..بمبەخشە گەر بە دوای تۆدا ناگەڕێم.

لە رۆژانی پڕ شکۆ و دەبدە و زەنگینی و ئەرخەوانی تۆ.

تۆ بمبەخشە گەر من نەهاتمە بارەگای تۆ..

لە ڕێ و ڕەسم و سرووتی گڕدانی بخوور و نوور و داگیرسانی مۆمەکان.

بمبەخشە کە تێکەڵ بە ڕووتە و پووتە و بۆرە پیاوەکان نەبووم

ئەو کاتەی لەنێو گۆڕەپانەکاندا نزا و نوێژیان بۆ دەکردیت.

لە سۆنگەی ئەوەوە کە من هەرگیز لە ڕیزی

ئاڵا هەڵگرانی ڕەنگاوڕەنگی تۆدا بەشدار نەبووم..!

*

نەک لەبەر ئەوەی گوناهبار و شەرمەندەی بەردەمی تۆ بم.. هۆ گەورەم

ئەوە تۆ بوویت کە بێ ڕووت کردم و شەرمت ڕژاندە ڕۆحمەوە

بۆ هەموو ئەو ئاکار و شتانەی مەرج بوو دەرکەون وەک ڕۆژی ڕووناک.

ئاخر من نازانم چۆن بە دەنگی بەرز سروود و ستranan بچڕم.

فێر نەبووم پەل بهاوم بۆ کاری نەنگ و و پڕ باقوبریق.

ڕانەهاتووم بە بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ و هەرزانبەهاوە بێمە دیداری تۆ..!

*

من هەر وەک ژنە رەبەن و پەرستگانشینەکان..خامۆشانە عاشقم.

یان وەک ئەو کەسانەی نائومێدانە ئەویندارن.. دەمەو خۆرنشین.

تا ئەوپەڕی جوانی و پاکی..

هەروەک ئەوەی دولبەرەکەم لە سەرەمەگدا بێت...

*

دەنێو خەم و پەژارە و تاریکیدا..

ئەودەمەی پیاوەکان تۆ وەلاوە دەنێن

چۆن سەرگەرمی کار و ئەرکن.. یان هەتا بێ ئیش و دەست بەتاڵ

هەر وەختێک پەرستگاکان چۆڵ دەکەن..

ئەو کاتە.. گەورەم .. ئەو کاتە

سەروەختی دیداری من دێتە پێشێ.

هێدی و لەسەرخۆ پێ دەنێمە مەزارەکەی تۆ..

بەدەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە چراکەت بۆ هەڵدەکەم

لەسەر زەوییەکە دادەنیشم، نزیک بە ئارامگای تۆ

تەواو نوقمی خولیا و بیری ناگوفتە.

*

هۆ سەروەرم.. لەوەدایە من نوێژت بۆ نەکەم.

بێهوودە نەتوانم زار هەڵبێنم و..

گوزارشت لە هەست و نەستی خۆم بکەم

هەموو ئەو ڕاز و نیازانەی کە بەدەم تێپەڕینی ڕۆژگارەوە لە خەیاڵی مندا شێوان..

لێوەکانیشم بێ جووڵە و قرساو بەسەر یەکدیدا.

وەلێ لەناو کرۆکی ڕۆح و بوونی مندا..

چ خۆبەدەستەوەدانێکی کوشندە وا لە ڕێمدا..

چ دۆستایەتی و نزیکی زۆری نێوان هەڵوێستی من و..

دونیای تۆدا

کە هەست بە دڵی من بکەیت لەناو چنگی خۆتدا..

چ بەتاو و تینێکەوە ترپەی دێت و لێدەدات..!



# کێ پرتەقاڵێکم بۆ دەکڕێت؟

شیعری:خۆسێ گۆرۆستیزا – مێکسیك
(١٩٠١-١٩٧٣)

کێ پرتەقاڵێکم بۆ دەکڕێت
تاوەکو دڵخۆشم بکات؟
پرتەقاڵێکی ساغ و تەواو گەییو
ڕێک لە شێوەی دڵێک.

*خوێی دەریا وا لەسەر لێوانم..
ئەفسووس بۆ من!
من لەسەر لێوانم و ناو دەمارەکانی خۆمدا
خوێی دەریاکانم کۆ کردەوە.

*کەس نییە لێوەکانی خۆی
پێشکەش بە من بکات.
بۆیە من ناتوانم بیدوورمەوە..
گوڵەگەنمەکانی پڕ میهری تەنها ماچێک.

* کەس داوام لێناکات..
خوێنەکەم بخواتەوە.
من خۆیشم ناتوانم دڵنیا بم..
ئاخۆ هێشتا بە دەمارەکانمدا دێت و دەڕوات.

*وای لە من..وای!
کە وەک پاپۆڕەکان نغرۆ دەبم.
من  بزر بووم وەک چۆن هەورەکان بزر بوون
وەک گەمییەکان کە لەناو زەریادا ون دەبن!

*ئیدی کەس داوای ئەم دڵەم لێناکات
هەر بۆیە چیتر دڵێکم گەرەک نییە .
ئاخۆ کێ بێت میهر بنوێنێت و پرتەقاڵێکم بۆ بکڕێت
کە هەر هەنووکە شاد و دڵنەواییم بکات؟

سەرچاوە:
TWENTIETH – CENTURY LATIN AMERICAN POETRY
4–97–7230–ISBN 964
Saless_publication@publicist.com

# مادمازێل کەتی

نووسینی: میترا ئەلیاتی
و. لەفارسییەوە: کەژاڵ ساڵحی

باران دەبارێ. ئەمڕۆ هەر باریوە، کەس لە بەستێن نییە. لە کوێرە ڕێیەکی دارستانەوە دەگەڕێمەوە نێو شار. وڵات خەڵوەتە. لەسەر چرپایەک لە ژێر سێبەری کەپرێکی کەتانی دادەنیشم. پاڵ بە کۆڵەپشتەکەمەوە دەدەم. میوانخانەی مادمازێل کەتی لەوبەری مەیدان داخراوە. بەیانیش کە هاتم داخرابوو. کەس بە هەواڵی نازانێ. هاژەی دەریا دێ. شەپۆلەکان خیزە زەرد و وردەکانیان بەجێهێشتووە. لە بەردە پەمەییەکان دەدرێن و دەگەڕێنەوە.
گەڵاکان دەوەرن. سەرمامە. بەیانی ڕۆبێرتۆ گوتی: «وێ ناچێ حاڵت باش بێ، ڕەنگت پەڕیوە کوڕی چاک. بۆ ناچییەوە ماڵێ؟»
لە وێستگە، لای چەپمەوە پاسەکە بە خاڵی ڕاوەستاوە. بریا سوار بوومایە و گەڕابامەوە بۆ ڕۆم، بۆ ماڵەکەم، ماڵێ!
دیسان هەر ئەو وەتاغە بچووک و خەفەیە. خرت وپرتی خۆڵگرتوو. ڕاکشان لەسەر تەخت



میترا ئەلیاتی

و جگەرەکێشان. ڕامان لە پەردە خۆڵەمێشییەکان. خەوتن تا سنووری مەرگ. ژنە خاوەنماڵەکە گوتی: «ئەوانە بۆ من نابنە کرێ ماڵ».
تابلۆکانی لە درەێ دانا. لە بەردەمی دیوەکەم. نێو گیرفانەکەم گەڕام تا پاکەتە جگەرەکەم بدۆزمەوە. دەبێ لێم کەوتبێ. ڕەنگە لە دەم بەستێن لێم کەوتبێ. سەرمامە. یەخەی کۆتەکەم هەڵدەکێشم. گوێ لە دەنگی سازڕا دەگرم. میلۆدییەکی خۆشی هەیە. لە قاوەخانەی «خۆلێو»وە دەنگی دێ. خۆشە بچی و لەگەڵ قەرەچییەکان دەست بکەی بە هەڵپەڕین. باران یەک ڕیز دەباری.
بەیانی ئاسمان ساماڵ بوو. گەڕۆکەکان بەرەو بەستێن دەڕۆیشتن. پیرەپیاوەکان لەسەر حەوزەکە دانیشتبوون. دەبێ چووبێتن بۆ هۆڵی چاوەڕوانی هۆتێلەکان. هەر کە باران دایدا، چەرچییەکان خرت و پرتەکانیان کۆ کردەوە.
ڕۆبیرتۆ گوتی: «یەک ڕاست دەچمە کازینۆ بۆ قومار کردن». چەرچییە. بەڵێنی بە دەستگیرانەکەی داوە هەر کات خرت و پرتەکانی ورد کردەوە و مت و مووررووەکانی فرۆشت، بچێ بۆ ڕۆم و لە فرۆشگە گەورەکان عەتر و گۆرەوی و کڵاوی بۆ بکڕێ. ئاشقی قومار کردنە. هەرچی پەیدای دەکا شەوانە [لە قوماردا] دەیدۆڕێنێ.
مت و مووررۆکانی لە نێو ساکێک خست و گوتی: «بەڵکوو بەخت و شانس بە پیرمەوە بێ!»
تەم و مژ هاتۆتە خوارێ. تا سەربانی سووری خانووەکان. مادمازێل کەتی قفڵێکی گەورەی لە دەرگا دارە چکۆلەکەی میوان خانەکەی داوە و ڕۆییوە.: «ڕەنگە چوبێتە جەزایر. وەدووی ئەشقی ونبووی کەوتبێ».
گوتم: «ئەو لە ژیانیدا کەسی نەبوو».
چاوێکی لە کاتژمێرەکە کرد: «درەنگە، دەبێ بڕۆمە دەریا. پاش نیوەڕۆ وەرە بۆ قاوەخانەکەم. قرژاڵێکت دەدەمێ بەقەد نەهەنگێک بێ».
لۆتکەکەی بۆ نێو ئاو پاڵ پێوەنا. گەڕۆکەکان لە شوێنی وەستانی کەشتێکان سواری کەشتی

سەیاحەتی دەبوون. [کەشتییە سەیاحەتێکان] تا دوورگە دوورەکانی دەبردن. پانتایی کەشتێکە پڕبوو لە هەراوهوریا و پێکەنین. ئاسمان خۆڵەمێشی بوو. «پیترو» بە سەوڵ لێدان ڕۆیی.
دەبێ تەواوی وڵات بە دووی مادمازێل کەتیدا بگەڕێم. نابێ بگریم. بابم هەمیشە دەیگوت: «گریان ئیشی ژنانە». هەر خۆشە لەگەڵ مادمازێل کەتی بی و لە بەر هەیوانی میوانخانەکەی دانیشی و باس لە ئەمر و نیاکانی بابم بکەی.
ـ پێی خۆش بوو وەکوو پیاوێکی ڕاستەقینە گەورەم کا، بەپێچەوانەوە دایکم پێی خۆش بوو کچ بم. بەکورتی ماوەیەکی زۆر لەمەڕ بارهێنانی مندا لەگەڵ بابم شەڕی کرد. ئێستاش نەمزانی کامیان سەرکەوتن.
مادمازێل کەتی خاچێک لەسەر سینگی دەکێشێت و قاقا پێدەکەنێ.
قفڵە سپییەکانی پشت پەنجەرەی لانـەداوە بەڵام هەست دەکەم دەگەڕێتەوە. پێڵووەکانم هەر دێن و قورس دەبن. زارم وشکە، بریا لەماڵێ بایەم. دایکم دەیبردمە بن کورسی و کوڵاتوویەکی تاڵی دەرخوارد دەدام.
هەڵدەلەرزم. لێفەکەم لەسەر لادەبا و لە باوەشم دەکات: «دایکت بمرێ. کوڕەکەم چ تایەکی هەیە» دەنگی دەلەرزێ: «بەو نیوەشەوە بە تاقی تەنیا چ بکەم».
پەتۆیەکم تێوەدەپێچێ. چارشێوەکەی لەسەر پلیکانەکان بە خۆی دادەدا. بە هەناسەبڕکێ بە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکاندا تێدەپەڕێ. دەستم لە ملی کردبوو. دەستی کردووە بە نووکەنووک.
دەنگی هاژەهاژی ئاو دێ. بۆنی زوقمی ماسی دێ. بۆنی نەخۆشخانە دێ. بە چارشێوەکەیدا ڕشامەوە. بە هەڵاتن داڵانە ڕووناکەکان تێپەڕ دەکا. مەرمەڕی ڕەنگاوڕەنگ بە بن میچەوە نووساون.
ـ خەریکە منداڵەکەم دەمرێ، خانمی پەرەستار!



لەسەر تەختێک ڕایان کێشاوم. پەرەستار کراسەکەی هەڵداومەتەوە. لاقە فرتێ دەکەم. دەمەویست هەستم. لاقەکانم هێزیان لێبڕاوە. چڕنووک لە مەلافەکە دەگرم. دەستی پەرەستارەکە دەگرم. دوکتور بەسەرمدا خوار بۆتەوە.

ڕوخساری لەبەر چاوم خوار و خێچ دەبێ. هێندە درێژ بووە سەری لەبن میچی دەدرێ. هەرکە دەست درێژ کا دەتوانێ ئەو مەڕمەڕە سوورانەی کە دەلەرێنەوە، لێکاتەوە. پێدەکەنم.

- ناوت چییە کوڕم؟

دایکم دەڵێ: «هادی. نێوی هادییە ئاغای دوکتور. لەناکاو دیتم کوڕەکەم لەبن کورسی لە هۆش خۆی چوو».

- تاقی کردنەوەت بۆ دەنووسم. واچاکە بیخەوێنن. بابی لە کوێیە؟

دەڵێم: «چووە بۆ کایە کردن، مێشێن...»

بابم گوێچکەم ڕادەکێشێ. بە ڕاکێش‌ڕاکێش دەمباتەوە بۆ ماڵێ. مەڕمەڕەکانم لێ فڕێدەداتە پشت دیوارە ڕووخاوەکە.

- مێشێن ئێشی منداڵانی بێسەرەوبەرەیە. ئیتر نەتبینم بچی بۆ کۆڵان.

- پێموا بێ کەوتووییە...

- خانمی پەرەستار وا دەڵێ و لەسەر تەختێک لەبەر دەمی پەنجێرەیەک ڕام دەکێشێ. دەرێ تاریکە.

بابم هات. چەند قوتووی کامپووتیشی پێبوو. گوتی: «هەرکە چاک بوویتەوە دەت بەم بۆ بازاڕ و هەرچیت پێ خۆش بێ، بۆت دەکڕم».

دەستی بە گیرفانیدا کرد و گوتم: «مەڕمەڕەکانم!» پاکەتی جگەرەکەی بوو لەگەڵ تەسبێحێکی زەرد، لە لام دانیشت.

پەرەستار گوتی: «لێرە جگەرەکێشان قەدەغەیە ئاغا. فەرموون بڕۆنە حەسارێ».

حەسار ڕووناک بوو. تاو لەسەر دارەکان بوو. پاسارییەکان هەڵدەفڕین. بابم بزەیەکی هاتێ. پاکەتە جگەرەکەی خستە نێو گیرفانی تا نیوەڕۆ لەلام ماوە. ئیتر پێم خۆش نەبوو، چاکبمەوە.

گژەگژی بایە. با دێ. پاسەکە سیگناڵێک لێدەدا و وەڕێ دەکەوێ. خولێکی مەیدان لێدەدا و دەگەڕێتەوە. موسافیرەکان لە پەنجەرەوە چاوم لێدەکەن. دەستم لێ هەڵدێنن. بزەیەکم دێتێ. پاسەکە دوور دەکەوێتەوە و لەنێو مژ و باراندا ون دەبێ. گەڵاکان دەوەرن. پاییزە. چ زوو پشوودان تەواو بوو.

گەڕۆکەکان بەرەو ماڵ بوونەوە. بە هێوری دەڕۆن. بە دوای یەکدا ڕیز بوون. چەکەکانیان لەسەر شانیان داناوە. سەربازەکانی نێو پادگان بەڕیز دەڕۆن. لاق بە عەرزیدا دەدەن. دەنگی پێیان تا دەرەوەی پادگان دێ: یەک، دوو، سێ، چوار. یەک، دوو، سێ، چوار.

من و دایکم لە بەردەمی پاسەوانی ڕاوەستاوین. با گەڵا زەردەکان لەگەڵ خۆی دەبا. هەرچەند مل دەکێشم کاکە هیمەت نابینم. دایکم قوتووە شیرینییەکەی دابە من: «بۆ خۆت بیدە بە کاکت. ڕەنگە لە منی وەرنەگرێ. هەر خودا دەزانێ ئەو کوڕە چەندە لاسارە».

دەڵێم: «هە هانێ. دیتم».

چارشێوەکەی دایکم بەر دەدەم و هەڵدێم. خۆم بە نەردەکەوە هەڵدەواسم. قوتووی شیرینییەکە دەبەمە سەر سەرم و ڕایدەوەشێنم. دەمبینێ. دەستی لە پەنا گوێچکەی ڕاگرتووە. هێندە هەڵبەز و دابەز دەکەم قوتووە شیرینییەکەم لە دەست بەردەبێتە خوارێ. وردەوردە بە بن دارەکاندا دەهات. قشقەڕەکان دەیانقڕاند.

سەرمامە. گەرووم دەکزێتەوە. کاکە هیمەت لە قەڵاندۆشم دەکا و دەوران دەوری حەسارەکەم دەگێڕێ.

دایکم لە پەنا وەجاخەکە خەریکی تێکەڵدانی فرنییە. دارە مێوە بێ گەڵاکەش بە دیوارەوە نووساوە.

دەڵێ: بیبەنەژوورێ، لەبن کورسی ڕایکێشن، دەترسم سەرمای بێ. دەست و لاقی بۆتە سەهۆڵ...»

دەڵێم: «کوا پشیلەکەم؟»
دایکم دەکۆخێ چاوەکانی لەبەر دووکەڵ سوور هەڵگەڕاوە. فڕنەکە هەڵچوو. دەڵێ: «دیسان دەستت پێکرد هادی؟ پشیلە نەخۆشی دێنێ».
دەڵێ: «کەوتوویی کز و لاوازی کردووی. دەبێ زۆر بخۆی تا قەڵەو بی...»
دەڵێم: «پشیلەکەم دەوێ»
بابم لە بازاڕ چەند بەستەی قەڵەم ڕەنگی و لێنووسێکی ڕەسم کێشانی بۆ کڕی بووم.
نەمگوت پشیلەکەمم دەوێ. نەدەبا گریابام. گوتی: «دا ڕەسمێکی جوانم بۆ بکێشەوە کوڕی خۆم!»
هەناسەی بۆنی توتنی لێدەهات. عەباکەی بەسەر دادام تا گەرم ببمەوە. دەستی بە قژە درێژەکانمدا هێنا و گوتی: «هەرکە چاک بوویەوە دەتبەمە لای سەرتاش، دەبی بە پیاو!..»
دایکم بە مۆنەوە چاوێکی لێکرد و وەکوو ئەو کاتانەی دەچووینە سەر قەبری خوشکەکەم لیچی هەڵقرچاند. لە لای سەماوەرەکە دانیشتبوو، فڕنی لە قاپە چکۆڵەکان دەکرد.
هەرکات لەلای مەکینەی دروومان دادەنیشێ و [گۆرانی دەڵێ] ئاوازێکی غەمگینی هەیە. کراسێکی دامێ لەبەری کەم. داوێنم لە عەرزی دەدرا. گوتی: «ئەگەر خوشکت نەمردبایە، بۆ بەری دەبوو».
دەستێکی بە قژە درێژەکانمدا هێنا. خۆم لە باوەشی هاویشت. دەم و چاوی تەڕ بوو. بە هەڵپەوە گوتی: «زووکە، دایکەنە، ئێستا بابت دێتەوە».
زاری دایکم لە ڕەسمەکانمدا چکۆڵەیە، لەبەر ئەوەی دەر و جیران گوێیان لە دەمەقرەی ئەو و بابم نەبێ هەمیشە سووک قسە دەکا. بابم پێدەکەنێ . دەچێتە حەسارێ و باغچەکە ئاو دەدا . گوڵەکان لەبەر تەڕی دەبریسکێنەوە.
دایکم ئەوشەوە لەلای من نەخەوت. تا بەیانی لە پەنجەرەوە چاوم لە ئاسمان بڕیبوو. لێوی دایکمم سوور کرد. نازانم ئەستێرەکان چ ڕەنگین . دەڵێم:
«ئەرێ چاوی پشیلەکە چ ڕەنگ بوو؟»
بابم گوتی: «چاوی دایکت ڕەش و گەورە و بادامین»
دایکم لە ماڵ نەبوو. چووبوو بۆ ماڵی دایەگەورەم دۆکوڵیوی نەزر و نیاز لێنێن. بابم دەستی گرتم و بردمی بۆ لای سەرتاش و سەری پاک و خاوێن بۆ تاشیم. دایکم ئیتر قسەی لەگەڵ نەکرد. تا ئەو کاتەی سواری فڕۆکە بووم لەلای بابم بێدەنگ بوو.
مادمازێل کەتی گوتی: «چ دڵ تەزێنە».
چاوە تەڕەکانی بە دەسرۆکەیەک سڕی، پشیلەکەی هەر بە دەوروبەرمدا دەهات و دەچوو. بۆنی ئەو پشیلەیەی لێدەهات کە ڕۆژێک بابم لە کارتۆنێکی خست و لەگەڵ خۆی بردی. نەدەبا گریابایەم. بابم هەمیشە دەیگوت: «پیاو ناگری»
کاکە هیممەت لە من گەورەتر بوو. دەیزانی گریانەکانی بەرێتە ئارەق فرۆشییە تەنگ و تاریکەکان .
لە سەربازی هەڵاتبوو. ئەو شەوەی کە هاتەوە نەیدەتوانی لە سەرلاق ڕاوەستێ. لە بەر هەیوانەوە چاوم لێکرد هەتا گەییشتە سەر حەوزەکە هەر سەرسمی دەدا. لە نێو تەشتێکدا هێڵنجی دەدا. داوێنی دایکمی گرتبوو، گوتی: «خوا ڕووحمی کرد بابت لە ماڵ نیە دەنا چ قیامەتێکی ساز دەکرد...»
لە خوا دەپاڕامەوە نەیەتەوە. نەهاتەوە. زۆربەی شەوەکان لەدەرێ بوو. دایکم دەیگوت: «هێندەی کار هەیە شەوانەش لە گاراج دەمێنێتەوە» کاکە هیممەت لە بنەوە چاوێکی لێکرد و هیچی نەگوت.
ئەگەر دەشهاتەوە لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد. گوێی لە ڕادیۆ ڕادەگرت. نان و چایەکەی بە نیوە چڵی بە جێ دەهێشت و دەیگوت: «ماندووم لە دیوی میوانان جێگام بۆ ڕاخەن».
دایکم هەڵدەستا و جێگا و بانەکەی بۆ دەبرد.
بابم پاکەتە جگەرەکەی لەگیرفانی دەخست و رادێوکەی لە سەر تاقەکە هەڵدەگرت و بەبێ سەرنج دان بە ئێمە دەڕۆیی.
دایکم گوتی: «بە بابت نەڵێیێ کاکت شەوانە درەنگ



دێتەوە»
کاکم ئیتر نەچۆوە بۆ سەربازی، تا قرچەی نیوەڕۆ دەخەوت، ئێوارانەش لیباسی تازەی لە بەر دەکرد و چەند پەل گوڵی لە باغچەکە لێدەکردەوە و دەستەی دەکرد و دەڕۆیی. ئاشق بووە، ژنەقاوەچییەک فریوی داوە....
رەمڵ و ئوستوورلاب وا دەڵێن. ئەستێرەکانی ئاسمان وا دەڵێن. هەر کە دایکم لە ماڵی نووشتەنووس گەڕاوە ئەوانەی بەدایە گەورەم گوت. نووشتەیەکی نووسیبوو. خۆڵی باغچەکەی لادا. هێندێک قژی زەرد و لەتێک پەڕۆی گوڵداری لە بن دارە مێوەکە لە قووڵکە خست و خۆڵیشی بەسەردا کرد. گوتی: «نەچی بە کاکت بڵێی»، نەمگوتبوو. نەشم دەگوت.
کاکم ئیتر زۆرانم لەگەڵ ناگرێ. ناچین بۆ بینینی فیلمی تارزان. بیری ئەو خاتوونە قەڵەوەم دەکرد کە قژەکانی وەکوو ژنی تارزان زەرد بوو. بابۆڵە و پیپسی بۆ دەکڕیم و لە سینەما لەلای کاکمەوە دادەنیشت و قەوچەقەوچ بنێشتی دەجوو.
بابم گوتی: «گـووی وا دەخـــوا!.... هەڵاتووە؟ دای دەپڵۆسم. وای لێدەکەم لەجێی لاقی بەسەر بڕواتەوە...»
دەنگی لە دیوی دانیشتنەوە دەهات. کاک هیممەت لەبەر پەنجەرەکە دانیشتبوو و چاوی لە گوڵی فەرشەکە دەکرد، لاقی لەسەر لاقی دانابوو. چەکمە بۆیاغ نەکراوەکانی لەبەر هەیوان داندرابوون.
زۆریـان لێکدا. پاڵێکی بە بابمەوە نا سـەری لە تیژایی دەرگاکە درا. لە ترسان نەگریام. لە پشت پەردەکە خەوم لێکەوت. بابم سبەینێ بەیانی بانگی مەعمورێکی کرد و هاتن بردیان. من و دایکم تا سـەری کۆڵانەکە بە دوایـدا چووین. لە پێشەوە دەڕۆیـی. ئاوڕێکی وێ نەدابن. چاوێکمان لێکات. سواری جیپێک بوو. لەدواوە دانیشت.
جیرانەکان لە سەربان و بەرپەنجەرەوە سەریان کێشابۆ دەرێ. کاتێک گەڕاوە ژنی هێنابوو. چوونە

خانوویەکەوە کە لە ئێمە دوور بوو. دایکم دەگریا. بابم بۆ ئەوەی من لە هەیوانەکە گوێم لە قسەکانیان نەبێ، بە سرتە گوتی: «هەرکە ئەشق و ئاشقی لە کەللەی چۆ دەرێ ژنەکەی تەڵاق دەدا و دەست دەکا بە پاڕانەوە و لاڵانەوە».

گەڕاوە. کز و لاواز، ریشێکی درێژ، بە لارەملی لە قولینچکێکی دیوەکە دادەنیشت. پێم خۆش بوو دیسان فیلمێکی تارزان ببینم. لەو جارەوە نەیبردبووم. ئیتر هیچ کات نەیبردم.

دوایی حاشای لە هەموو شتێک کرد. نووسی: «عەشق چییە؟» «ئاشقی کامەیە؟» هۆشت بە دەرسەکانتەوە بێ هەرکات بۆ خۆت بووی بە شتێک بگەڕێوە. نەکا هەوای عەشق لە کەللەت دا. لە بیرت نەچێتەوە من چیم بەسەر هات...»

بابم بەبێ ئەوەی ئاشق بێ لەعیارەشە، ژنە دەم و چاو هەڵگرەکەی گەڕەکی خۆمانی سیغە کرد.

دەیانگوت: لە نزیک گاراج خانوویەکی بۆ بەکرێ گرتووە. دایکم ئیتر قەت دەم و چاوی هەڵنەگرت. نەش دەچووینە حەمامی دەرێ. سەکینەی حەمامچی کوتبووی: «داخەکەم بۆ ئەو لەش و بەدەنەی تۆ خاتوو رۆح ئەنگیز! ئاخری لەعیا دەیلاغ کاری خۆی کرد».

مادمازێل کەتی گوتی: «دەیلاغ!»

دەیلاغم بە زوبانی فارسی گوتبوو. پێدەکەنی. وای دەیلاغی دووپات دەکردەوە هەر دەتگوت لە ماناکەی تێگەیشتووە. دیسان گوتی: «دەیلاغ» و پێکەنی.

کاک هیممەت گوتی: «ئەمانە هەمووی قسە و باسن، درۆیە، باوەڕ مەکە».

دایکم لە بێدەنگیدا چاوی لێدەکرد.

هەرکات لەبەر هەیوانی میوانخانەکەی دانیشێ، ئاسمان شینتر دێتەبەرچاو. دەنگی شەقەی باڵی پەلەوەرە دەریاییەکان دێ. گوتی: «دەبا تۆ شاعیر بوایەی».

گوتم: «پێم خۆشە بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم. بچمەوە و گەلەرییەک بکەمەوە.

ـ دەیجا بۆ ناگەڕێیەوە؟

ـ بریا هەروا سووک و ئاسان بوایە.

بە پەژارەوە چاوی لێکردم.

گوتم: «جارێک هەوا لە کەللەی دام بە بێ هەواڵ بگەڕێمەوە» جانتاکەم پێچاوە. دیاریم بۆ هەموویان کڕی. تا فڕۆکەخانەش چووم. نازانم بۆ لەپڕ ترسێک کەوتە دڵمەوە، هێشتا سواری فڕوکە نەببووم، بارەکەم وەرگرتەوە و گەڕامەوە. پێموابێ هۆیەکەی ئەوە بوو کاتێک بابم هاتە رۆم و سەردانی کردم پەیتاپەیتا لۆمەی دەکردم و دەیگوت: «دێیەوە دەڵێی چی؟ لەتەڕی دەخۆی و لە وشکی دەخەوی. پیاوێک کە نەتوانێ بە ڕەنجی شان و پیلی خۆی نان پەیدا بکا پیاو نییە. چا ئەو سەر و گوێلاکەی، کوڕە ئاخر کوا پیاوێکی کاسبی حەیابەخۆ قژی وەکوو پرچی کچان درێژە؟! کوا کراسی ڕەنگاوڕەنگ لەبەر دەکا؟ نا ئەو جلف بازییانە لەگەڵ بیروباوەڕی من نایخوێنێتەوە».

گوتم ڕەنگە ڕاست بکا. خەرجی تێدا کردووم. گەورەی کردووم. پێکەوە چووینە لای سەرتاش. چووم و سەرم پاک و خاوێن تاشی. ئێستاش پێی خۆش نەبوو بمباتەوە. دەیگوت: «بریا بە قسەی بەرپرسی قوتابخانەکەتم نەکردایە وام دەزانی بچی بۆ «فەرەنگ» دەبی بە شتێک. ئەگەر سافکاری ترۆمبیلیش بایەی، ئێستا دەم بردییەوە».

مادمازێل کەتی پێکەنی: «دەیجا دەتوانی ڕەسمەکانت لەسەر ترۆمبیلەکانی بابت بکێشییەوە تاکوو ئەویش پێی خۆش بێ. سینوێرا!»

هەرکات دڵت گیرا، ئەگەرچی ئێوارەی رۆژی یەک شەممە بێ، بووم و سێپایە و کۆڵەپشتییەکەت هەڵدەگری و دەڵێی بە گۆڕی بابی مشتەرییەوە. تا ئەوبەری مەیدانەکە هەڵدێی. وەکوو ئەو کاتانەی پیاو لەوانەیە دڵی بتۆقێ بۆ قاوەیەکی تورکی مادمازێل کەتی. موسافیرێکی زۆری لێ نییە.

لەملاو لەملای چەند هوتێلێکی لۆکسیان لێ دروست کردووە. دەترسم میوانخانەکەی بفرۆشێ و بگەڕێتەوە مەسکەو.
چاوی لە پیاڵە قاوەکەم بڕی: «موسافیرێکت هەیە».
- خۆ بابم نییە؟
پێکەنی: «لەوانەیە رۆژێک بیرت بکا و بیهەوێ بگەڕێتەوە...»
چاوی لەسەر پیاڵەکە لابرد: «نامەیەکت بۆ دێ».
- ئەشقاوییە؟
- پێموابێ، نازانم...
زێڕین نووسیبووی: «ئاخرییەکەی زمان درێژ کاری خۆی کرد، مەڵێ دەزانم چی کردووە. هەرچی بە بیرتدا بێ هەڵەیە. مەبەستم ئەوەیە داخی دڵی خۆی بە فەیلەسووف ڕشت. بەو دندووکە درێژە ناحەزەی دندووکێکی لێدا و چاوێکی دەرهێنا. منیش تۆڵەم لێساندەوە. مەڵێ دەزانم چیت لێ کردووە. هەرچی بە بیرتدا دێ هەڵەیە. لەنێو قەفەسێکی گەورەم خست و بردمە ئەوسەری باغەکە و بە دارێکەوە هەڵمواسی.
چارشێوێکی رەشی برێزێنتیشم پێدادا. ئێستا قارەقاڕیش ناکا. لە چارەنووسی فەیلەسووفیش هەرهیچت بۆ باس نەکەم چاکترە. لەگەڵ پوورم بردمانە لای بەیتاڵ. کار لە کار ترازابوو. تۆش کە رۆیشتی وا چاکە بڵێم هەڵاتی. بەبێ ماڵئاوایی و لەو شتانە... ماڵەکەشتانم پێ نەدەزانی. رۆژێک چوومە بەر دەرگای قوتابخانەکەت بە هەزار فێڵ و فەرەج و قوربان و سەدەقە شوێنەکەتم لە فەڕاشی قوتابخانە وەرگرت. سەردانێکی دایکتم کرد. پێکەوە بووین بە دۆست، دەیگوت: «کوڕەکەم چۆتە هەندەران وانەی فڕۆکەوانی بخوێنێ. پێی گوتم: بریا یان بووکم بایەی یان کچم بایەی. داوای لێکردم دیسان بچمەوە و سەری لێدەم».
دایکم دەینووسی: «بریا دێڕێکت نامە بۆ نوسیبایە»
دایکم نووسیبووی: «ئیتر زێڕین نایە بۆ ماڵمان، بە مێردیان داوە»
دایکم زێڕینی لە دەوروبەری «مەیدانی وەنەک» دیتبوو لەگەڵ پیاوێک لە سەیارەیەک دابەزیبوون. هەرای لێکردبوو، زێڕین خۆی لێ نەناس کردبوو. ڕەنگە دایکیشمی نەدیتبێ.
«لەلای دوکتۆر دەهاتمەوە. ماندوو بووم. دەمهەویست سواری تاکسی بم و بگەڕێمەوە ماڵێ. ئیتر لاقەکانم هی خۆم نییە کوڕم. بوونەتە گۆپاڵ...»
هەرکە چاوی بە زێڕین کەوتبوو خۆی پێ ڕانەگیرابوو و تا بەر دەرگای گوڵفرۆشێکە بە دویاندا چووبوو.
«هەرام لێکرد. پێموابێ گوێی لێنەبوو. لە دواوە دەستم لەسەر شانی دانا. گەڕاوە و بەسەر سوورماوییەوە چاوی لێکردم و گوتی: «ئەیەڕۆ ئەوە تۆی خاتووو روح ئەنگێز؟! بەستەزمانە، دەستەپاچە ببوو. یەکترمان لە باوەش گرت، دڵی پڕ ببوو. ماچی دەکردم و بە قوربان و سەدەقەم دەبوو. گوتی: «هەی نەمێنم بۆ وا پیر بووی. دووری هادی پیری کردووی».
بە دایکمی گوتبوو کچ و کوڕێکی دوانەی هەیە خولێرکەیان لێهاتووە و لە ماڵێ لەلای پەرەستارێک بەجێی هێشتوون.
«ڕاز و نیازێکی زۆرمان کرد. باسی «لەعیام» بۆ کرد کە چۆن خەریکە بابت تووشی رۆژەڕەشی دەکات. لە نەکاو مێردەکەی لە دووکانی گوڵفرۆشەکە هاتەدەرێ و بە ناهید هەرای لێکرد. زێڕین هێند پەشۆکابوو کە لە بیری چۆوە ماڵئاواییم لێبخوازێ. بە هەڵەداوان وەشوێن مێردەکەی کەوت و ڕۆیی. ڕۆیی و ئیتر نەمدیتەوە».
زێڕین بۆی نووسیبووم: «هەرکات وەڕەزیت کردم هەواڵێکم بۆ بنێرە. تەڵاقی لێوەردەگرم. شەش زگیشم کردبێ حاشا لە هەموو شتێک دەکەم.
دایکم نووسیبووی: «بیر لە زێڕین مەکەوە، گوناهبار دەبی»

وەدووی کەوتبووم. ماوەی ساڵێک بوو کە وەکوو نسێ بە دواوەی بووم. لە قوتابخانەوە تا ماڵێ. بەبێ سەرنجدان دەڕۆیی. هەر دەتگوت ناشمبینێ. کاتی ڕۆیشتن داوێنی مانتۆ خۆڵەمێشییەکەی بەسەر لەشیدا دەلەرییەوە. لە کووچەباغەکانەوە دەڕۆیشتن. زستان هاتبوو و تەواویش ببوو. بەفرەکان دەتوانەوە، وەرزی تاقیکاری بوو. تاقەتی وانە و کتێبم نەبوو. لە پلیکانە بچووکەکانی ماڵێ دەچۆسەرێ. دەرگازەکەی لە دوای خۆیەوە بە تەق و کوت دادەخست. لەبن دارێکی نارەوەن ڕادەوەستام. قرچەی نیوەڕۆ بوو. کۆڵانێکی خەڵوەت. بە گیرفان پووڵییەکەم نانەقەیسیم بۆ دەکڕی و لەبەر دەرگا لەسەر پلیکانە چیمەنتۆکان بۆم دادەنا.

ئەو ڕۆژە درەنگ گەیشتبوومێ. لەبەر دەرگای قوتابخانە ڕاوەستابوو. لەژێر تیشکی خۆر. نیگاکانی پڕ بوو لە گلەیی. وەڕێ کەوت. هەڵات. هەڵاتم. چەند کۆڵان لەولای قوتابخانە پاڵمان بە دیوارە ڕووخاوێکەوە دا و چاومان لە یەکتر کرد. هەناسەبڕکێمان بوو. هاتوچۆ زۆر بوو. چاویان لێدەکردین. گوتی: «بڕۆ. زووبە... سبەینێ، سبەینێ کاتژمێر دوو، شەقامی ڕەزاشا، لەسەر چوارڕێی پەهلەوی».

وەڕێ کەوت: بە دەنگی بەرز گوتی: «درەنگ بێی، دەڕۆم».

گوتم: «هەرچی تۆ بڵێی»

بەفر لەژێر چەکمەکانیدا سیرەی دەهات. شەو بە برسێتی خەوتم. بەیانی زوو چوومە زگ گیرفانی بابم.

نۆ خولەک و یازدە چرکە لە دووی پاش نیوەڕۆ تێپەڕیبوو کە وەدەرکەوت.

ژاکێتێکی سەوزی لەبەر کردبوو. دروست ڕەنگی چاوی بوو. هەوەڵین جار بوو ئاشق دەبووم. نەچوومە پێشێ، وام خۆ نیشاندا کە هەر نەشمدیوە. هەر جار نا جارێک لە بەردەم جامخانەی دووکانەکان ڕادەوەستا.

دەستی کرد بە چاولێکردن. شەقام قەرەباڵغ بوو. خەڵکی بۆ سەری ساڵ شتیان دەکڕی. پاڵم بە ژووری تەلەفوونەوە دابوو. دەلەرزیم. ئارەقەم کردبوو. دڵم خێراخێرا لێی دەدا. چوومەژووری تەلەفوونەکەوە، لەخۆڕا چەند ژمارەیەکم گرت. تەلەفوونەکەم دانا. نەدەبا کاتم بە هەدەر دابایە. لە دڵەخۆمدا گوتم: «ئەی چەتیوە شەیتانە ڕاوەستە با زەماوەند بکەین، دەزانم چیت لێبکەم».

بە پەلە بەنێو خەڵکەکەدا تێپەڕیم. هۆشی لای جامخانەی لیباسی پیاوان بوو. دەستێکم لە شانی دا: «سڵاو!»

گوتی: «ئەو بۆیین باخە سوور و سپی و شینە چۆنە؟ دەمهەوێ جێژنانە بۆ بابمی بکڕم»

گەڕاوە و چاوی لێکردم: «پێت جوانە؟»

چاوە زەیتوونیەکانی لە گەڵای نارەوەنی پاییز دەچوو. کەسک و شین، کەسکێکی زەرد، وەکوو تەسبێحەکەی بابم. تێکەڵێک بوو لە هەموو سەوزە زەردەکان.

گوتی: «هۆشت لە کوێیە؟»

قۆڵی کراسەکەییم کێشا: «درەنگە، درەنگە، درەنگە...»

– بەرمدە، شێتە ـ خەڵکی چاومان لێدەکەن!

ـ بابیکەن.

بە دوامدا دەهات «بڕۆین بۆ گەڕان؟»

ـ بۆ کوێ؟

ـ هەر جێیەک تۆ بڵێی... بۆ وێنە سواری پاس ببین و خولێکی شەقامەکان لێبدەین. تا ئاخری وێستگە بچین و بگەڕێینەوە... باشە؟

گوتم: «هەرچی تۆ پێت خوش بێ... بەڵام دەکرێ سینەماش بچین».

ـ بیرێکی خراپ نییە. فیلمێکی بگرە، بکوژە!

ـ نا فیلمێکی تەواو ئەشقاوی، هاواڵەکەم گوتی سینەما «دیانا» فیلمێکی خۆشی هەیە. ڕۆژی هەینی ڕابوردوو دیتبووی.

بەفر دایدابوو. چراکان هەڵکرابوون. تاریکی تەواو ببوو. لەلای پاقلەفرۆشەکەوە تێپەڕین، ئیتر گیرفان پووڵیم پێنەمابوو. گوتم: «دار بادامێکیان لە حەساریێ هەیە. چەقالەت پێخۆشە؟»

ـ ئەرێ ناوت چییە؟ خو ئێستا پێت نەگوتووم.

ـ هادی. برایەکیشم هەیە ناوی هیممەتە. زۆر لە خۆم گەورەترە.

ـ چەن سەیرە. تۆ هەرکات بتهەوێ خۆت بە کەسێک بناسێنی ناوی براکەشت دێنی؟

پێکەنی. پێکەنیم. پێم ناخۆش بوو کە بۆچی مەسەلەی عەشق و ئاشقی خۆمانی بەلاوە گرینگ نەبوو و ئێستا لەمەڕ ئەوەدا هیچیان نەگوتبوو. گوتی: «قسەیەکی خۆش بکە، زۆر خۆش بێ».

ـ بۆ وێنە چ بڵێم؟

ـ هەرچی دەزانی.

ـ سبەینێ تاقیکاری کیمیامان هەیە. حازرم نەکردووە. بەگۆڕی بابی وانەوە... دەزانی چییە، چەند رۆژی پشووی سەری ساڵ دەمبەن بۆ شیراز. بۆ ماڵی مامە ڕەزام. هەموو ساڵێ دەچین بۆ ئەوێ. تاقەتی ڕۆیشتن بۆ وێم نییە.

بە کووچە باغە تاریکەکاندا تێپەڕین. لە پشتەوە دەڕۆیی. هەمیسان بەبێ سەرنجدان بە من دەڕۆیی. دەبا حاڵیم کردبایە لەوڕۆ بە دواوە پیاوی ژیان منم. هەرام لێکرد: «زێڕین!»

ـ لەگەڵ منتە؟

ـ ئەرێ.

ـ ناوم ناهیدە.

ـ هەرچی بێت لەمڕۆ نێوت زێڕینە. هەموو کەس دەبێ بزانێ تەنانەت پاسارییەکانی سەردار...

هۆی زێڕین گوێت لە دەنگمە؟

ـ سسسسـ... چەن گێژی!

ـ بەڵێن دەدەی قژەکانت کورت نەکەیتەوە؟

ـ هەرا و هوریا مەکە، جیرانەکانمان گوێیان لێدەبێ.

ـ بە جەهەننم. هەر ئەوەیە کە گوتم.

راوەستا. «مەیەپێشێ».

ـ لەگەڵ منتە؟

ـ ئەیچی، پێت خۆشە بانگی پۆلیس بکەم.

ـ ئەگەر منت خۆش ناوێ زللەیەک لە پەنا گوێچکەم راکێشە.

ـ ئەرێ چیت لە گیانی من دەوێ؟

ـ دەی یاڵڵا، ماتەڵی چی، لێیدە ئیتر.

ـ لێم ڕەنجای؟

بەفر لەژێر پێڵاوەکانماندا سیرەسیرِی دەهات. گەیشتبووینە کۆڵانەکەیان. کۆڵان ڕووناک بوو. ڕاوەستام، گوتم: «دەزانی ئێرە کوێیە؟»

ـ بۆ خۆت چاکتر دەزانی.

ـ بێدەنگ بە دەمهەوێ ناوێکی بۆ دانێم. لەو ڕۆوە نێوی زێڕینەشارە.

چ سەیرە!

ـ پێت وایە گاڵتەت لەگەڵ دەکەم. هەر سبەینێ ژمارەی سەرکۆڵانەکە لێدەکەمەوە.

ـ حەتمەن منیش دەبمە شاژنی زێڕینەشار؟!

لەسەر چۆکێکی هەڵترووشکاو و چینی داوێنی مانتۆکەی گرت. دەتکوت جێژنی تاج لەسەر نانە.

ـ هۆی پاشای گەورە، بێزەحمەت تاجەکەم لەسەر دانێ. شنێلەکەشم بەسەرشان دادەن.

ـ ئیتر قۆرپیات بەسسە. لە بیرت بێ من هەم حەسوودم هەمیش وەفادار. وەکوو پیاوی نێو فیلمەکە نیم بڕۆم و بەجێت بێڵم.

لە پلیکانە چیمەنتۆکان وەسەر کەوت. کلیلەکەی لە دەرگاکە خست. دڵم گیرا. نەکا لە دوای خۆیەوە دەرگاکە قایم کات. گەڕاوە و گوتی: «دێیە ماڵەکەمان و باغچەی ئاژەڵەکانم ببینی؟»

دەست لەسەر سینگ ڕاوەستابووم. چاوم لە چاوی بڕیبوو.

پێکەنی و گوتی: «مەترسێ. وەرە. نامهەوێ «ڕەشی مشی»ت پێنیشان دەم. بەچکە قشقەڕەیەکی بە بۆڵەبۆڵم هەیە کە پێی دەڵێم زمان درێژ، چون

زۆری لێدەڵێ و دەقرێنێ. کووندێکیشم هەیە ناوم ناوە فەیلەسووف. چونکوو زۆر بیر دەکاتەوە و لە جێیەک ڕادەمێنێ. هەر دەڵێی لەو دونیایەشدا نییە. گوێ بگرە دەنگی قیژەقیژی زمان درێژ دێ. حەتمەن دیسان لەگەڵ فەیلەسووف بەشەڕ هاتوون».

گوتم: «دەبێ بڕۆم»

چاوم لە دەوروبەرم کرد. بە دەستی حاڵی کردم کە بە دوایدا بڕوم.

بە توندی پێکەنی و گوتی: «هەی پادشای ترسەنۆکی خێڕی. دایک و بابم چوون بۆ میوانی. ئاخری شەوێ دێنەوە. پووری گیانیشم لێتنادا.

نازانم بۆ لەپڕ هەڵاتم.

دایکم بە تەلەفوون پێی گوتم: «ئەگەر بابت بزانێ ئاشق بووی وەک خۆت لێنایەتەوە».

سوێندی خوارد بە پێ و شوێنی زێڕین نازانێ.

چ خۆشە بابم بمرێ و بڕۆیە سەر پلیکانەکان و هەواڵی مەرگی بە تەواوی دونیا ڕابگەیێنی.

- بابە گیان دوێنێ شەوێ مرد.

هیممەت وا دەڵێ. بە کوڵی گریانەوە. ناشگری. خۆ پیاو هەروا سووک و ئاسان دەست ناکا بە گریان.

دەستی کردبوو بە زۆربڵەیی: «نەکا هەستی و وەڕێ کەوی و بێیەوە. بۆخۆم هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبەم. ئەگەر پێویست بوو هەواڵت لێدەنێرم.»

لەبەر ئاوێنەکە دەستم قووچاند. ڕەنگم پەڕیبوو. نەمشکاند. مستێکم لە نێوەڕاستەکەی نەدا. بە جرینگەجرینگ نەڕژا بەسەر فەرشەکەدا. لە کراسە ڕەنگاوڕەنگەکەم دەگەڕام، دیار نەبوو. کراسە خۆڵەمێشییەکەم لەبەر کرد، بۆینباخیشم لێدا. قژیشم جوان داهێنا. بەحەوسەلە، بەتابشت دانیشتم و پێڵاوەکانم بۆیاغ کرد.

کابارە قەرەباڵغ بوو. لێوانەکان لێکدەدران.

- نۆئێل موبارەک

- نۆئێل موبارەک

گەرمام بوو. نەمدەتوانی لەسەر لاقم ڕاوەستم. شەوگاری ئەمشەو، لەگەڵ مشتەرێکانی ئارەق فرۆشەکە گۆرانیم گووتووە و دەست لەنێو دەست و شان بە شانیان هەڵپەڕیوم. بڕیارە هەموویان بانگێشتن کەم.

- هەر شتێکتان پێخۆشە داوا بکەن تا بیهێنن... ئەوشۆ ناهێڵم کەس لیرەیەک خەرج کات.

شەو درەنگانێک گەڕامەوە. هەوای بەفری هەبوو. هەر سەرسمم دەدا. دەستم بە دیوار دەگرت و دەڕۆیشتم. لەسەر پێگەردی پلیکانەکان ژنە هاوسێکەم دەرگای باڵەخانەکەی کردەوە. لە کەلێنی دەرگاوە چاوێکی لێکردم. لەسەر چۆک هەڵترووشکام و پاڵم دا بە دیوارەکەوە و دەستم کرد بە گریان.

هیممەت کوتی: «بۆ دەگەڕێیەوە؟ شۆفیری دەزانی، ژمێریاری دەزانی، چاوم دەرێ، هەموو مانگێک مووچەکەت بە ژمارە حیسێبی خۆت بۆ لە بانک دەکەم.

بابم لە نەخۆشخانە (هیممەتی) بە قەییوومی یاسایی هەڵبژاردووە. وەکوو بابمی لێهاتووە. وەکوو ئەو قسە دەکا، وەکوو ئەو دەکۆخێ. وەکوو ئەو شت دەنووسی: «بەگۆڕی بابیدا دەڕێنم. لەعیا ڕەشەش لە من بۆتە کەڵەگا. پارێزەری گرتووە. داوای ماڵ و میراتی بابم دەکا ئەویش زمانی گرتووە...»

لەعیا دەستی تولە [سەگەکانی] گرتووە و چۆتە بەر دەرگای گاراج. پیاوی دەوڵەتی لەگەڵ خۆی بردووە. دەستی کردووە بە هەراوهوریا. کاکە هیمەتیان لە دەرگای پشتەوە بەڕێ کردبوو. ئێستاش لاساری دەکا و دەیهەوێ گاراج و خانوو و پاسەکانی بدا بە پارێزەرێک بۆی بفرۆشێ و دەستی ماڵ و منداڵەکەی بگرێ و بڕوا بۆ تورکیا. دایکم کە تەلەفوونی بۆ کردم دەگریا و دەیکوت: «خەریکە خانۆکەشمان لەدەست دەچێ»

لەعیا چووبووە بەر دەرگاکەمان. دایکم نەیهێشتبوو بچێتە ژوورێ. ئەو ژنەتتیوە داد و فیغانی کردبوو و جیرانەکانی لەبەر درگا کۆ کردبۆوە. دایکم گوتی:

«بریا منیش دوای بابت بمردایەم.»
بابم دەستی لە کەلەکەی ناوە و تا ئەو سەری دیوەکە دەچێ و دەگەڕێتەوە. لێوی شین هەڵگەڕاوە. دەترسم سەکتە لێیدا. ئێستا سڵاوم لێنەکردووە دەڵێ: «قوززەڵقورت!»
قەرتاڵەی شتەکانم لێبەربۆوە. وەتاغەکەم شپرێو و شپرزەیە. دەڵێ: «ئەوانە چین؟»
لەسەر تەختە دادەنیشم. نامەکانم لە نێوەڕاستی دیوەکە بڵاو بوونەتەوە. چاوم لێدەکا: «دووسەد و حەفتا دانە نامەت نووسیوە، تەمرت لێداون بەڵام بەرێت نەکردوون. دەمهەوێ بزانم بۆ لەخۆڕایی ئەم پارەیە بەم لا و بەو لادا دەدەی. مەگەر لەسەر خەزێنە خەوتووم؟»
- ئەو نامانە تایبەتی بوون، تۆ نەدەبایە کردباتنەوە.
- گـووی وا دەخـــوا! کـێ رێ و شـوێـن بـۆ من دەبینێتەوە! خۆت تێهەڵمەقوتێنە! تا لە دەستی من نان دەخۆی مافی قسە کردنت نییە! چ قۆڕپیاتێکت تێدا نووسیون... بۆ لاڵ بووی؟
- جا خۆ تۆ هەموویانت کردۆتەوە. حەتمەن دانە بە دانەش خوێندووتنەوە نەدەبا ئەو کارەت....
- پێم خۆشە لە زمانی خۆتی ببیستم. بۆ کێت نووسیوە؟ زێڕین کێیە؟ بابی چ کارەیە؟ دایکی خەڵکی کام بەقوڕگیراوێکە؟...
ناعیلاج پەنجەرەی دیوەکەم پێوە دەدەم. لەو ڕۆژەوەی کە هاتوومەتە ڕۆم، هەر شەڕ و ناخۆشیمان لە ماڵدایە. کاتێک لەماڵەوە نەبووم چووبووە سەر سندووقەکان. بن تەخت و نێو کومێدی ئاشپەزخانە گەڕابوو.
دەیکوت: «ئەم هەموو تابلۆیەی لە روخساری کچێک کێشاوەتەوە؟!»
- زێڕین
- زێڕین. هەر ئەو کچەی کە زۆرت تاریف دەکرد و شێر و ڕێویت بۆ دێناوە....
چاوەکانی وەکوو گۆمی خوێنی لێهاتووە. بەرامبەرم ڕاوەستا و: «ئەو شتانەی کێشاوتنەوە کڕیاریان هەیە؟ یانی دەتوانی نان و گۆشت و پارەڵ ماسییان پێبکڕی؟»
- ئەم تابلۆیانەم بۆ فرۆش دانەناوە.
- ڕاوەستە بزانم. تۆ چ کارەی؟... لەبەرچی زانکۆت بەجێ هێشتووە؟ تا ئێستا دەبووی بە فرۆکەوان. ئەگەر نەبوایەتی بە فرۆکەوانیش لانی کەم کارێکت هـەردەدۆزیـیـەوە. دەمبردیە پشت مێزی گـاراج دامدەنای و گاراجداریت دەکرد
- وەکوو هیممەت...
- بەڵێ وەکوو هیممەت! لەگەڵ تۆم نییە لەبەرچی فرۆکەوانیت بەجێ هێشت؟
پێم خۆش بوو بڵێم: «ئەرێ بۆ لە ماڵەکەم نارۆیە دەرێ؟»
هیچم نەکوت. کۆتەکەم لەبەر کرد و چوومە دەرێ. سبەینێ، بە بێ هەواڵ، بێ ئەوەی پاکەتە جگەرەکەی و رادیۆ چکۆلەکەی کە تازەش کڕیبووی لەگەڵ خۆی بەرێ، رۆیی.
مادمازێل کەتی نەیگوت: «چ دڵ تەزێن!» لەسەر چرپاکە هەستا و لە لای من دانیشت. دەسرە گوڵ دۆزی کـراوەکـەی دا دەستم. نەدەبا گریابایەم. پێکەنیبووم. بە دڵپڕی پێدەکەنم.
هەر کات لەبەر هەیوانی میوانخانەکەی دانیشی هەموو ترسێکت لە دڵ دەچێتە دەرێ. دڵت لە رق و نەفرەت پاک و بێغەش دەبێتەوە. لە خوارێوە کوڕێکی چکۆلە کۆلارەکەی وە حەوا خستبوو و پەتەکەی دەکێشا. پیاوێکیش وێنەی هەڵدەگرت. کاکە هیممەت ئاشقی کۆتربازی بوو. هەموو ئێوارێیەک دەچـووە سەر سەربانی جیرانەکەمان. بابم قەت پێی نەزانی. دەمگوت: خۆ دەکرێ گوێ نەدەیە ئەمر و نیاکانی. ئاشقی پۆرترێتی مەنزەرە بوو. چەند دانەی کڕیبوو [لەگەڵ خۆی] بیانباتەوە بۆ ئێران. یەک بە یەک دەیکردنەوە لەسەر فەرشەکە پانی دەکردنەوە دووبـارە لـوول دەبـوونـەوە. بەحەوسەلە گنج و

لۆنجەکانی ڕاست دەکردنەوە.
گوتی: «دەزانی گوڵ و دار و بولبول بکێشیەوە؟»
بابم ڕۆیشتبوو. هەر بەم جۆرەی بێ هەواڵ هاتبوو بۆ دیتنم ئاواش ڕۆیشتبۆوە. دایکم و ماڵەکەشی بە ئەمانی خوا جێ هێشتبوو. دایکم دەیگوت: «هەمیشە وام هەست دەکرد لەم ماڵەوە یەکسەر دەمبەن بۆ قەبرستان.»
... نەچووبوومە باڵوێزخانە تا وەکالەتنامەی تەواو بۆ هیممەت وەربگرم.
گوتبووی: «بەسەر پێیەکەوە بچۆ، ئەوەی تری بۆخۆم جێبەجێی دەکەم. بە پۆستدا بۆم بنێرە ئیتر بۆخۆم دەزانم لەگەڵ لەعیا ڕەشە و تولەکانی چ بکەم...»
هێشتم تا خانووەکە لەدەس بچێ. گوتم: «بە جەهەننەم»
زێڕین نووسی: «نەهاتێوە. بێ هەواڵی. کاکت لەگەڵ لەعیا پێکهاتوون. خەریکە خانووەکەتان لەدەس دەردێنێ» گوتبووم: «بە جەهەننەم»
دایکم زێڕینی دەدی. لە هەموو شتێک ئاگادار بوو. دەمگوت: «بە جەهەننەم! «ئەو درۆزنە!» حەتمەن دایکم بە جێ و شوێنی زانیوە. دایکم ئیتر پێوەندی پێوە نەگرتم. زێڕین بۆی نووسیم:
«دایکیشت ڕۆیی» خانووەکەیان لێستاندبووین. خانوویەک کە هیچ کات نەیویستبوو من بگەڕێمەوە. لەگەڵ من نامۆیی دەکرد.
کە بیر لە خانووەکە دەکەمەوە، منداڵ دەبمەوە. هەرکە منداڵیش دەبمەوە، دەترسێم. دایکم لەنتەرەکەی هەڵێناوە پێش پێی خۆم نابینم. دەست بە داوێنی دایکمەوە دەگرم. هەر دەڕۆین و ناگەینە ئەو سەری حەسارێ. بۆقەکان دەخوێنن. مستەڕاح لە نهۆمی ژێر زەوییە. بە ڕۆژیش زۆر لە تاریکی دەترسم. وردە وردە دەڕۆین. گوتی: «دە بجوڵێوە ڕۆڵە، زوو بە»
بای دەهات. گڕی لەنتەرەکە هەر پتەپتی بوو. کووژاوە. دارەکانی ئەو سەری حەسارێ دەشەکانەوە. دەگریام. گوتی: «مەترسێ، وەرە باوەشم»
هەیوان ڕووناک بوو. پەڵەیەک نوور لە میوانخانەوە کەوتبووە سەر نەردەکان. دەنگی رادیۆ دەهات. ئاوازی ژنێکی غەمگین بوو.
بابم دەکۆخی. بۆقەکان بێدەنگ ببوون. ڕەنگە لە ترسی هاژەهاژی با و شنەی دارەکان. گوتم: دێوەزمەکان وەخەبەر هاتوون.
- دێوەزمە نین، دارن.
پاتۆڵەکەم تەڕ ببوو. گوتی: «لەعنەت لە بابت... گڵاوت کردم.»
وامدەزانی کاکە هیممەتیش لە دێوەزمە دەترسێ. کوتبووی: «بێدەنگ بە! هەراوهوریا بکەی لە خەو هەڵدەستن و دێنە دەستەمان...»
لێفەکەی بەسەرماندا دابوو و خۆی لە من هەڵدەساوی. بێزم هەستابوو. ئەوەم بە دایکم نەکوت. بە بابیشم نەکوت. ترسابووم. دەترسام. بابم دەیگوڕاند. دەیگوت: «خەتای دایکتە. وەکوو کچان ترسەنۆک باری هێناوی.» دەیگوت: «بوێر بە. هەرکات بە قۆچەقانی لە کەسێکت دا و سەریت شکاند بڵێ من شکاندم. بۆ دەردەپەڕی؟ مافی خۆیان بوو شاتاوڵت بۆ بێنن و...»
ئەمڕۆ بەیانی «خۆلیۆ» لە بەر چاوی گەڕۆکەکان ئابڕووی بردم. کردمی بە پەڕۆ کۆن و لەوێی دانام. گوتی: «سەرت داخە و بڕۆ. ئیتر لەم دەور و بەرانە نەتبینمەوە. هیچ کات! تێگەییشتی چیم گوت؟!
هەوا تاریک بووە. دەریای ناوەڕاست هەر لرفەی دێ. باران یەکریز بە سەر کەپرە کەتانێکەدا دەبارێ. دەنگی ساز دێ. لە قاوەخانەی خۆلیۆوە دێ. دەنگی پێکەنین دێ. ڕەنگە خۆلیۆ باسی ترسەنۆکی منیان بۆ بکا و مشتەرێکانی بە ڕیشم پێبکەنن. گیرفانیان خاڵی دەکا تاکوو مەست و خوماریان کات.
هەر کە بوو بە زستان و سەری خەڵوەت بوو دەرگای قاوەخانەکەی دادەخا و دەگەڕێتەوە بۆ بەرشەلۆنە. بۆخۆی دەیگوت کە باوکی سەرۆکی قەرەچییەکانە.

ژنەکەی پارەکە بە جێی هێشتووە و لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند ڕۆییوە. وێدەچێ کابرا عەرەب بووبێ. ڕقی لە ڕۆژهەڵاتیەکانە.
گوتی: «جا من چووزانم بۆ کوێ چووە؟ بۆ لە من دەپرسی؟»
گوتی: «حەتمەن ڕەدووی یەکێک کەوتووە ئیتر، برۆ خەریکی کاری خۆت بە. بەو کازیوەی بەیانییە سەر و دڵی منت گرتووە و ناهێڵی کارەکەم بکەم.»
مێز و چرپاکانی لە بەردەمی قاوەخانەکەی دەچنی. ئینجانەکانی بەڕیز لەبەر پەنجەرە دادەنا: «پیاوێکی بەغیرەتتر لە تۆی دیوەتەوە و وەدووی کەیفی خۆی کەوتووە بۆ چەند ڕۆژێک....»
لە بنەوە چاوێکی لێکردم. بزەی دەهاتێ. ناجسنانە پێدەکەنی. لەسەر قەراغی قاناوی شەقامەکە دانیشتبووم. جگەرەکەم هێندەی نەمابوو تەواو بێ.
کوتم: «دەمت وێک نێ....»
کاکە هیممەت کاتی شەڕ وای دەگوت. ئەگەر حەریف لەخۆی گەورەتر بوایە بۆی دەردەچووین.
کۆڵەپشتێکەم لەکۆڵ کرد و ڕۆیشتم.
گوتی: «هۆی.... بۆ کوێ هەڵدێی؟»
بە هەڵاتن بە دوامدا هات. گوتم: «تاقەتی شەڕم نییە»
لە دواوە یەخەی کۆتەکەی گرتم. بە ڕاکێش ڕاکێش بردمی. گەڕۆکەکان لە پیادەڕەوەکە، چاویان لێدەکردین. گوتی: «ئەگەر پیاوی لەبەر چاوی ئەوانەی لەم بەری شەقامەوە ڕاوەستاون، جارێکی تر ئەو قسە قۆڕانە دووپات کەوە.»
پاڵێکی پێوەنام. بە مێزێکدا درام. چەن چرپایەک بەر بوونەوە. گەڕۆکەکان پێکەنین. توند یەخەی گرتم و هەڵی هێنام. چاوی لێکردم. لووتی سوور ببۆوە وەک چۆن چاوی ئەو کاتانەی مەست و خومار دەبوو، سوور هەڵدەگەڕا. پێڵاوە ڕەشە وێڕنێکانی دەبریسکانەوە.
کاتێ پێدەکەنێ، بێزم لە ددانە زەردەکانی هەڵدەستێ.

گەڕۆکەکان ڕۆیشتبوون. سەرم لە گێژەوە دەهات. دەستم بە مێزێکەوە گرتبوو و داهاتبوومەوە. پێم گوتبوو: «لێم گەڕێ با برۆم، حاڵ و وەزعم هیچ باش نییە»
پێموابێ «جینا»ش ئەو ڕۆژە لەبەر دەم قاوەخانەی خۆلێو بووە لەگەڵ گەڕۆکەکان، بۆیە دەیهەویست دڵخۆشیم داتەوە. گوتی: «هەرکە دیتمی هەستم کرد دەبێ ڕۆژهەڵاتی بی.»
چاوی لە پەرداخە پیپسێکەی کرد. لەسەر میزەکە لای برد.
- ڕواڵەتی ڕۆژهەڵاتێکان دڵڕفێنە، تۆ عەرەبی؟
- ڕەسم کێشم
پێکەنی. «چ ڕووداوێکی سەیرە، هەمیشە پێم خۆش بوو ڕەسم کێشێکی لێهاتوو بم. گەڕۆکی؟.... هەر لەم هوتێلەدا ژیان دەبەیە سەر....؟»
- کاتێک باران دایدا ئیشتیام کرد بێم بۆ ئێرە و قاوەیەک بخۆمەوە. ڕاستت بوێ زۆر وەڕەز ببووم.... بەیانی لەگەڵ کابرایەک بەشەڕهاتووم، ئێوە لەمەڕ ئەم بابەتەدا هیچتان نەبیستووە؟
گوتی: «کاتێک لە سەفەردام درەنگ لەخەو هەڵدەستم»
جانتاکەی کردەوە. لە ئاوێنەدا چاوێکی لەخۆی کرد. بڕێکی ماتیک لە لێوی هەڵسوو.
- کارگەی هونەریت هەیە؟
بە هەڵکەوت بوومە ڕەسم کێش. لەو کاتەوە کە پشیلەکەم ون بوو. بابم قەڵەمێکی دامێ و کوتی: «بۆ ئەوەی بیری نەکەی وێنەکەی بکێشەوە.»
باران بەلێزمە دەڕژایە سەر شووشەی پەنجەرە گەورەکەی هوتێل. کوورە دێوارێکە گڕگڕ داییسا. ژووری چاوەڕوانی قەرەباڵغ بوو.
کاتێک چوومە ژوورێ تەنیا بوو. لەسەر مۆبلێک دانیشتبوو. هەستا و هاتە لای من دانیشت. کوتی: «خەڵکی فلۆرانسم. لە فرۆشگەیەکی گەورەدا کار دەکەم، سندووقدارم...»

پیپسێکەی بە قامیشێکی باریک وردەوردە هەڵدەمژی. چاوەکانی درشت و قاوەیین. ئەسمەرە، ڕەنگە لەبەر تاوی بەستێن سووتابێ. قژە سوورەکانی چین چین بەسەر شان و پیلە رووتەکەیدا هاتوونە خوارێ. لەگەڵ بابیدا دەژی. بە یەکەوە هاتوون بۆ پشوودان.
گوتی: «سبەینێ دەڕۆینەوە.»
لەبەر ئەوەی خەرج و موخاریجی سەفەرەکەیان زۆر نەبێ ناعیلاج تەنیا دیوێکی هوتێلەکەیان گرتووە.
گوتی: «تۆ هەمیشە ئاوا بێدەنگی؟»
پێی خۆش بوو بچێتە قاهیرە و لە ئەهرامی میسر وێنە هەڵگرێ. دەستگیرانەکەی وێنەگر بووە. لە کارەساتێکی ترۆمبیلدا هەر دووک لاقی پەڕیوە و ئیتر پێی خۆش نەبووە ئەو ببینێ.
گوتی: با باسی کەس نەکەین... ماندووم کردی. جاری وایە دەست دەکەم بە زۆربلەیی»
گوتی: «پاییزی فلۆرانس شیاوی دیتنە، هەموو هەر ڕەنگە»
سبەینێ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی. دەکرێ بچی بۆ هوتێل و بانگێشتنی بکەی بۆ قاوەخانەی خۆلیۆ. دەنگی فیتووی کەشتی دێ. هەرکە لەنگەری گرت گەڕۆکەکان بە کەیف و خۆشێوە لە پلیکانەکان دێنە خوارێ و ژیانی شەوانەیان دەست پێدەکات.
بە مادمازێل کەتیم کوت: «تۆ قەت ئاشق بووی؟» چاوێکی خۆڵەمێشی لێکردم. خۆڵەمێشی غەمگینترین ڕەنگە. پیاڵە قاوەکە لە دەستیدا دەلەرزی. لەسەر مێزەکەی دانا و خۆی لە نێو لەچکە کەشمیرێکەیدا شاردەوە.
ڕەنگە شینەکەی ئاسمان، وەنەوشەیی هەڵدەگەڕا. چەن قشقەڕەیەک ڕەپێی یەکتر دەکەوتن. شەوبۆکان کرابوونەوە. دەبا هەستابایە و چووبا دەستێکی بە پەلکی گوڵەکاندا بهێنایە. بەڵام نەچوو. دەبا گوتبای:
«کەمێکی تریش قاوە ماوە، بۆت تێکەم؟» وای نەگوت. لە بێدەنگێکەی ترسام. دڵم وە تەپەتەپ کەوت. هەستم کرد خەریکە ڕووداوێکی ناخۆش ڕوو دەدا. قەت باسی خۆی نەکردبوو. لە ڕابوردووی هیچم لێ نەپرسیبوو. لەمەڕ ئەشقەوە قسەمان نەکردبوو. فەوارەکان هەڵدەسووڕان و ئاو دەچۆ سەرێ و دەهاتە خوارێ. دەرژایە نێو حەوزە چکۆلەکەی نێوەڕاستی مەیدان. دەبا کارێکم کردبایە. قسەیەک بکەم و وە پێکەنینی خەم. زەینم هیچ وشەیەکی تێدا نەبوو. پشیلەکەی لە خوار نەردەکەوە لەسەر زەوی ڕاکشابوو و دەستەکانی دەلستەوە. گوتم: «ئەرێ پشیلەکەت دەزانێ پاپیۆن ببەستێ؟»
دەسرە گوڵ دۆزی کراوەکەی ئێستا بە دەستمەوە بوو. قەدم کرد. لە کن پیاڵە بەتاڵەکە لەسەر مێزەکە دامنا. دەنگی فیتووی کەشتی لە دوورەوە دەهات. هەستا و تا لای نەردەکە رۆیی. کەشتی چەند فیتووی بە دوای یەکدا کێشا.
ئەگەر درەنگ چووبامەوە ژنە خاوەن ماڵەکە دەرگای لێنەدەکردمەوە. ناعیلاج تا بەیانی دەبا لە شەقامەکان خولابامەوە. هەر کە کۆڵەپشتێکەم هەڵگرت، کوتی: «زۆر لەمێژە ئەم دوورگەیەم نەدیوە»
چاوەکانی هێندە تەڕن بریسکەیان دێ. شین شین چاوم لێدەکا. زەیتوونی چاوم لێدەکا. تێکەڵاوێک لە تەواوی ئەم ڕەنگانەی بۆ ساز کردنی ڕەنگی چاوی زێڕین دروستم کردبوو و لەسەر بوومەکە جوان دەرنەهاتبوو.
دەڵێ: «ئەمشۆ بمبە بۆ قاوەخانەی پیترۆ، دەمهەوێ لە نزیکەوە ئانجێلا ببینم. دەڵێن دەنگێکی خۆشی هەیە.»
قاوەخانەی پیترۆ قەرەباڵغە. پیترۆ مێزەکەمان لەبەر پەنجەرە بۆ دادەنێ. زۆر سەیرمان چاو لێدەکا.
باوەڕ ناکا ئێمەی بە یەکەوە بینیوە. کووپەیەکمان شەڕابی کۆن بۆ دەکاتەوە.
- میوانی من بن.
دەڵێم: «وەرە ئەمشەو خۆمان مەست و پاتیل کەین و بیدەینە لانی بێعاری.»
مادمازێل کەتی قاقا پێدەکەنێ. پەرداخەکەی هەڵدێنێ. کراسە پەمەیییەکەی زۆر پێدەکەوێ.

دەڵێ: ماوەیەکی زۆرە لەبەرم نەکردووە. پێڵاوە زەردە پاشنە درێژەکانی دەداکەنێ و دەیخاتە بن میزەکە. دەڵێ: لاقم دەگرن.
- دەیجا چییە پێخاوس بم، سینیوێرا!
- چاوێکی لێدەکەم، هەر دەڵێی بۆ هەوەڵین بارە دەیبینم: «چاو و برۆیەکی جوانت هەیە، بۆ تا ئێستا پێت نیشان نەدابووم»
سەڵاتەم بۆ تێدەکا و: «قسەکانیشت خۆشن.»
- تا ئێستا خۆت لە ئاوێنەدا بینیوە.
پێدەکەنێ. پێکەنینیشی پێدەکەوێ: «نا سینیوێر، قەت.»
پیاڵەیەک سۆس بە سەڵاتەکەمدا دەکەم. کارد و چنگاڵ هەڵدەگرم. دەڵێ: «وا دیارە زۆرت برسییە.»
- پیاو کاتێک بە تەنیا نان دەخوا وەگیانی ناکەوێ.
پیاوێک بە شێوەی فلامینگۆ هەڵدەپەڕێ. پیترۆ چێشتەکەمان بۆ دێنێ، دوو قرژاڵی گەورە.
- ڕاوی ئەمڕۆیە. بەقەت نەهەنگێک دەبن.
مۆمەکانی سەر مێزەکە هەڵدەکا و دەڕوا. دەڵێم: «حەوتووی داهاتوو دێمەوە و وێنەکەت دەکێشمەوە. لەسەر دەرگای میوانخانەکەتی بدە.»
شەومان بە خۆشی ڕادەبوارد کە سەر و سۆراغی ئانجێلا پەیدا بوو. حەشیمەتی نێو قاوەخانەکە چەپڵەیان بۆ لێدا. گیتارەکەی هەڵگرت و لەسەر چوارپایەیەک دانیشت و دەستی کرد بە گۆرانی گوتن. مادمازێل کەتی بێدەنگ بوو. هەر دەتکوت من نابینێ. بازۆڵە کزەکانی کردبوو بە کۆڵەکە و وەبەر چەناگەی دابوو و چاوی لە ئانجێلا دەکرد. تا ئاخری شەوێ لە بێدەنگیدا گوێی دایە. نانەکەشی تەواو نەخوارد.
لەسەر چرپاکە هەڵمساند: «بچینە دەرێ و پیاسە بکەین.» ئانجێلا لە بەرامبەر حەشیمەتەکەدا بە نیشانەی سوپاس داهاتبۆوە. چینی داوێنەکەی بەسەر تەختی هۆڵەکەدا کە بە سڕامیکی سوور نەخشابوو، بڵاو بۆوە.

بەستێن فێنک بوو. مادمازێل کەتی لە پێش منەوە دەڕۆی. وردەوردە دەڕۆیی. هەست بە تەنیایی دەکەم.
گوتم: «وەرە ئاگرێک بکەینەوە، زۆر خۆشە»
تاکوو لای دارەکان چووین، چرپی و دار کۆ کەینەوە. کۆلکەدارەکان گڕگڕ دەسووتان. سوور ببوونەوە. چاوی لە گڕەکان بڕیبوو. گوتی: «منیش سەردەمێک گۆرانی بێژ بووم.»
دەستەکانی بە ئاگرەکە گەرم کردەوە: «داچڵەکانێک مـرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕابـــوردووی بۆ خولیا وەدینەهاتووەکانی. زۆر لەمێژ بوو بیرم لەو قسانە نەکردبۆوە.»
سەرم گەرم داهاتبوو. لەگێژەوە دەهات. پێم خۆش بوو سەر بکەمە سەر شانی و چاوم لێک نێم و ئیتر بیر لە ڕابوردووم نەکەمەوە. پێم خۆش بوو گۆرانی بڵێ. بۆ منی بڵێ. پەمەیی بیڵێ. لە بەهاردا، دەنگی پەمەیی دارەکان حەساری ماڵێمان پڕ دەکات.
دەنگی ساز دێ. لە فلووت دەچێ. لەو لای ئێمەوە، چەن کەسێک لەژێر نیسێی مانگەشەودا، دەستیان لەنێو دەستی یەکتر نابوو، خۆیان ڕادەژاند. سەرخۆش بووم. نەدەبا مادمازێل کەتی لێی شێواندبایەم.
گوتم: «چۆنە بچین و لەگەڵیان هەڵپەڕین»
هۆشی لای من نەبوو. چاوی لە گرشەگرشی بەردەوامی ئاگرەکە بڕیبوو. هەر دەتگوت لەگەڵ گڕەکان قسە دەکا. گوتی: «دەنگم خۆش بوو. لەگەڵ گرووپی کۆڕ لە کەلیسا گۆرانیم دەگوت. ڕۆژێک بڕیارم دا دەبێ تەواوی دونیا گوێی لە دەنگم بێ، لەگەڵ گرووپێکی مۆسیقاژەنی گەڕۆک لە مەسکەوەوە، وەڕێ کەوتین. شار بە شار دەڕۆیشتین. وامان دانابوو بۆ خەڵکی کۆڵان و بازاڕ فێستیوالی گەورە و بەشکۆ پێکبێنین. گیرفانم خاڵی بوو. بەڵام دونیایەکم خولیا و ئارەزوو هەبوو. لە باغە گشتێکان پرۆگرامماں پێکدەهێنا. هەر لەوێ لەبن دارەکان دەخەوتین. بەڵام هیچ کات دەنگی گۆرانی من لە درگای پارکەکە زیاتر بڕی نەکرد. زۆربەی ساتەکان برسی بووم. برسی و بێ

حەوسەلە»
مانگ لەژێر هەوردا بوو. دەریا تاریک و هەڵمساو پاڵی بە شەپۆلەکانەوە دەنا. تا سەر خیزە شینەکان ڕایـدەدان. لەسەر گاشە بەردێک دانیشت. گوتی: «گەیشتینە بەیرووت. بەیرووت شارێکی چکۆلە و جوان بوو. لەگەڵ کابرایەک بووم بە دۆست. دەنگی منی پێ خۆش بوو. گوتی: تەنیا بۆ من گۆرانی بڵێ. گرووپەکە ڕۆیی. ئیتر بۆم گرینگ نەبوو گۆرانی بڵێم یان نا»
دەنگی فلووت نەدەهات. کەسیش هەڵنەدەپەڕی. تەنیا دەنگی هاژەی ئاو دەهات. گڕی ئاگرەکە باڵی دەگرت و لە تاریکیدا ون دەبـوو. وەڕێ کەوتین. وردە وردە بە درێژایی بەستێنەکەدا ڕۆیشتین. گوتی: «هەرچی بۆم باس کردی لە بیری بەرەوە، ئەو قسانە هی ڕابوردووم بوون. پێت خۆشە کەمێک هەڵێین؟»
گوتم: «هەر کەس زووتر بگاتە دارەکانی ئەو بەر، ئەو بردوویەتەوە»
لەسەر هێڵک لە پەنای یەک ڕاوەستاین. شەپۆل دەهاتە پێشێ و لاقمانی تەڕ دەکرد. کاکە هیممەت کارێکی دەکـرد مـن بـیـبـەمـەوە. لـەسـەر چۆک نووشتابوومەوە. دڵەکوتێم گرتبوو. هەنگاوێک لەو لە پێشتر بووم. سەری قامکم لە دیوار درابایە گەمەکەم بردبۆوە. دایکم لە سووچێکی حەسارێ، لە لای تەنافی لیباسەکان بە نیگەرانێوە چاوی لێدەکردم. وە هەناسەبڕکێ کەوتبوو. ڕاوەستا: «ماندوو بووم، تۆ سەرکەوتی!»
نەمهێشت گەمەکە بباتەوە. وە پێشی کەوتبووم تا سەری قامکم لە دارەکە بدرێ.
بەرەندە بوون، مەلێ کردن بە لەشێکی ئارەقاوێوە، ڕاکشان لەسەر پشت و لەنێو ئاودا بە هێوری جۆللانە کـردن.... شەپۆل پاڵی پێوە دەنام و دەیبردمە پێشێ. مادمازێل کەتی لە نیسێی ڕووناکی بەستێن لەسەر تەختەبەردێک دانیشتبوو. هەستم کرد ئاگای لێمە. نیگەرانمە.
هێشتی سەر لە سەر شانی دانێم. لەچکە کەشمیرێکەی بە لەشە تەڕەکەمدا دا. تاریکی خەریک بوو لەناو دەچوو. گوتی: «دواهەمین جار بۆ بەڕێکردنی ئەو هاتم بۆ ئەم بەستێنە، کەشتی لە شوێنی وەستانەوە بـزووت، لەسەر پانتایی کەشتێکەوە ڕاوەستابوو. دەستم لێ هەڵنەهێنا. بەڵام بڕیار بوو بڕوا. دەبا ڕۆیشتبایە. نزیکی مانگی ژانویە بوو. ئەم لەچکە کەشمیرییەم بە خۆدا دابوو. بەڵام هەڵدەلەرزیم. دەگـەڕاوە بۆ بەیرووت. لەو بەیرووتە خۆشەشدا، دونیا هێند بچووک بوو کە بنەماڵەکەی نەیانهێشت بە یەکەوە زەماوەند بکەین. هەر بۆیە وەڕێ کەوتین و سەرمان لە ئیتالیا و ئەم دوورگەیە دەرهێنا. بەڵام ژیانی ئەشقاوی ئێمە زۆری نەخایاند. ڕۆژێک گوتی بیری وڵاتەکەی دەکا.»
دەستیم گرت. سارد بوو. با، خۆڵەمێشی ئاگرەکەی لەگەڵ خۆی دەبـرد. گوتی: «بەیانییە، دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ میوانخانە»
ئێستا سەرم هەر لەسەر شانی بوو. لەشی بۆنێکی سەیری لێدەهات. عەتری ژنێک کە لە حەمام هاتبێتە دەرێ. بۆنی لەشی دادە وەجیها، بێوەژنەکەی جیرانمانی لێدەهات ئەو کاتەی نانەکەی لە دەستم وەردەگرت. بوخچەی حەمامی لە نێوەڕاستی وەتاغێ کردبۆوە و مەمکبەندەکەی لەسەر فەرشەکە کەوتبوو. گوتی: «بژی کوڕە باشەکە! زەحمەتت کێشاوە. من حەزم لە نانی تافتۆنە. ئەوەش پارەکەی.»
مەمکبەندەکەی لەسەر فەرشەکە هەڵگرت و لەبن داوێنی شاردێوە: «ئیتر بڕۆ. کوڕێکی وەکوو تۆ بچووک باش نییە حیز بێ. تۆش هەر لە براکەت دەچی!»
ئیتر نەچووم بۆ لای. کاتێک گـەورە بووم لەنێو جێگاوباندا وەبیرم دەهاتەوە.
مادمازێل کەتی گوتی: «بیر لە چی دەکەیەوە؟»
ـ لە ژنان.
پێکەنی: «لە ژنان. دەی زۆر چاکە.»
ـ لە نزیک بوونەوە لە ژنان دەترسم.

پشتی دەستمی داماڵی. چاوم لە ئاسۆی ڕوون دەکرد. لە بن لەچکە کەشمیرێکەیدا گەرم داهاتبووم: «دەزانی چەند ساڵم تەمەنە؟ سی و پێنج ساڵ. ئێستا دەستی کچێکم لێنەدراوە.»
سەرم لە سەر شانی لابرد و پاڵم بە بەردەکەوە دا. بابم دەیکوت: «لەگەڵ کچان چۆنی؟»
فریوم دا. ئیزابێل کوتی: «دەیجا لەبری ئەو، فەرشە چکۆلە ئاورێشمێکەی بەر دەرگـای حەمامەکەم دەیە.»
بابم ئیزابێلی لەسەر پلیکانەکانی ماڵەکەم دیتبوو کە مەلافەیەکی لەخۆیەوە پێچاوە و هەڵدێتە خوارێ.
گوتم: «بە نووکە شەق وە دیوی دەرێم ناوە»
گوتم: «نابێ زۆر ڕوو بدەی بە ژنان»
لە بنەوە چاوێکی لێکردم، سمێڵی دەجوو: «دەی... دەی... زۆر چاکە.»
گوتم: «ناهێڵن پیاو دەرس بخوێنێ. ئێستا نەهاتوون دەیانهەوێ خۆ لە ژیانت هەڵقوتێنن و بزانن چی بە چییە؟ هەر لێت دەپرسن ئەرێ حەمامەکەت لە کوێیە، خاولی من کامەیە، کلیلی زیادیت هەیە، دەکرێ جاروبار بێم و سەرێکت لێهەڵێنم؟»
هەوەڵین جارە هاتووە سەردانم بکا وا دەزانێ کوڕی چاکم و خەریکی کاروباری خۆمم.
دەڵێ: «پیاو جارجارە سەرقاڵیش بێ، خراپ نییە»
لە پەنجەرەوە چاو لە دەرێ دەکـا: «هەواکەی ناخۆش نییە. تا ئێستا شەوی ئێرەم نەبینیبوو.»
لەبەر ئاوێنەکە عەتری لەخۆی دا. دەڵێ: «دەزانی فرۆکە لێخوڕی؟» دەڵێم: «ڕاوەستە با وانەکەم تەواو بێ»
دڵنیای دەکەم کە هێندەم نەماوە فرۆکە وەحەوا خەم. دەڵێ: «نانم بە حەڵاڵت بێ، ئەلحەق کوڕی خۆمی»
کووچە و کۆڵانە کەونارایی‌یەکانی ڕۆم دەگەڕێین. شەوێ پیتزامان خوارد. دەیگوت: «ئەوە خواردنی لووسکە و مووسکەیە، دەستاوی دایکت شتێکی کەیە»
بردمە کاباره. ئێستا دانەنیشتبوو، هەستا. گوتی: «هەستە بڕۆینە جێگایەکی ئەلاحیدە و خەڵوەت، دەترسم دۆستێک، ناسیاوێک بمبینێ و ئابڕووم بچێ»
قاوەخانە بە قاوەخانە دەڕۆیشتین. تەواو سەرخۆش بوو. لە کوڵانێکی خەڵوەت دەستی کرد بە گۆرانی کوتن. کۆتەکەی داکەندبوو و بەسەر شانی‌دا دابوو.
گوتی: «سـەردەمـی لاوەتیت وەبیر هێنامەوە، هەتیوە!»
گوتی: «نەچی مەسەلەی ئەوشۆ لە نامەیەکدا بۆ دایکت بنووسی؟»
کوتی: «ئیتر کاتی ئەوەیە زەماوەند بکەی. دەبێ دایکت بنێرم بۆ خوازبێنی.»
لێی پرسیم: «تا ئێستا لەگەڵ کەس...»
مادمازێل کەتی لەوانە بوو لەبەر پێکەنین لەبەر یەک چێ.
گوتم: «خۆم بە زۆر شتەوە سەرقاڵ کردووە. سینەما، فیلمی لێدان و کوتان، چیرۆکێکی عەشقاوی کە تا ئێستا پتر لە سەد جارم خوێندۆتەوە... ژنانێکی زۆریش لە ژیانمدا هەبوون. هاتوون و ڕۆیشتوون»
«سەندی» ئەمریکی بوو، و ئاشقی مۆد و جل و بەرگ بوو. دەیگوت: «هەڵەم کردووە ئاشقی تۆ بووم کە لەگەڵ تۆ دەبم هیچ هەست و هانەیەکم نامێنێ. هەست دەکەم ناحەزم. تۆ منت وەبەر چاو نایا. تاریفم ناکەی، پیاوانی تر خوداخودایانە تەنیا چرکەیەک لەگەڵ من رابیوێرن.»
لەسەر تەختەکە ڕاکشابوو و لە تاریکیدا جگەرەی دەکێشا: «تاکسییەک بانگ کە بمباتەوە بۆ هوتێل.»
لەسەر کاناپەکە هەستام. تاکسییەکم بۆ بانگ کرد. بێ‌ماڵئاوایی ڕۆییشت.
ماریا حەزی لە کاری نێوماڵ بوو. جل و بەرگی بۆ دەشتم و ئـوتـووی دەکـرد. چێشتی خۆشی لێدەنا. فێرم کردبوو کفتەی نێو تاوە لێنێ. بابم لە ئێرانەوە تۆوی ڕیحانەی بۆ هێنابووم. ماریا لەنێو

ئینجانەیەکدا چاندبووی. هەموو ڕۆژێ سەرێکی لە ماڵەکەم هەڵدێنا و ئاوی دەدان. ئاخرێکەی ئەویش ڕۆیی. دەیگوت: «دایکم و بابم بە خۆشەویستی ئێمەیان زانیوە، دەبێ زەماوەندم لەگەڵ بکەی.» کاتۆلیک بوو. دەیهەویست کۆشێکمان منداڵ هەبێ.
سۆفیا دەیـگـوت: «ژیـان بردنەسەر لەگەڵ تۆ شێتییە!» پێی خـۆش بـوو حەسوود و دڵپیس بم. شەڕانی بم. بەو پیاوانە دەنازی کە لە ژیانیدا هەیبوون. بەبێ سرنج دان بە قسەکانی گوێم بۆ ڕادەگرت و پێدەکەنیم.
خاوەن کارخانەیەکی فریودا و ڕۆیی. قەڵافەتێکی گـەورەی هەبوو. زۆری دەخـوارد. هەر کە تێری دەخوارد دەستی دەکرد بە گریان. دەیگوت: «چۆن تۆ سەرنجم نادەیەی، من قەڵەو بووم» هەمیشە دەچووە زگ یەخچاڵ. ڕۆییشت، ئیتر نەمدیتەوە.
مارگرێت پەرەستاری منداڵ بوو. ڕۆژانی دووشەممە دەهات بۆ ماڵەکەم. لە پارک لەگەڵ یەکتر بووین بە دۆست. کە وێنەی ڕوخساریم کێشاوە، گوتی: «بۆچی قژمت درێژ کێشاوەتەوە؟» گوتم: «هەر ئەوەیە کە دەیبینی، پێت جوان نییە، پارەکەی مەدە»
لە پشت دارەکانەوە هاتبوو. ساکەکەی پێچاوە و ڕۆیی. سەرمام بوو. لەرزم لێهاتبوو. قرچەقرچی ددانـم دەهـات. مەلافەکانی لە خۆوە پێچابوو بە پلیکانەکاندا دەڕۆیشتە خوارێ.
ـ نابێ زۆر ڕوو بدەی بە ژن.
بابم لە بنەوە چاوی لێدەکردم و پێدەکەنی: «پیتزاش ناخۆش نییە»
هەڵدێ. سەر پلیکانەکان تەڕ بووە. باران بێ وچان دەبارێ، پیاو وەڕەز دەکا.
لێیدا ڕۆیی، ئیتر نایەتەوە. دڵم دەڵێ تازە ناگەڕێتەوە.
پیترۆ گوتی: «وە شوێن ئەشقی ونبووی کەوتووە»
بابم گوتی: «تا ئێستا لەگەڵ کەس...»
ماندوو بووم. لەگەڕان ماندوو بووم. بووم و سێپایە و کۆڵەپشتێکەم هەڵدەگرم و تا ئەو سەری مەیدان هەڵدێم.
گوتی: «دا بزانم نێو پیاڵەکەت چی تێدا دیارە؟»
کـوتـی: «بەیانییە، دەمـهـەوێ بگەڕێمەوە بۆ میوایءانە»
ـ پشیلەکەمم دەوێ.
ـ هەمووی خەتای دایکتە.
ـ پشیلە، نەخۆشی دێنێ، هەر....
ـ لە کۆڵم بەوە، با بخەوم.
یەکێک لە شانم دەکوتێ. تەکانم دەدا. ڕۆبێرتۆیە.
ـ هۆی هەتیو خەوت لێکەوتووە؟! دوو سەعاتە لەو سەری مەیدانەوە چاوت لێدەکەم. وامزانی.... ئاخر نەدەجووڵایەوە.
دەنگی ساز دێ. دەبێ ئاکوردئۆن بێ.
ـ دەستم لێ هەڵگرە. حەوسەلەی شەڕم نییە.
سەرم هەڵدێنێ. چاوی لێدەکەم. وێنەکەی لەبەر چاوم تاریکە و دەلەرزێتەوە. پێدەکەنێ: «بڕێکم پارە بە قەرز دەدەیتێ؟»
هەڵدەستم. سەرم لە گێژەوە دێ. کۆڵەپشتێکەم هەڵدەگرم و دەڕۆم. وەدووم دەکەوێ.
ـ لیرەیەکیشم لە گیرفاندا نییە. چاو! گیرفانم خاڵییە. هەمووم دۆڕاندووە.
لە قاوەخانەی خۆلیۆوە دەنگی پێکەنین و هەڵپەڕکێی قەرەچێکان دێ. دەڵێی بچی و قاوەخانەکەی لێ بشێوێنی. ڕۆبێرتۆ قۆڵی کۆتەکەم دەکێشێ: «لانی کەم جگەرەیەک.... خومارم»
وێستگە خەڵوەتە. باران دەبارێ. سواری پاسەکە دەبم. لە ڕیزی ئاخر دادەنیشم. خولیکی مەیدان لێدەدا. چرای سەر دەرگای هوتێلەکان هەڵدەبن و دەکوژێنەوە. میوانخانەی مادمازێل کەتی ڕوو بە دەریای ناوەڕاست، خامۆش ڕاوەستاوە. پێڵۆکانم دەکەونە سەر یەک.
سەرچاوە:
الیاتی، میترا، مادمازل کتی و... چند داستان دیگر
نشر چشمە، تهران

# ئەفسانەی ئینانا و خودای عەقڵ

نووسەران: میهرەنگیزی کار، شەهلا لاهیجی
و. لەفارسییەوە: لەیلا ساڵحی

سترانی ئەفسانەی «ئینانا و خودای عەقڵ» ئەفسانەی بەدیهاتنی «می» بۆ خەڵکی «ئۆرووک» دەگێڕێتەوە. «می»یەکان یان یاسا ئاسمانییەکانی شارنشینی و شارستانەتی، بۆچوونێکی فەلسەفین لەسەر ئەمراز و ماکە و دیاردەکانی ژیانی شارنشینی. لێکدانەوەیەکی جیهان بینانە و هەمەلایەنەیە لە چۆنیەتی تێکۆشانی مرۆڤ بۆ وەدەس هێنانی شارستانەتی. لە سەرجەمی یاساکانی «می»دا، چاکە و خراپە لێک جیانەکراونەتەوە، بەڵکوو بەشێوەیەک هاوشان و هاوڕێی یەکترین: جووانی و ناحەزی، عەداڵەت و بێ عەداڵەتێ، سەردوولکە و غەزەل، دۆستی و دژایەتی، شەڕ و ئاشتی، پیشەسازی و ئەرک و خزمەتی شار، ئەمرازی شادی هێنەر و چەکە مەرگ هێنەرەکان، وێکڕای یەک لەم کۆمەڵەدا کۆکراونەتەوە.

کۆمەڵەیەک کە بێ ئامادەبوونی یەک بەیەکی ماکەکان و دیاردەکانی ژیان و ژیاری شارنشینی مانای نییە. ئینانا، خاتووخوای پشتیوانی شاری «ئۆرووک» پاش ئەوەی کە بەهاوکاری «گیل گەمیش»ی قارەمان تەختی دەسەڵاتداری و پێخەفی ژن و شوویی خۆی وەدەس دێنێ، ئەمجار دەخوازێ شادی و خۆشی و پێشکەوتی خەڵکی «وڵاتەکەی» خۆی زۆرتر بکات، بۆ وەدیهاتنی ئەم ئاواتەش، پێویست بوو یاسا ئاسمانیەکانی «می» کەلە ئیختیاری «ئینکی» خوای عەقڵ دا بوو، وەدەس بێنێ. ئینانا بەرەو «ئابزۆ» لە «ئۆریدو» وەڕێ دەکەوێ تا لە وڵاتی ژێردەسەڵاتی خوای عەقڵ دا دەسەڵاتی خۆی هەڵسەنگێنێ. ئەفسانەکە بەم جۆرە وتراوەتەوە:



«ئینانا» «شۆگۆرای» لەسەرنا
که تاجی شاژنی زەوینە بەرینەکان بوو
چووە ئاغەڵ بۆلای شووانە
پاڵی دا بە کۆتەرەی دارەسێوێکەوە
ئەو دەمەی کە پاڵی دا بەدارەکەوە، منداڵدانی زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو
ئینانا، ژنی لەبار، وێڕای ئەوەی "لەدیتنی" منداڵدانی سەیری خۆی شادمان بوو
لە خۆی بایی بوو و
گوتی:
«ئەمن شاژنی ئاسمانم و دەچمە دیداری خوای عەقڵ
دەچمە «ئابزۆ» ئەم شوێنە پاکەی «ئۆریدۆ»
بەرەکەت دەبەخشم بە «ئێنکی» کە خووای عەقڵە لە «ئۆریدۆ»
«لە ئاوەقووڵە شیرینەکان دا سەنای ئێنکی دەکەم.»

ئینانا بە تەنیا وەڕێ کەوت
ئەودەمەی مەودایەکی وای نەمابوو بگاتە «ئابزۆ»
ئەو "پیاوە" کە گوێچکەکانی زۆر سووکن
ئەو کە ئاگاداری «می»، یاسا پیرۆزەکانی ئاسمان و زەمینە.
ئەو کە ئاگای لە دڵی هەموو خوداکانە
«ئینکی» خووای عەقڵ کە ئاگاداری هەموو شتێکە
هەرای «ئیزیمۆد»ی غوڵامی کرد:
«وەرە غوڵامی من
ژنی لاو خەریکە دەگاتە بارەگای «ئابزۆ»



ئەو دەمەی ئینانا هەنگاوی نایە باڵەخانەی پیرۆزەوە،
کوللێرە ناسکەی دەیە بابیخوا
ئاوی ساردی بدەیە با دڵی فێنک بێتەوە
لە بارەگای پەیکەرەی شێردا ئابجۆی پێشکەش بکە
وەک هاوتایەک ڕێزی بگرە
ڕێز لە ئینانا بگرە، لەسەر خووانی پیرۆز، خووانی ئاسمان»

«ئەیزیمۆد» وتەکانی ئێنکی بە دڵ بیست.
ئەو کاتەی ئینانا هەنگاوی نایە «ئابزۆ»وە
کوللێرە ناسکەی دایە تا بیخووا
ئاوی ساردی دایە هەتا بیخواتەوە
لەبەرامبەر پەیکەرەی شێر ئابجۆی پێشکەش کرد
ڕێزی لێگرت
ڕێزی لە ئێنانا گرت لەسەر خووانی پیرۆز، خووانی ئاسمان
«ئێنکی» و ئێنانا پێکەوە ئابجۆیان خواردەوە
ئەوان دیسان بەیەکەوە ئابجۆیان خواردەوە
ئەوان سەرلەنوێ بە لووزە و ئابجۆیان خواردەوە
بە جامە زەردەکانیان لیپاولیپ
بە جامەکانی «دۆراش» دایکی زەوین
بەسڵامەتی یەک پێکیان هەڵدا
«ئێنکی» سەرخۆشی بادە و بە شادی ئینانا خواردیەوە و "گوتی":

«بە ناوی دەسەڵاتم، بەناوی بارەگای پیرۆزم!
پێشکەشی دەکەم بە کچم ئینانا:
کاهینەیی مەزن! خودایەتی
تاجی نەجیبزادەیی پایەدار! تەختی شاهی!»
وڵامی داوە ئینانا:
«قەبووڵم کرد»



ئێنکی جامەکەی خۆی هەڵێنا و دووهەم جار بەشادی ئێنانا خواردییەوە:
«بە ناوی دەسەڵاتم، بە ناوی بارەگای پیرۆزم!
پێشکەشی دەکەم بە کچم ئینانا
سەداقەت!
داکشان بەرەو جیهانی ژێرەوە! هەڵکشان لە جیهانی ژێرەوە
هونەری ئەویندار بوون! ماچ کردنی ئەندامی نێرینە
وڵامی داوە ئینانا:
«قەبووڵم کرد»

ئێنکی جامەکەی خۆی هەڵێناو بۆ سێهەم جار
بە شادی ئینانا هەڵی داو "گوتی":
«بە ناوی دەسەڵاتم، بە ناوی بارەگای پیرۆزم
پێشکەشی دەکەم بە کچم ئینانا
بەڕێوەبردنی چەمەری، خۆش کردنی دڵەکان
دادوەری کردن، بڕیاردان
وڵامی داوە ئینانا
«قەبووڵم کرد»
(چاردەجار ئێنکی بە شادی ئینانا جامەکەی هەڵدا.
چاردەجار پێنج «می» و شەش «می» و حەوت «می» پێشکەشی کچەکەی کرد
. چاردە جار ئینانا «می» پیرۆزی قەبووڵ کرد.)
پاشان ئینانا لە هەمبەر ئێنکی دا ڕاوەستا و
بە سوپاس لە ئێنکی کە «می» "واتە یاسای ئاسمانی" پێ بەخشیبوو، گوتی:

باوکم «می» پێشکەشی من کرد
کاهێنەیی مەزنی دامێ
پلەی خودایی پێ بەخشیم
تاجی چاکی و هەرمانی لەسەری من نا
تەختی شاریاری دامێ



راوێژکاری باشی پێپێشنیار کردم
غوڵامی چاکی پێبەخشیم
گۆچان و گەزی پێوانی دامێ
تەختی مەزنی شاریاری خستە ژێر پێی من
"ئەو پیشەی" شوانی دامێ و
«شکۆ»ی پاشایی پێبەخشم



❊❊❊

شازادەی کاهێنەی دامێ
شاژنی ئاسمانی کاهێنەی بۆ ناردم
کاهێنی جادووگەری «نەزرکردم»
کاهێنی بە ئەسڵ و نەسەبی پێ بەخشیم و
کاهێنی شەڕابخۆری پیرۆزی دامێ (ڕێوڕەسم)



***

"باوکم" ڕاستەقینەی بەخشی بە من
داکشان بەرەو جیهانی ژێرەوەی خەڵات کردم
هەڵکشان لە جیهانی ژێرەوەی پێشکەشم کرد
باوکم «کوورگارای» دامێ



***

"بابم" نەشتەر و شمشێری دایە دەستم
جلی ڕەشی "لە بەر کردم"
لیباسی نەخشینی بە خەڵات دا بە من
"نهێنی" چڕ بوونەوەی مووی پێدام
"نهێنی" کۆکردنەوی پەڵکەی پێبەخشیم.



❊❊❊

"باوکم" ئامرازی هەڵسەنگاندنی بەخشی‌یە من
ئەو رمبی خەڵات کردم و
هونەری ئەوێنداری پێ بەخشیم
ماچ کردنی ئەندامی نێرینەی فێرکردم
هونەری هەرزەکاری خەڵات کردم و
هونەری توند و تیژ بوونی پێدام.



❊❊❊

"باوکم" هونەری ڕاست وێژی نەزری من کرد
هونەری بەدگۆیی فێرکردم
هونەری قسەکردنی سەرزەنشت باریی دا بە من
ئەمرازی مۆسیقای پڕ زایەڵەی خەڵات کردم
هونەری گۆرانی وتنی پێشکەش کردم و
هونەرگەلی کۆنتری بیرهێنامەوە







***

ئەو هونەری قارەمانی بەخشییە من
هونەری توانایی پێبەخشیم
هونەری غەیان بوونی فێرکردم
هونەری چاکەکاری خەڵاتی من کرد
هونەری بە تاڵان بردنی شارەکانی نیشان دام
بەڕێوەبردنی، چەمەری فێرکردم و
خۆش کردنی دڵەکانی پێ بەخشیم

***

"باوکم" فریوی "نا دڵم"
نیشتمانە وەحشییەکانی خەڵات کردم
هونەری میهرەبانی پێبەخشیم
کۆچ و کۆچباری فێرکردم
خانووی ئارامشی بە گشتی خەڵاتی من کرد.

***

"باوکم" هونەری دارتاشی فێرکردم
پیشەی مسگەری پێبەخشیم
پێشەی دەبیری خەڵات کردم و
پیشەی ئاسنگەری دامێ.
پیشەی چەرم خۆش کردنی فێرکردم
پیشەی لکەگیری پێبەخشیم
پیشەی بەننایی خەڵات کردم و
پیشەی شمشاڵ چێ کردنی دایە من

***

گوێچکە سووکی بەخشی بە من
هێزی وردبینی پێ بەخشیم

ئایینی پاک کردنەوەی پیرۆزی خەڵات کردم
"ئەو" پێنووسی پێشکەش من کرد.

***

هەڵچنینی ڕەژی پرگڕی دا بە من
"باوکم" ئاغەڵی پێ بەخشیم
ترسی "خزاندە" دڵی من
هێزی بیر کردنەوەی خەڵات کردم و
خوێڕیەتی بەخشییە دڵم.

***

شێری ددان تیژی دامێ
داگیرساندنی ئاگری فێرکردم
کوژاندنەوەی ئاگری نیشان دام
باسکی ماندووی بەخشی بە من
بنەماڵەی گردوکۆی خەڵات کردم و
زان و بوونی پێشکەش من کرد.

***

شەڕهەڵایسانی نیشان دام
راوێژ کردنی دابە من
هێزی دڵدانەوەی دامێ
- دادوەری کردنی فێرکردم
- "هێزی" بڕیاردانی بە خەڵات دامێ....

«ئێنکی»ش هەروا بەمەستی لە گەڵ «ئەیزیمۆد»ی غوڵامی دەدوا
«ئەیزیمۆد» غوڵامی من:
ژنی لاو — بەرەو «ئۆرووک» لەڕێ دایە
مەیلم وایە بە سڵامەتی بگاتەوە شارەکەی خۆی»
«ئینانا» هەمووی «می» "واتە یاسای ئاسمانەکانی" کۆ کردەوە



***

«می»یان لە بەلەمی ئاسمانیدا تاقەت کرد
بەلەمی ئاسمانی بە «می» پیرۆزەوە لە بەستێن دوور خرایەوە
ئەودەمەی کە "مەستی" ئابجۆی لەسەر دەرچوو
ئەو دەمەی کە "مەستی" ئابجۆ لەسەری باوە ئێنکی پەڕی
ئەو دەمەی کە "مەستی" ئابجۆ لەسەر خواوەندی مەزنی عەقڵ دەرچوو
ئێنکی ڕووانییە دەوروبەری «ئابزۆ»
چاوەکانی شای «ئابزۆ» ئۆریدۆی کێڵا
ئێنکی شا، "بە چاو" ئۆریدۆی کێڵا و بانگی کردە «ئەیزیمۆد»ی غوڵامی و گوتی:

«ئەیزیمۆد» غوڵامی وەفاداری خۆم!
- شاهی من — حازرم بۆ خزمەت
- - کاهێنەیی مەزن، خووایەتی؟!
تاجی چاکەی پایەدار؟
ئەوانە لە کوێن؟
- پادشا پێشکەشی کچەکەی کردن

- هونەری قارەمانی — هونەری دەسەڵات نوێنی؟
غەیان بوون، ڕێ لێ ونبوون
ئەوان لە کوێن؟
- پادشای من بەخشییە کیژەکەی خۆی
«گوێ ڕادێری — توانایی لێ ورد بوونەوە
بڕیار دان؟
ئەی ئەوان لە کوێن؟
- پادشای من بەخشی بە کیژەکەی خۆی

(چاردەجار ئێنکی داوای لە ئەیزیمۆد کردەوە
ئەیزیمۆد چاردەجار وەڵامی دایەوە:
- پادشای من ئەوانەی بەخشییە کیژەکەی
- پادشای من «می» بە تێکڕایی پێشکەش ئینانای کچی کرد
ئێنکی ئاوای گوت:
- ئەیزیمود! بە لەمی ئاسمانی و «می» پیرۆز ئێستە لە کوێن
- بەلەمی ئاسمانی بە ستێنک دوورەتا ئۆریدۆ
- برۆ ئەفرێندراوەکانی «ئێنکوم» بهێنە
- بلا ئەوان بەلەمی ئاسمانی بێننەوە ئۆریدۆ.

ئەیزیمۆد گوتی بە ئینانا
- خاتوونی من، باوکت منی ناردە لای تۆ

- قسەی باوکت — قسەی میرە
- نابێ لە ئاستی مل بادەی

ئیناناولاّمی داوە
- باوکم چی وتووە؟
«ئێنکی» چ شتێکی تری وتووە؟
وتەی میر چییە کەنابێ سەرپێچی لێ بکرێ؟

ئەیزیمۆدگوتی:
پادشای من فەرموویە:
«لێگەڕێ ئینانا بگەڕێتەوە ئۆرووک
بەلەمی ئاسمانی و «می» پیرۆز بێنەوە ئۆریدۆ»

ئینانا زریکاندی:
باوکی من قسەی خۆی گۆڕیوە!
پەیمانی مەستی خۆی شکاندووە!
باوکم بە فێڵ لەگەڵ من دوواوە!
ئەو بەفریو هاواری کرد:
«بە ناوی دەسەلاّتم، بە ناوی بارەگای پیرۆزم!»
ئەو بە فێڵ تۆی ناردووە بۆ لای من!
ئێستا قسەی ئینانا تەواو نەببوو
کە «ئێنکۆم»ی قژ ئالۆزکاو، بەلەمی پیرۆزی وەچنگ خست.



ئینانا بانگی غوڵامەکەی خۆی «نین شۆبور»ی کرد و گوتی:

«نین شۆبۆر وەرە، ڕۆژگارێک تۆ خاتوونی رۆژهەڵات بووی
«ئێستاکە کڵفەتی وەفاداری بارەگای پیرۆزی «ئۆرووک»ی
ئاو، دەستەکانتی پیرەڵۆک نەکردووە
ئاو، لاقەکانتی نەچرژاندووە
تۆ ئەو ڕێنوێنەی عاقڵانە ئامۆژگاریم دەکەی
تۆ ئەوشەڕکەرەی هاوێمی و شان بە شانی من شەڕدەکەی
بەلەمی ئاسمانی و «می» پیرۆزی من ڕزگارکە

(نین شۆبۆر هەوای بە دەستی هەڵکۆڵی
ئەو وەک برووسکە نەڕڕاندی)
ئەفرێنراوانی «ئێنکوم» بۆ ئۆریدۆ هەڵدێردران
***
پاشان ئێنکی جارێکی تر بانگی کردە ئەیزیمۆدی غوڵام و گوتی:
-ئەیزیمۆد، غوڵامی وەفاداری من

-شاهی من حازرم بۆ خزمەت
-بەلەمی ئاسمانی ئێستا لە کوێیە
-ئێستا دوو بەستێن دوورە تا ئۆریدۆ
-برۆ و پەنجا غوولی «ئۆرۆ» بنێرە
لێگەڕێ با ئەوان بەلەمی ئاسمانی بێننەوە.
پەنجا غوولی باڵداری «ئۆرۆ» بەلەمی ئاسمانییان وە چنگ خست
بەڵام نین شۆبۆر بەلەمی ئینانای رزگار کرد.

بۆ جاری سێهەم ئێنکی بانگی کردە غوڵامەکەی وگوتی:
- ئەیزیمۆد غوڵامی وەفاداری من
- شاهی من حازرم بۆ خزمەت
- بەڵەمی ئاسمانی ئێستە لەکوێیە؟
- هەر ئێستا گەیشتە «دوولما»
«خێرا کە پەنجا هەیوولای «لاهاما» بنێرە
لێگەڕێ با ئەوان بەلەمی ئاسمانی بێننەوە

پەنجا هەیوولای دەریایی «لاهاما» بەلەمی ئاسمانیان وەچنگ خست
بەڵام نین شۆبۆر بەلەمی ئینانای ڕزگار کرد
***
چووارەم جار «ئێنکی» «کولال گال» دەنگ ناخۆش ترین گیانلەبەری نارد

پێنجەم جار ئێنکی «ئێنونون»ی نارد

بەڵام هەمووجارێ نین شۆبۆر بەلەمی ئینانای ڕزگار کرد

شەشەم جار «ئێنکی» ئەیزیمود غوڵامەکەی خۆی نارد و پێی گوت:
ئەیزیمۆد! غوڵامی وەفاداری من
- شاهی من! حازرم بۆ خزمەت
- بەلەمی ئاسمانی ئێستا کووا؟
- خەریکە دەگاتە ئۆرووک

- خێراکە! قەڕەوڵەکانی شێلەگەی «ئیتۆرانگال» بنێرە
بڵا ئەوان بەلەمی ئاسمانی بێننەوە.

ئەیزیمود و قەرەوڵەکانی شێلەگەی «ئیتۆرانگال» بەلەمی ئاسمانیان وەچنگ خست
بەڵام نین شۆبۆر بەلەمی ئینانای ڕزگارکرد

پاشان نین شۆبۆر ئاوای بە ئینانا گوت:
-خاتوونی من ئەو کاتانەی بەلەمی ئاسمانی دەگاتە دەروازەی شینی ئۆرووک
لێگەڕێ با شەپۆلە بەرزەکان بڕژێنە شارەکانەوە
لێگەڕێ با بەلەم گەلی ئاوە قووڵەکان بە چوستی شێلەگەی شارەکان بپێون

ئینانا وڵامی نین شۆبۆری داوە
«ئەورۆژەی کە بەلەمی ئاسمانی لەدەرگای شینی (نیگۆلا) ئۆرووک دێتە ژوور
لێگەڕێ شەپۆلە باڵا بەرزەکان بووارەکان بماڵن
لێگەڕێ شەپۆلە باڵا بەرزەکان بڕژێنە بووارەکان
بێڵە با پیرەکان ڕاوێژ بکەن
بێڵە با پیرێژنەکان دڵخۆشی بدەنەوە
لێگەڕێ با پیاوانی لاو هێزی ئەمرازی شەڕ کردنیان بنوێنن
لێگەری منالان پێبکەنن و گورانی بلێن
با جێژنێک بگیرێ لە ئۆرووک
با کاهێنی مەزن، هاتنی بەلەمی ئاسمانی بە ستران بەخێربێنێ
لێگەڕێ عیبادەتە گەورەکان بە جێ بێنێ
با پادشا مەڕ و گا سەر ببڕێ
با جامەکەی لێوڕێژ کا لە ئابجۆ
با تەپڵ و دەفە لێبدرێ
با سۆزەی دڵ نەوازی «تی‌جی» بێتە گوێ
دەباخەڵکی هەموو دونیا ناوی پاکی من بهێنن
با خەڵک لە سەنای من دا گۆرانی تازە بخۆێنن

بەم جۆرە بوو...
ئەو رۆژەی کە بەلەمی ئاسمانی گەیشتە دەرگای شینی ئۆرووک
شەپۆلە بەرزەکان بووارەکانیان راماڵی
شەپۆلە بەرزەکان ڕژانە بووارەکانەوە
بەلەمی ئاسمانی لە بارەگای پیرۆزی ئۆرووک لەنگەری خست
***
حەوتەمین جار ئێنکی بانگی کردە ئەیزیمۆد غولامی وەفاداری وگوتی:

-ئەیزیمۆد! غولامی وەفاداری من!
- شاهی من! حازرم بو خزمەت
- بەلەمی ئاسمانی ئێستە کووا؟
- بەلەمی ئاسمانی ئێستا لە بەستێنی سپییە.
- ئینانا و بەلەمە ئاسمانیەکەی لە بەستێنی سپی سەیرانیانە

***

بەلەمیان خالّی کرد لە «می» پیرۆز
تێکڕای ئەو میيانەی لە ئێنکی ئەستێندرابوون لە گەمییەکە دادەگیران و یەکەیەکە ناویان دەخوێندراوە و پێشکەش خەڵکی سۆمەر دەکران.
دواتر «می» گەلێکی زیاتر وەردەرکەوتن، زۆر زیاتر لەوەی ئێنکی دابووی بە ئینانا
ناویان بۆ ئەوانیش دانا و ئەوانیشیان پێشکەشی خەڵکی سۆمەر کرد.
ئینانا «می» بەدی هێنا

ئەو جل و بەرگی لەسەر زەوی بەدیهێنا
ئینانا هەنگامەی چێ کرد
هونەر گەلی ژنانەی چێ کرد
تەپڵەکانی «تیجی» و «لیلیس»ی چێ کرد
دەفەکانی «ئۆب» و «میز» و «ئالا»ی چێ کرد.

ئینانا ئاوای گوت:
ئەو جێیەی بەلەمی ئاسمانی لەنگەری لێ گرتووە
ئەو جێیە ناودەنرێ «بەستێنی سپی»
ئەو شوێنەی کە «می» پیرۆز پێشکەش کرا
ئەو شوێنە پیرۆزە ناودەنێم «لالیەس لازوولی»
لەو کاتەدا ئێنکی وتی بە ئینانا:

«بە ناوی دەسەڵاتم، بە ناوی بارەگای پیرۆزم
لێگەڕێ ئەو «می»یە پیرۆزەی لەگەڵ خۆت بردووتە
لە بارەگای پیرۆزی تۆدا بمێنێ،
لێگەڕێ با کاهێنی مەزن ڕۆژەکانیان بەدەم گۆرانیەوە
لە پێشخانی پیرۆزی تۆ ڕابوێرن
باخەڵکی شارەکەت بەختەوەربن
با منداڵانی ئۆرووک دڵخۆش بن

خەلکی ئۆرووک هاوپەیمانی خەڵکی «ئۆریدۆ»ن
لێگەڕێ با جارێکی تر
شاری ئۆرووک، بگاتە پلەی بەرزی خۆی.

---

پەراوێزەکان:

١. Abzu: پێگەی ئەفسانەیی خوای هزرو خوای ئاوەکان، شوێنی یەک گرتنەوەی ئاوی شیرین وئاوی زەریا، رەنگە مەبەست دێلتای فورات لە نیزیکی کەنداوی فارس بێت.

٢. Shugura: تاجێکە کە لە لق و پۆپی گیا دروست دەکرێ.

٣. Lsimud: خودایەکی بچووک و بەستزمان و خزمەتگوزاری ئێنکی‌یە. لە زمانێ سۆمەری دا بەو جۆرە خودایانە دەڵێن «sukal» واتە رێنوین و پەرەستار.

٤. Durash: زاراوەیە بۆ زەوینی دایک، هەڵگر و ئاوس و بەزوەزێ

٥. Kurgarra: نەمانزانی ماناکەی چی‌یە.

٦. رەنگە مەبەستی هەڵچنینی رەژی و بنەداروشتی وابێ بۆ ئامادەکردن و نێڵ دانی کووره (سۆبە).

٧. Enkum: گیانلەبەرانێکی جادوویین کە لە ژێر ئەمر و فەرمانی ئێنکی دان.

٨. Ninshubur: خزمەتکار، پشتیوان و رێنوێن و پەرەستاری ئینانا.

٩. Uru: لەو غوولانەن کە لە ژێر فەرمان و دەستووری ئێنکی دابوون و وەک پەیکی ئەو دەهاتنە ئەژمار.

١٠. Dulma: شوێنێکە لە دێلتای دیجلە و دورگەی فارس دا.

١١. Lahama: بوونەوەرگەلێکی ئەفسانەیین کە لە ئەژدیها دەچن.

١٢. Kalalgal: ناخۆش ترین دەنگ، دەنگی زڕ.

١٣. Enunun: لەو دێوانەیە کە ئێنکی خەڵقی کردوون.

١٤. Iturangal: لەو دێوانەیە ئێنکی دروستی کردوون و پاراستنی ئاودڕگەکانی ئۆریدۆی پێ سپاردوون.

١٥. Nigula: دەڕوازە و سنووری ئاوی ئۆرووک.

١٦. Tigi: ئامێرێکی موسیقی وڵاتی سۆمەر بووە.

١٧. Lilies: جۆرێک ئامێری مۆسیقا بووە کە لە تەپڵ چووە.

١٨. Ub: جۆرە دەفەیەکە

١٩. Meze: جۆرە دەفەیەکە

٢٠. Ala: جۆرە دەفەیەکە

٢١. Lalislasoli: بە مانای بەردی شینی رەگەدارە و بە مانای بەستێنی شین و تریفەدارە.

ژێدەر:

شناخت هویت زن ایرانی در گستره تاریخ و ڵیش تاریخ، لاهیجی شهلا، کار مهرانگیز، روشنگران، تهران ١٣٧١

# لەشم بە دەریا بسپێرن
## شیعر و ژیانی «کارل سەندبێرگ»

نووسینی: کارل سەندبێرگ
و. لەفارسییەوە: یوونس ڕەزایی

کارل سەندبێرگ لە شەشی ژانوییەی ساڵی ١٨٧٨ لە گالزبێرگی ئەمەریکا چاوی بە دونیای هەڵهێناوە. دایک و باوکی لە کۆچەرە سویدییەکان بوون. ئەوان هەر لە یەکەم ڕۆژەکانی کۆچ کردنیانەوە لە گەڵ ژیانێکی پڕ لە چەرمەسەری و دەست کورتی بەرەوڕوو بوونەتەوە. باوکی کە ناوی «ئاگۆست سەندبێرگ» بوو، دایکیشی، واتە «کلارا ئەندرسۆن» خزمەتکاری هۆتێل بوو. دەست تەنگی و نەداری بنەماڵە وەهای تەنگ پێ هەڵچنین کە «کارل» لە تەمەنی ١٢ساڵان دا ناچار بوو دەست لە خوێندن و دەور و دەرس هەڵگرێ و بۆ یارمەتی دانی بنەماڵە لە بواری ئابوورییەوە، دەستی کرد بە کارگەلێکی وەک ماڵینی تەویلە، نۆکەری، شیرفرۆشتن و بۆیاغچێتی. ڕۆحی کەلێن پشکن وسەرەڕۆی کارل، بگەیشتبایە هەر شارێکی تازە، هەر لەڕێوە کارێکی دەدۆزییەوە و دوای ئەوەی ماوەیەک لە گەڵ خەڵک و ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو شارە ناسیاوی وەدەست دێنا هەوای شارێکی تر لە کەللەی دەدا و بارگەی بەرەو شارێکی دیکە دەپێچایەوە. ئەو کۆچ و کۆچبارەی کارل بە دوای کاردا، ماوەی ٦مانگی خایاند و دوای ئەو ماوەیە بە دەستی پڕ و پوولێکی زۆرەوە گەڕاوە ئامێزی بنەماڵەکەی.



کارل سەندبێرگ

ئەوجار دەستی کرد بە ڕەنگ کاری و ڕازاندنەوەی بیناکان. شەش مانگ پاش گەڕانەوەی بۆماڵێ، بە ویستی خۆی خوازیاری بەشداری کردن لە شەڕی ئەمریکا و ئیسپانیا بوو. ئەو شەڕە ماوەیەک بوو هەڵاییسابوو. کارل دوای ساڵێک خزمەت لە بەرەکانی شەڕ سەرلەنوێ گەڕایەوە بۆ باوەشی بنەماڵەکەی. لەو ماوەیەدا، کارلی لاو و بەتوانا، بە هەڵپەوە خەریکی خوێندنەوەی کتێبی جۆراوجۆر بوو. تەنانەت جارجار وتار و چیرۆکیشی دەنووسی. بەشداری کردنی خۆویستانەی "کارل" لە شەڕدا، بووە هۆی ئەوەی زانکۆی لۆمبارد بە بێ پووڵ و بێ لە بەر چاوگرتنی ئەوەی کە بڕوانامەی خوێندنی دواناوەندی نییە، وەریبگرێ. کارل دوای چوارساڵ دەرس خوێندن، بێ ئەوەی بڕوانامە وەربگرێ، زانکۆی بەجێهێشت و بوو بە دەست فرۆش .

لەو سەردەمەدا بوو کە چووە پاڵ ڕیزەکانی حیزبی "سۆسیال دێموکڕات" و لە گۆڤاری"لیدر"دا کە لە "میلواکی" دەردەچوو دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بابەت و وتارەکانی.

ئەو وتارانە زۆربەیان باس و لێکدانەوەی ژیانی پڕ لە نەهامەتی و نەداری و بەش مەینەتی چینی بێ بەشی کۆمەڵگا بوو. کارل بە هاودەردی و هەستێکی پاکەوە زۆر سووچ وقوژبنی ژیانی پڕ لە کەند و لەندی ئەو چینەی خستە بەرباس .

ئەو بۆ خۆی لە بواری بنەماڵەییەوە سەر بەو چینە بوو، هەر بۆیە بە باشی وێنەیەکی ڕاستی لێ بە دەستەوەدا. سەندبێرگ لە ساڵی ١٩٠٧ دا لە گەڵ وێنەگرێکی بەناوبانگ بە ناوی "ئیدوارد ئیستەیشن "(EDWARD STEICHEN) ناسیاوی پەیدا کرد. هەروەها لە زۆر سەفەردا بووە هاوڕێی و لە وێنەگرتنی ژیانی خەڵکی دەست کورت و ڕەش و ڕووت یارمەتی دا.

ساڵێک دوای ئەو ناسیاوییە لەگەڵ خوشکی ئیدوارد واتە "لیلیان" کە مامۆستایەکی سووسیالیست بوو زەماوەندی کرد. لە ساڵی ١٩١٠ تا ١٩١٢وەک ڕاوێژکار و سکرتێری شارەداری سووسیالیستی

میلواکی خەریکی کاربوو.
هەر لەو سالانەدا بوو کە ئەویش وەک "تێئودۆر درایزێر" و تاقمێکی تر لە نووسەرانی پێشکەوتووی سەر بە خەڵک کەوتە ژێر چاودێری (FBI) و لە ڕیزەی کەسایەتییە مەترسیدارەکان بۆ هێمنایەتی هاتە ئەژمار. لە ساڵی ١٩١٣دا لە گەڵ بنەماڵەکەی بارگە و بنەیان بەرە و دەورووبەری شیکاگۆ پێچایەوە.
هەر لەوێش بوو کە وەک سەرنووسەری گۆڤارێکی ئابووری دەستی بە چالاکی کرد. سەندبێرگ دە ساڵ بەر لەو ڕێکەوتە یەکەم کۆمەڵە شیعری خۆی بە ناوی" لە چێژێکی نەترسانەدا "بە پوولی گیرفانی خۆی لە چاپ دابوو، بەڵام ئەو کتێبە سەرنجێکی ئەوتۆی پێ نەدرابوو. هاوکات لەگەڵ گۆڤاری ناسراوی "سەفەر"یش هاوکاری دەکرد. سەندبێرگ لەوگۆڤارەدا کە بەرهەمی شاعیرە ناسراوەکانی چاپ دەکرد، بەشێک لە دوایین شیعرەکانی خۆی، کە لە مەڕ ژیانی شیکاگۆوە نووسیبووی بڵاو دەکاتەوە.
ئەو شیعرانە پێشوازییەکی بێ وێنەیان لێکرا و زۆر شاعیر و نووسەر سەندبێرگیان هان دا، کۆیان کاتەوە و لە کتێبێک دا پێشکەش خوێنەرانی بکا. گۆڤاری "شیعر" لە ساڵی ١٩١٤دا خەڵاتی "لوینسون"ی (LEVINSON) پێدرا. ئەو خەڵاتە هەموو ساڵێک دەدرا بە باشترین شیعرێک کە لەو گۆڤارەدا بڵاو دەبۆوە .
سەرەنجام سەندبێرگ تێکڕای ئەو شیعرانەی لە دوو توێی کتێبێک بە ناوی"شیعرەکانی شیکاگۆ "دا خڕ کردەوە .
ئەو کۆمەڵە شیعرە یەکەمین بەرهەمی کێشە هەڵاییسێن وسەرنج ڕاکێشی سەندبێرگ بوو. ئەو لەو کتێبەدا بە شێوەیەکی نوێ باسی ژیانی کرێکاران، نەداران، ژنە سۆزانی و مرۆڤە تاوانبار و گرووپە مافیاییەکانی شیکاگۆی خستبووە بەر باس. زمانی شیعری سەندبێرگ لەو کتێبەدا، یەکجار سەرسووڕهێنەر بوو. کەڵک وەرگرتن لە زاراوە و ڕاوێژی خەڵکی ئاسایی، وشە و دەستەواژەی باوی ناو چینی ژێردەست و چەوساوە، شیعرەکانی ئەوی ڕەق و ناخۆش کردبوو! ئەو تایبەتمەندییانە شیعرەکانی ئەو کتێبەی دوور خستبۆوە لە چوارچێوە و قەرار و بڕیارەکانی شیعری ئەو سەردەمی ئامریکا .
ئەو شیعرانە وەبیرهێنەرەوەی شیعرەکانی "واڵت ویتمەن" بوون، بەڵام ئەدەبییەتی شیعری ویتمەن و ئاگاداری خۆشی لە ئافراندنی شیعری و کەڵک وەرگرتن لە خەزێنەی شیعری ئامریکا، شیعرەکانی ئەوی کردبووە شتێکی جیاواز و بە نرخ.
سەندبێرگ بە شێوەیەکی ئاگادارانە بە شوێن نوێکارییەوە نەبوو. ئەو بینین و تێگەیشتنی خۆی لە ژیانی چینی دەست کورت، بە پاڵ وێنەی مرخ و هەستی دا دەکرد و بەرهەمەکەشی وەک شیعرێک دەخستە سەر روخساری کاغەز. فۆڕمی شیعرەکانی بە شێوەیەکی سروشتی لە گەڵ ئەو بابەتانەی هەڵیدەبژارد یەکیان دەگرتەوە. هەر وشە یان ڕستەیەکی غەیرە ئیستانداردی شیعری هاتبا نێو شیعرەکانیەوە، ڕواڵەتێکی ڕەق و تووڕەی پێدەبەخشی، لە ڕاستی دا مەبەستی سەرەکی سەندبێرگیش هەر ئەوە بوو.
لە شیعری ساڵانی ١٩١٤– ١٩٢٠دا کەڵکەڵەی سەندبێرگ رابوون دژ بە نابەرابەری کۆمەڵایەتی و ڕەگەزی و هاوار دژ بە بێ عەدالەتی بوو. شیعرەکانی ئەو بە بێ سەرنج دان بە ئایدۆلۆژییەکی تایبەت بە شێوەیەکی خۆڕسک دەهاتنە سەر ڕووپەڕی کاغەز و

ڕەنگە هەر بەو هۆیەش بتوانین شیعری ئەو لە ڕێزی زوڵاڵترین و ڕاستگۆیانەترین شیعرەکانی نەتەوەیی جیهان دابنێین .

"شیعرەکانی شیکاگۆ" هەر بەو ڕادەیەی کە لەگەڵ ساردوسڕی هەندێ لە ڕەخنەگران ڕووبەڕوو بۆوە، بووە هۆی ستایش و پێداهەڵگوتنی زۆر کەسیش، بۆ وێنە دەتوانین "ئیزراپاوندEZRAPOUND " ناو بەرین کە ئەو شیعرانەی پەسند کرد و ستایشی کردن.

لە ماوەیەکی کورت دا سەندبێرگ وەک شاعیری نەتەوەیی ئەمریکا ناوبانگی دەرکرد. ئەو ئامانجەکانی خەڵک، چیرۆک، گۆرانی، ژان و برک و خۆشی و هیواکانی ئەوانی لە شیعرەکانیدا گونجاند. ڕۆحی بزۆز و سەرچڵی ئەو لە سیستمی داخراو و بەرتەسکی حیزب دا نەدەحاواوە.

هەر بەو هۆیە لە ساڵی ١٩١٦دا بۆ هەمیشە لە چالاکی حیزبی کشاوە و پێوەندی خۆی لە گەڵ حیزبی سووسیال دێموکرات پساند و بە کاری نووسین و شیعرگوتنەوە سەرقاڵ بوو.

ئەو وڵامی ئەو لێشاوە بانگێشتنەی نەداوە کە لە لایەن حیزبەوە بۆی دەناردرا. بەڵام هەتا دواساتەکانی تەمەنی بێ بڕانەوە لە سەنگەری داکۆکی لە ئامانجی خەڵکی چەوساوەدا مایەوە .

شیعرەکانی ئەو لەوچاخەدا ئەگەر لە دروشمیش بچن، قەت بە ئەمرو فەرمانی کەسێک نەنووسراون. سەندبێرگ لە وەڵامی "ئیمی لۆیلEMI LOWEHH " دا کە شیعرەکانی شیکاگۆی ئەو بە دروشم ئاسا بوون تاوانبار دەکا دەڵێ:" بە ئاوڕدانەوەیەک بۆ شیعری ساڵانی ڕابردووم، تا ڕادەیەک دەتوانم بڵێم لەگەڵ تۆ هاوڕام و پێم وایە لە هەندێ شوێن دا بەر لەوەی پەرژابێتمە سەر مرۆڤ، دروشمی سیاسیم داوە ...من لە سەر ئەو بڕوایەم کە بیری سیاسی واتە "لایەنگری لە حیزب و داڕشتنی پلانی تیۆرییەکانی سەندیکایی" دەبێ لە شیعر دوور خەینەوە" . چالاکی‌یە هونەرییەکانی سەندبێرگ بەربڵاو و جۆراوجۆر بوون. یەکێ لە بوارەکانی کاری سەندبێرگ شیعر بووە. ئەو لە ڕۆماننووسیشدا دەستی دایە ئەزموونێک و بەرهەمی ئەو ئەزموونەشی ڕۆمانی "ڕەوەزی بیرەوەرییەکان"ە . ئەو ڕۆمانەی ساڵی ١٩٤٨چاپ کرد کە لەگەڵ پێشوازییەکی بێوێنە ڕووبەڕوو بۆوە و چەندین جار چاپ کرایەوە. ئەو هەروەها ژیاننامەیەکی تەسەلی شەش بەرگی لەمەر ژیانی :"ئابراهام لینکۆلن"ەوە نووسی. ئەو ژیاننامەیە خەڵاتی ئەدەبی پولیتزێری ساڵی ١٩٣٩ی بە نسیب سەندبێرگ کرد. سەندبێرگ هەروەها ماوەیەک بە کۆکردنەوەی گۆرانی و ئاهەنگی فۆلکلۆری، ویلایەتە جۆراوجۆرەکانی ئەمریکاوە خەریک بوو. ئەو هەر لە سەردەمی لاویەوە، لەو زەمانەوە کە بە شوێن دۆزینەوەی کار شارەوشار دەگەڕا، بەشێک لە کات و ساتی خۆی بۆ بیستنی ئاواز و گۆرانی کرێکاران و مەلێوانەکان تەرخان کرد. ئەو گۆرانییەکانی دەنووسیەوە و دواتر بۆ خۆی لەگەڵ سۆزەی سازی گیتارەکەی دەیگوتنەوە و ڕۆحی بە بەردادەکردنەوە. یەکەمین بەرهەمی ئەو چالاکی و تێکۆشانەی ئەو بڵاوبۆوە و پێشوازییەکی باشی لێکرا. بیست و یەک ساڵ دواتر، هەر ئەو کتێبە لەگەڵ هەندێ گۆرانی نوێ ئاوێتە کرا و بە ناوی" گۆرانییە نوێیەکانی ئەمریکا" لە چاپ درا. لەو کتێبەدا سەندبێرگ گۆرانی کرێکارانی هێڵی ئاسن، کاوبۆییەکان، چەرچیەکان، بەندییەکان، کرێکارانی مەزار و کارخانەی کۆکردبۆوە. ئەو لە ساڵی ١٩٣٦ دا

کتێبێکی دیکەی بە ناوی "خەڵک، بەڵێ" بڵاوکردەوە. ئەو کتێبە بریتی بوو لەو شیعرانەی بە زمان و زاراوەی خەڵکی ڕەشۆکی نووسرابوون و پڕ بوون لە ڕستە و دەستەواژەی فۆلکلۆریک و بە گیتار دەیژەند و ئەو شیعرانەی بە گۆرانی دەگوت. سەندبێرگ لە سەفەرەکانیدا بەردەوام کۆنسێرتی بۆخەڵکی دادەنا و تەنانەت جاری وابوو هەر لە مەیدان و پارکی شارەکان دەستی دەکرد بە شیعر خوێندنەوە و گۆرانی گوتن. سەندبێرگ چەند کاسێتی گۆرانی بە دەنگی خۆی و بە گیتارژەنی خۆی بە میرات لێ بەجێماوە. سەندبێرگ لە بواری ئەدەبی منداڵانیش دا گەلێ بەرهەمی سەرنج ڕاکێشی لێ بەجێماوە. کتێبگەلی "چیرۆکەکانی ڕۆتـابـاگـا" (١٩٢٢) و " ڕوخساری یەڕەڵماسی" (١٩٣٠) لە ڕۆمانە ناسراوەکانی ئەون، کە بۆ منداڵان و مێرمنداڵانی نووسیون، هەروەها دوو کۆمەڵە شیعریشی بە ناوی "مانگی خێرا" (١٩٣٠ ) و "گۆرانی با" (١٩٦٠) بۆ منالاڵن هۆنیوەتەوە. هەروەها ژیاننامەی خۆشی نووسی، کە دوای مەرگی بە ناوی" باڵندەی دەم بای چارەنووس" بڵاو بۆوە. (١٩٨٣) ئەو وێڕای ئەوەی خەریکی نووسینی ژیان نامەکەی بوو، یارمەتی" ئیدوارد ئیستەیشێنی" ژن براشی دەدا بۆ خڕکردنەوەی وێنەی جۆراوجۆر لە خەڵکی نەتەوە جیاجیاکانی دونیا. مەبەستی ئیستەیشێن لە دانانی ئەو پیشانگای وێنەیە، خستنە ڕووی، ڕووخساری مرۆڤ وەک ڕەگەزێکی تاقانە بوو. لەو پێشانگایەدا ٥٠٣ وێنە لە ٦٩ وڵاتـی جیهان کۆکرابۆوە. ئەو پیشانگایە ساڵی ١٩٥٥ بەڕێوە چوو. کارێکی وەها لە سەردەمی دەسەڵاتی" مەک کارتیسم" لە ئەمریکا دا، بوێرییەکی لە ڕادەبـەدەری دەویست. هەر لەو کۆمەڵە وێنەیە دواتر کتێبێک چاپ کرا و بە دەیان جار لە چاپ درایەوە، بە شێوەیەک کە تاساڵی ١٩٩٠ نزیکەی پێنج ملوێن بەرگی لێفرۆشرا. سەندبێرگ لە پێشەکی ئەو کتێبە دا نووسیویەتی: "ئەو وێنانە، وێنەی چەوسانەوە، بەربەرەکانی، خوێن و خەونە لە نێو چینی ئەویندار، کرێکار، بەکرێگیراو، سەرباز، قومارباز، دارا و نەدار، خۆشەویست و خوێن تاڵ، کە لە بنەماڵەیەک لەو گۆی زەویـیـەدا دەژیـن."

سەندبێرگ ساڵی ١٩٥٠ کۆی شیعرەکانی خۆی لە بەرگێگدا چاپ کرد. ئەو کتێبە دووهەمین خەڵاتی "پوولیتزێر"ی بۆ سەندبێرگ بە دیاری هێنا. ئەو لە پێشەکی ئەو کتێبەدا دەنووسێ: "لە تێکڕای ژیانمدا، خولیای فێربوون، بینین، بیستن و نووسین لە مێشکمدا بووە. لە شەست و پێنج ساڵیدا دەستم کرد بە نووسینی یەکەمین ڕۆمانم و دوای پێنج ساڵ تەواوم کرد. بەڵام هێشتاش هەر لە پشکنین و لە سەفەردا بووم...ڕەنگە ئەگەر خودا سیلەی ڕەحمی بە ڕووم دا بکاتەوە، منیش وەک "هوکوسا" شاعیری ژاپۆنی کە لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا مرد، بڵێم، ئەگەر خودا پێنج ساڵی دیکەم دەوام دا، حەتمەن دەبمە نووسەر. سەیر ئەوەیە کە سەندبێرگ لە ٢٢ی جوولای ساڵی ١٩٦٧ واتە لە تەمەنی ٨٩ ساڵی دا مرد. ئەدەبیاتی ئەمریکا و بەتایبەت شیعری ئەمریکا ناکرێ بە بێ ئامادەیی و حوزووری سەندبێرگ بخرێتە بەرباس. ئەو ئاڵوگۆڕەی ئەو لە شیعری مودێرنی ئەمریکادا بەدیهێنا، گەورە و سەرنج ڕاکێش بوو. "ئارچیبالدمەکلیش" شاعیر و ڕەخنەگری ئەمریکایی لە مەڕ ئـەوەوە دەڵێ:"سەندبێرگ بۆ ئافراندنی بارستای مەزنی شیعرەکانی دەسمایەیەکی گەورەی بوو... دەسمایەکەی بڕوابوون بوو بە مرۆڤ."



## "گۆرانییەکەم وت"

(١)

بۆ تۆ و مانگ دەنگم هەڵبڕی
بەڵام تەنیا مانگ ئەو گۆرانییەی لە بیرماوە.

گۆرانی شاد و دڵبڕوێنم وت
بە دڵێکی ئازادەوە
بە ئەوکێکی کراوەوە
تەنانەت مانگ گۆرانییەکانی لە بیرە و
لە گەڵم میهرەبان.

## " گەڕیان"

(٢)

سوور دادەگەڕێن خیزەکانی سەر بەستێن
لەو شوێنەی ئێوارێ بە سەر دەستان دادێ و
(رۆژ) هەڵدەلەرزێ.
زەرد هەڵدەگەڕین خیزەکانی سەر بەستێن
لەو شوێنەی مانگ نێسکە دەکا و
باوی هەنگاوەکانی شل دەکاتەوە.

## "لە نێوان دوو گرد دا"

(٣)

لە مابەین دوو گرد دا
شاری پیر خەوتووە
ماڵەکان
سەربان و دارەکان
بوولێڵ و تاریکی
گرداڵ و شەونم
هەموویان لە خەودان،
دووعا لە سەر لێو
سەر لە سەر سەرین
خەو گەیشتۆتێ و
تۆزی خەون لە سەر هەموو شتێک دەنیشێ.

## "پەنجەرە"

(٤)

شەو لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە
گەورەیە و تاریکە و نەرمە
لەت و کوت
بە هەودا زەردەکانی نوور.



## "ئێسقان"

(٥)

لەشم بە دەریا بسپێرن
لە ژێر دڵۆپە و سوێری بمنێژن .
ئیتر نیری هیچ وەرزێڕێک ناگاتە مۆخی ئێسقانم
هیچ هاملێتێک کاسەی سەرم بە دەستەوە ناگرێ .
چیها جەفەنگ لە زارمەوە شۆڕاوگەی بەست و
ئێستاکە چۆڵ و هۆلە ناو دەمم.

مردوو خۆرە چاوشینەکان، چاوەکانم هەڵدەکۆڵن
ماسییە سوورەکان ڕمبازێن دەکەن و
من دەبمە گۆرانی برووسکە و هاواری دەریا
بۆ ژێر سۆرایی و دڵۆپە...

## " هەڵبژێرە "

٦

مستێکی قووچاو لە حەودا
یا دەستێک بە مەبەستی تکا – بەرز .
هەڵبژێرە
لەو دووانە یەکیان دێتە پێ و شوێنت.



## "لەوبەری پەنجەرەوە"

(٧)

برسێتیم بدەنێ
ئەی ئەو خودایانەی دانیشتوون و
نەزمێکی نوێتر بەو جیهانە دەبەخشن.
برسێتم بدەنێ و ژان و نیاز
وەدەرم نێن بە شەرم وتێکشکانەوە
لە دەروازەکانی زێڕ و ناو
خراپترین و کەمترین برسێتی خۆتان بەمن ببەخشن!
بەڵام هەندێکم ئەوین بۆ وەلابنێن
دەنگێک کە لە کۆتایی ڕۆژەوە دەمدوێنێ
دەستێک کە لە تاریکی هۆدەدا نەوازشتم دەکا و
تەنیایی بەرەڵڵا تێکدەشکێنێ .
لە سێبەری ڕوونی ڕۆژدا
لە تاریکی خۆرنشیندا
ئەستێرەی ڕۆژئاوا بچووک و شڵەژاو
لە بەستێنی سێبەرە سەماکارەکان دا ئاوارە.
لێگەرێ بچمە بەر پەنجەرە
بڕوانمە بوومەلێڵی خۆرنشین و
لە چاوەڕوانی و هومێدی ئەوینێکی بچووک دا
چۆک دابدەم.

## "شێویلکە "

(٨)

حەوت نەتەوە ڕاوەستان و دەستیان لە سەر شێویلکەی مەرگ
لە یەکەمین حەوتووی ئاگۆستی ساڵی هەزار و نۆسەد و چاردەدا
من گوێم ڕاداشتبوو
تۆ گوێت دابوویە و
تەواوی جیهان دەیان بیست.
هەموو دەنگێکمان بیست وەک سۆزەی گۆرانی :
"هەر منم ڕێ، منم تیرێژ
ئەوەی لایەنگری منە
هەمیشە زیندوو و نەمرە و
مەرگ دەستی پێی ڕاناگا.
حەوت نەتەوە ئەوەیان بیست و گوتیشیان:
"ڕۆژە ڕەشی !"
شێویلکەکانی مەرگ کرانەوە و وێک هاتن، کرانەوە و . . .
"کارەسات!"



## "دوو دراوسێ"
(٩)

دوو نەمر چاوەکانیان لە من بڕیوە
یەکیان عومەری خەییام و ئەو ئاوە سووربادەی
کە دوێنێ پێ لە بیر دەچێتەوە و سبەینێش
(وە) تەنیا دەنگ و ئاواز، چیرۆک و ڕۆژنامە و
شەڕەکانی ئەوڕۆ دەمێننەوە.
ئەویتر " لووئیس کۆرنارۆ" و کەم خواردنی نەجیمانەی
خۆراکی کەم بە درێژایی ساڵەهای ساڵ

هەتا مردن بە وەڕەزی دەڕوازە کورتەکانی خۆی بە ڕوودا دەکاتەوە

هاوسێیەکم هەیە سوێند بە سەری خەییام دەخوا
هاوسێیەکم هەیە سوێند بە سەری کۆرنارۆ دەخوا
هەردووکیان بەختەوەرن :
دوو نەمر چاویان لە من بڕیوە
لێیان گەڕێ با بە باشی تێم بڕوانن.

٩-لوئیجی کۆرنارو (١٥٦٦-١٤٦٤) نەجیم زادەیەکی خەڵکی ویلزە، کە خاوەنی ژیانێکی ڕازاوە و دەوڵەمەندانە بوو. لە چل ساڵەیی دا نەخۆش کەوت و دکتۆرەکان دەستیان لێ داشت. کۆرنارۆ خۆی دەستی کرد بە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی، ئەو ڕادەی خۆراکی خۆی کەم کردەوە و ڕۆژێ هەندێک نان و ئیستیکانێکی شەڕاب دەخواردەوە و بەو شێوەیە ژیانێکی ئارامی بۆ خۆی پێکهێنا و تا تەمەنی ١٠٢ساڵەیی بێ هیچ گرفتێک ژیا.

## "گەڵاکانی ئاور "
(١٠)

بتهەوێ ئەگەر...تێی هەڵدەکەمە خۆڵەمێش
چاو دە برمە ئاورو
لە هەناوی خۆڵەمێش و لرفەی بڵێسەی سوور و ڕەشی گڕەوە
پێت دەڵێم،
کە ئاور چۆن پەل دەبزێوێ و
چلۆن تا لێواری دەریا
خۆی پان وپۆڕ دەکاتەوە،

سەرچاوە: سندبرگ، کارل، برای تو و ماه نغمه سر دادم، ترجمه احمد پوری تهران، مروارید، ١٣٨٣



# خەونی مرۆڤی پێکەنیناوی

## چیرۆکێکی خەیاڵییە

دۆستۆیفسکی

و. لە ڕووسییەوە: ئارام کاکەی فەلاح



دۆستۆیفسکی

-١-

من مرۆڤێکی پێکەنیناویم، ئێستاش پێم دەڵێن شێتە، ئەگەر وەک جاری جاران پێکەنیناوی نەبوومایە لە لایان،ئەوە خۆی لە خۆیدا بەرزبوونەوەیەک بوو لە پلەوپایەدا. بەڵام ئیتر من تووڕە نابم، ئیتر ئەوان لەلام شیرینن، بە تایبەتی کاتێک پێم پێدەکەنن . نازانم چ هۆیەکە هەست بە خۆشەویستیان زیاتر دەکـەم. وەخۆشم لەگەڵیاندا پێدەکەنیم — نەک بەخۆم، بەڵکو لەبەر خۆشەویستیان پێدەکەنیم ئەگەر بێزاریم نەبووایە، بێزاری کاتی سەیرکردنیان.

بێزاری منیش زیاتر لەبەر ئەوەیە کە ئەوان ڕاستی نازانن، بەڵام من دەیزانم. ئاخ چەند سەختە بەتەنیا ڕاستی بزانیت! بەڵام ئەوان ئەمە تێناگەن. نەخێر تێی ناگەن.

جاران زۆر وەڕس دەبووم بەوەی کە پێکەنیناوی دەردەکەوتم. وا دەرنەدەکەوتم، بەڵکو وابووم. من هەمیشە پێکەنیناوی بـووم. وە ئەمەشم دەزانی لەوانەیە هەر لە ڕۆژی لە دایک بوونمەوە. لەوانەیە هەر لەو کاتەوە کە تەمەنم حەوتساڵ بوو دەمزانی کە پێکەنیناویم، دوای ئەوە لە قوتابخانە خوێندم، دوایی لە زانکۆ. هەرچەند زیاتر بمخوێندایە، زیاتر بۆم دەردەکەوت کە من پێکەنیناویم. هەتا هەموو زانستی زانکۆیی بۆ من وەک ئەوەی لەبەر ئەوە بووبێت و تەنیا بۆئەوە دروست بووبێت کە لەدواییدا بۆم ڕوون بکاتەوە و قووڵ ببمەوە تیایدا کە من پێکەنیناویم. وە ئاوهایش شتەکە لە ژیاندا کەوتەوە وەک چۆن لە زانستدا. وە ساڵ بە ساڵ هوشیارییەک لە ناخمدا گەورە دەبوو، بەهێز دەبوو، هوشیاری ئەوەی کە لە هەموو لایەنێکەوە شێوەیەکی پێکەنیناویم هەیە. هەموو کەس هەموو کاتێک پێم پێدەکەنین. بەڵام هیچ کامێکیان ئەوەیان نەدەزانی و هەستیان بەوە نەدەکرد کە ئەگەر لەسەر زەوی مرۆڤێک هەبێت کە لە هەمووان شارەزاتر بێت لەوەدا کە من پێکەنیناویم، ئەوا ئەو مرۆڤە خۆمم. هەر ئەوەش زیاتر ئازاری

دەدام کە ئەوان ئەمە نازانن. بەڵام لەمەدا خەتا خەتای من بوو، وە شانازیشم بەوەوە دەکرد کە نەمدەویست هیچ کاتێک ئەم ڕاستییە لەلای هیچ کەسێک بدرکێنم. ئەو شانازییەشم ساڵ بە ساڵ لەگەڵمدا گەورە بوو. وە ئەگەر وا ڕوویدا کە بمەوێت لەبەردەمی یەکێکدا ڕێگە بەخۆم بدەم و دان بەوەدا بنێم کە من پێکەنیناویم، وا هەستدەکەم هەر لەو کاتەدا، هەر لەو ئێوارەیەدا بە دەمانچەیەک کەللەی خۆم وورد و خاش دەکرد.

ئاخ، لە تەمەنی مێردمنداڵیمدا چەند لەوە دەترسام لەپڕ خۆم نەگرم و ئەم شتە بەهەر شێوەیەک بێت بۆ هاوڕێکانم بدرکێنم. بەڵام لەوەتەی گەیشتمە تەمەنی لاوێتی، ساڵ لە دوای ساڵ زیاتر و زیاتر ئەوەم بۆ دەرکەوت کە جۆرە سروشتێکی نابەڵام هەیە. بەڵام ناشزانم بۆچی ئێستا لە جاران هێمنترم؟ بە تایبەتی دەشڵێم «نازانم» لەبەرئەوەی تا ئێستا ناتوانم بگەمە ئەوەی کە «بۆچی».

لەوانەیە هی ئەوە بێت کە تەنگییەکی نابەڵا دەروونی داگیرکردووم، لە حاڵەتێکدا کە بە تەواوی لەسەروی دەسەڵاتی منەوەیە، ئەوەیش ئەوەیە: کە گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە هەموو شتێک لە هەموو شوێنێکی ئەم دونیایەدا وەک یەکە. من لە مێژە هەستم بەوە کردووە، بەڵام بڕوای تەواوم لە پڕیکدا لەم ساڵەی دواییەدا بوو. من لە پڕێکدا هەستم بەوە کرد کە بە لامەوە وەک یەکە ئەگەر دونیا بوونی هەبوایە یاخود نەبووایە یان هەر هیچ شتێک لە هیچ شوێنێک نەبووایە. وام لێهات هەرچی هەستم هەیە بە هەموو بوونمەوە وەک هیچ شتێک لە دەوروپشتم نەبێت وایە.

لە سەرەتادا وام هەست دەکرد کە لە پێشدا زۆر شت هەبوون، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە لە پێشیشدا هیچ نەبووە، نازانم لەبەرچی ئەوە تەنها هەست کردنێک بوو. تۆزە تۆزە گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە هیچ شتێک لەمەودوایش نابێت. لەو کاتەوە بوو لە پڕێکدا ئیتر لە کەس تووڕە نەدەبووم وەک ئەوەی بوونیشیان نەبێ وەها بوو لەلام. لە ڕاستیدا ئەمە لە شتە بێ نرخەکانیشدا ڕەنگی خۆی دایەوە. بۆ نموونە لە شەقامدا دەڕۆشتم و بەر خەڵکی تر دەکەوتم، ئەمەش نەوەکو هی ئەوە بووبێت کە بیرم دەکردەوە. بیرم لەچی بکربایەتەوە ئەو کاتە من بە تەواوی وازم لە بیرکردنەوە هێنابوو، هەموو شتێک لەلام وەک یەک بوو. بەختەوەری بوو گرفتێکم لە گرفتەکان شیکار بکردبایە، ئاخ، تەنها دانەیەکیش چییە نەمتوانی. چەن زۆر بوون؟ بەڵام وای لێهات هەموو شتێک لەلام وەک یەک بن و گرفتەکانیش وون بوون.

ئێ ئـاوا، دوای ئـەوە بوو ڕاستیم بۆ دەرکـەوت، ڕاستیم زانـی لە تشرینی دووەمـی ساڵی پـاردا، ڕۆژی سێیەمیشی بوو. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا چرکە بە چرکەی ژیانم لەبیرە. ئێوارەیەکی تاریک بوو، تاریکترین ئێوارە بوو کە هەبووبێت، سەعات یانزەی ئێوارە بوو کە گەڕامەوە ماڵەوە، وە بە تایبەتی لەبیرمە و بیرمدەکردەوە کە هیچ ساتەوەختێک وەک ئەو کاتە تاریک نەبوو تەنانەت لە پەیوەندی ئۆرگانیشدا. بـاران بە درێژایی ئەو ڕۆژە خۆش کردنەوەی نەبوو. بارانەکەی ئەو ڕۆژە ساردترین باران و لێڵترین باران بوو، بارانێکی زۆر ترسناک بـوو، تەنانەت لەبیرمە کە بەرامبەر بە خەڵک سروشتێکی دوژمنانەی هەبوو، سەعات یانزەی تەواو بوو بارانەکە لەپڕ وەستا. تەمومژێکی زۆر ئەستوور جێگەی گرتەوە. تەمومژ و سەرماکە زیاتر بوون لەو کاتەی کە باران دەباری. هەر ئەمەش بوو وای لە هەموو بەردێکی سەر شەقامەکە و هەموو کۆڵانێک کرد کە هەڵمیان لێ بەرز دەبووەوە کاتێک سەرنجت دەدانی، سەرنجی قووڵایی شەقامەکان لە دوورەوە. لە پڕێکدا واهـات بە خەیاڵمدا کە ئەگەر گازی

ڕۆشنکەرەوەکان لە هەموو لایەک بگریت بۆ ئەوەی ڕووناکی نەمێنێت ئەوا جوانتر دەبێت، چونکە دل زیاتر خەم دایدەگرت ئەگەر گازەکە هەموو ئەم شتانە ڕووناک بکاتەوە. من ئەو ڕۆژە نانی نیوەڕۆم نەخواردبوو، وەهەر لە سەرەتای ئێوارەوە لای ئەندازیارێک دانیشتبووم، دوو هاوڕێی تریشی لەلا بوو. من هەموو کاتەکە بێدەنگ بووم، دیاربوو بێدەنگیەکەشم ئەوانی بێزارکردبوو. لەبارەی شتێکی گرنگەوە قسەیان دەکرد و لەپڕ گەرم بوون، بەڵام هەموو شتێک لای ئەوان وەک یەک بوو. من ئەمەم بینی لێیان و گەرمبوونەکەشیان هەروابوو. منیش هەر لە خۆمەوە ئەمەم پێ وتن:

«گەورەکانم! هەرچۆنێک بێت هەموو شتێک لەلای ئێوە وەک یەکە«.

ئەوان بەم قسەیەم زویرنەبوون، بەڵکوو پێکەنینیان هات. پێکەنینەکەشیان لەبەرئەوە بوو کە من ئەم قسەیەم هیچ لۆمەیەکی تێدا نەبوو، بەڵکو بەس لەبەرئەوە بوو کە لەلای منیش هەموو شتێک وەک یەک بوو. ئەوان بینییان کە هەموو شتێک لەلام وەک یەکە، هەر ئەمەش بوو دڵی خۆشکردن.

کاتێک من لەسەر شەقامەکە بیرم لە گازەکە دەکردەوە، سەیرێکی ئاسمانم کرد. ئاسمان زۆر تاریک بوو، بەڵام بە ئاسانی ئەوە دەبینرا کە هەورەکان لەت لەت دیاربوون و لە بەینیشیاندا زۆر وردە خاڵی ڕەش دیاربوون.

لەپڕ لە خاڵێکی ڕەشیاندا ئەستێرۆکەیەکم بینی و بە وردی سەرنجم دایە، لەبەرئەوەش بوو کە ئەم ئەستێرۆکەیە بیرێکی پێ بەخشیم: کە من دەبێت ئەم شەو خۆم بکوژم. ئەم بیرە دوو مانگ لەمەوپێش هاتبوو بەسەرمدا، هەرچەندە زۆر هەژارم، بەڵام دەمانچەیەکی چاکم کڕی و هەر ئەو ڕۆژەش پڕم کرد لە فیشەک. وا دوو مانگی بەسەردا تێپەڕیوە و تا ئێستاش هەر لە سنووقەکەدایە. بەڵام چونکە بە تەواوی هەموو شتێک لەلام وەک یەک بوو حەزم دەکرد چرکەیەک بدۆزمەوە کە تیایدا یەکجار بەو شێوەیە هەموو شتێک وەک یەک نەبێت، بۆچی وام دەویست؟ نازانم. ئێ بەم شێوەیە، من هەموو شەوێکی ئەم دوو مانگە، کاتێک دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆم بکوژم. وە چاوەڕێی ئەو چرکەیەم دەکرد. وە ئەوەتا ئەو ئەستێرۆکەیە ئەم بیرەی پێ بەخشیم، وە وایشم بڕیاردا کە ئەم شەو دەبێت ئەم بڕیارە جێ بەجێ بکەم، بەڵام بۆچی ئەو ئەستێرۆکەیە ئەم بیرەی خستە مێشکمەوە؟ نازانم. ئێ ئاوا، کاتێک من سەیری ئاسمانم دەکرد، لەپڕ کیژۆڵەیەک ئانیشکی گرتم. شەقامەکە چۆڵ بوو بوو، کەسی لێنەمابوو. لە دوورەوە عەرەبانچییەک لەسەر عەرەبانەکەی خەوتبوو. کیژۆڵەکە تەمەنی هەشت ساڵێک دەبوو، دەستەسرێکی پێبوو، جلێکی تەنکی لەبەردابوو، بە تەواوی تەڕبوو تەر، بەڵام بە تایبەتی پێڵاوە تەڕە دڕاوەکەی لە یادم بوو، هەروەها ئێستاش لە یادم دەرناچێت و سەرنجیان بە تایبەتی قۆستمەوە. لەپڕ ئانیشکی ڕاکێشام و بانگی کردم. نەدەگریا، بەڵام هاوارێکی پچڕ پچڕی لێ بەرز دەبووەوە، وەک بیەویت شتێک بڵێت و نەتوانێ قسەکان تەواو بکات لەبەرئەوەی هەموو گیانی دەلەرزی، لەرزینێکی هێواش، لە شتێک ڕۆحی چووبوو، بە غەمبارییەوە هاواری دەکرد «دایکە.. دایکە« ئاوڕم لی دایەوە، بەڵام هیچم نەووت و لەسەر ڕۆشتنەکەم بەردەوام بووم، بەڵام ئەو هەر بەدوامدا ڕایدەکرد و ڕایدەکێشام، لە دەنگیدا لەرەیەک هەبوو، ئەو لەرەیەی منداڵە تۆقیوەکان هەیانە، من ئەو لەرەی دەنگە دەناسم.

هەرچەندە کیژۆڵەکە هیچ قسەیەکی تەواو نەدەکرد، بەڵام من ئەوەمزانی کە دایکی لە شوێنێک لە شوێنەکان گیان دەدا، یاخود شتێکی بەسەر هاتووە و هەر لەبەرئەوەش ئەو ڕایکردووە و هاوار هاواری

پێ کەوتووە بۆ یەکێک یان شتێک بدۆزێتەوە بۆ یارمەتی دانی، بەڵام من گوێم پێ نەدا و بەڵکو بە پێچەوانەوە لەپڕ بیرێکی وا هات بە سەرمدا کە دووری بخەمەوە لەخۆم. لە پێشدا من پێم وت کە بچێت پۆلیسێک بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو لەپڕ دەستی بەردا و خۆی زیاتر کۆکردەوە و لە تەنیشتمەوە ڕایەکرد و هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو وازی لێ نەدەهێنام. بەڵام من خۆم گێڤ کردەوە و بەسەریدا هاوارمکرد، ئەویش قایمتر قیژاندی «گەورەم، گەورەم...» بەڵام لەپڕێکدا بەجێی هێشتم و ڕایکردە سەرشەقامەکە ڕێبوارێکی تری لێ بوو، دیاربوو لەبەر ئەو وازی لە من هێنا.

چوومە قاتی پێنجەم، لە ژوورێکدا دەژیم کە بە کرێم گرتووە. ژوورەکەی من بچووک و هەژارانەیە، پەنجەرەکەی نیوە بازنەیە و بێ نرخە. کەرەوێتەیەکم (*) هەیە کە رووکەشەکەی قووماشە، مێزێکیش کتێبی لەسەرە، دوو کورسی و کورسییەکی تر نەرم و کۆن بەڵام (ڤۆڵتێر) ییە.

دانیشتم و مۆمێکم داگیرساند و بیرم دەکردەوە. لە ژوورەکـەی تەنیشتمەوە کە لەگەڵ ژوورەکـەی مندا بە دیوارێک جیاکراونەتەوە، دەنگە دەنگ هەر بەدەوام بوو، ئەم غەڵبە غەڵبە سێ ڕۆژ بوو بـەردەوان بوو. لەو ژوورەدا کاپیتانێکی سەربازی خانەنشین لە پلەی نەقیبدا دەژیا، شەش کەسی هیچ و پووچ میوانی بوون. ڤۆدگایان دەخواردەوە و بە کارتێکی کۆن یاری (شتۆس) (**) یان دەکرد دوێنێ شەو شەڕیان بوو، من دەزانـم کە دوانیان قژی یەکتریان ڕادەکێشا ئەو ئافرەتەی کە خاوەن ماڵە، ویستی شکاتیان لێ بکات، بەڵام هەر زۆر لە کاپیتانەکە دەترسێت. ئەو کەسانەی کە لە ژووری تردا دەژین، تەنها ئافرەتێکی لاوازی کورتەباڵایە، ژنە ئەفسەرە و سێ منداڵی لەگەڵدایە، کە لە ژوورەکاندا نەخۆش کەوتن. خۆی و منداڵەکانی تا ئاستی بوورانەوە لە کاپیتانەکە دەترسن. بەدرێژای شەو هەڵدەلەرزین و نیشانەی خاجیان دەکێشا تەنانەت هەرە بچکۆلەکەیان تۆقیبوو خەریک بوو بەلادا بێت. وەک من بزانم ئەم کاپیتانە ڕۆژێک دێت و لەسەر سەقامی (نیفسکی) دەست لە خەڵک پاندەکاتەوە، هیچ کەسیک ئیشی ناداتی، بەڵام ئەو شتەی کە زۆر سەیرە (تەنها لەبەر ئەوە ئەم شتە دەگێڕمەوە) ئەم کاپیتانە مانگێکی تەواوە لەوەتەی هاتووە لێرە بژی هیچ بێزاری نەکردووم. بێگومان لە سەرەتادا خۆم لە (یەکتر ناسین) دوورخستەوە، هەروەها هەر لە یەکەمجاردا بێزاری خۆی بەرامبەرم دەربڕی.

بەڵام بەلای منەوە وەک یەکە لەو دیـوەوە چەند هـاوار بکەن، چی ڕوودەدا من بە درێژایی شەو دادەنیشم و هەر گوێشم لێیان نییە، لە ڕاستیدا من وام لەبەرئەوەی فەرامۆشم کردوون. هەموو شەوێ من تا بەرەبەیان ناخەوم، ئەمە بۆ ساڵێک دەچێ وام. بەدرێژایی شەو لەسەر کورسییەکەم دادەنیشم و هیچیش ناکەم. کتێبیش ناخوێنمەوە بە ڕۆژ نەبێ. دادەنیشم و بیریش ناکەمەوە. ئەگەر بیرێکیش بە خەیاڵمدا گوزەر بکات ئەوا فڕێی دەدەم. لە شەودا هەموو مۆمەکە دەسوتێت.

بە ئارامی دانیشتبووم. دەمانچەکەم دەرهێنا و لە بەردەممدا دامنا، بیرمە کاتێک دامنا بە خۆمم ووت «کەواتە.. ئـاوا؟» وەڵامێکی بێ دوودڵـی خۆمم دایـەوە «ئـاوا» مەبەستم ئەوە بوو خۆم بکوژم. دەمزانی ئەمشەو خۆم دەکـوژم، بەڵام نەمدەزانی چەند دادەنیشم تا کاتی خۆکوشتن دێت، بێگومان خۆم دەکوشت ئەگەر ئەو کیژۆڵەیە نەبووایە.

-٢-

با پێتان بڵێم: هەرچەندە هەموو شتێک لەلام وەک یەک بوو، بەڵام هەستم بە ئازار دەکرد، بۆ نموونە

ئەگەر یەکێک لێی بدامایە هەستم بە ئازار دەکرد. وە هەر ئەمەش بەتەواوی لە پەیوەندییە ئەخلاقیەکانیشدا ڕەنگی دایەوە. ئەگەر شتێکی ناخۆش ڕووی بدایە هەستی بەزەییم دەبزوا، بەتەواوی وەک ئەو کاتەی کە لە ژیاندا هەموو شتێک لەلام وەک یەک نەبوو. بەم جۆرە بوو پێش ئێستا بەزەیم بە کیژۆڵەکەدا هاتەوە. وە ئەگەر کۆرپەیەک بوایە یارمەتیم دەدا. بەڵام بۆچی یارمەتی کیژۆڵەکەم نەدا؟ تەنها لەبەر بیرێک بوو ئەوسا هات بە مێشکمدا، کاتێک ڕایدەکێشام و بانگی دەکردم لەپڕ پرسیارێک لە بەردەممدا قووت بووەوە نەمتوانی شیکاری بکەم. پرسیارەکەش بێ نرخ بوو، بەڵام تووڕەی کردم. تووڕەبوونەکەشم لەبەر دەرەنجامەکەی بوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئەگەر من وا بڕیارم داوە کە ئەمشەو خۆم بکوژم. دەبێت ئەمشەو لە هەموو کاتێکی تر زیاتر ئەوەم لەلا خەست بێتەوە کە هەموو شتێ وەک یەکە، بەڵام بۆچی لەپڕ هەستمکرد کە هەموو شتێ لەلام وەک یەک نییە، بگرە بەزەیشم بە کیژۆڵەکەدا هاتەوە؟ بیرمە زۆرم بەزەیی پێداهاتەوە، هەستم بە ئازارێکی سەیریش کرد کە بۆ باری ئێستام شتێکی باوەڕ پێنەکراوە. بەڕاستی من ناتوانم بە شێوەیەکی باشتر تەعبیر لە هەستی ئەو ساتەم بکەم، بەڵام ئەو هەستە لەگەڵمدا بوو تا ماڵەوە، کاتێک لەسەر کورسییەکە دانیشتم مێشکم وروژابوو، وە ئەو بارە دەروونییەشم دەمێک بوو نەبوو بوو.

بیر لەدوای بیر بە مێشکمدا هاتن، وام هات بە خەیاڵدا کە ئەگەر من مرۆڤ بم، ئەوا تا ئێستا نەبوومە سفر. وە لەبەرئەوەی تا ئێستا نەبووم بە سفر کەواتە دەژیم، هەروەها دەتوانم ئازار بچێژم، تووڕەبم، لە کردەوەکانمدا هەست بە شەرم بکەم. با وابێت، بەڵام ئەگەر من خۆم بکوژم بۆ نموونە دوای دوو سەعات هەقم بەسەر کیژۆڵەکەوە چییە؟ بیریش لە شەرم کردن بۆ بکەمەوە و لە هەموو شتێکی ئەم دونیایەش. من دەبم بە سفر، بە سفرێکی ڕەها. ئایا هەست کردنێکی وا گونجاوە کە من دوای ماوەیەک (بوون)م نابێت، وە مانای ئەوەیە کە هیچ شتێک (بوون)ی نابێت، وە نەدەبووایە هیچ کارێکی لێ بکردمایە، نە بەزەیی بە کیژۆڵەکەدا، نە هەست کردنم بە شەرم دوای کردەوەیەکی ناشرین؟.

هەر لەبەرئەمە بوو قاچمدا بە زەویدا و هاوارێکی دڕندانەم بەسەر منداڵە بێ بەختەکەدا کرد، وەک ئەوەی بڵێم «نەوەکو هەر هەستیش بە بەزەیی ناکەم، بەڵکو ئێستا گەر کردەوەیەکی نامرۆڤانەشم لێ بوەشێتەوە، ئەوا دەتوانم چونکە هەموو شتێک دوای دوو سەعاتی تر دەکوژێتەوە». ئایا بڕوا دەکەن هەر لەبەر ئەمە بوو هاوارم کرد؟ وا ئێستا من بەتەواوەتیی ئەو شتەم لێ ڕوونە. وای لێ هاتووە کە هەموو شتێک (چ ژیان و چ دونیا) وەکو ئەوەی لەسەر من وەستابن وەهایە. وە دەتوانم بڵێم تەنانەت دونیا بەس لەبەر خاتری من و بە تەنها بۆ من دروست بووە. خۆم دەکوژم و دونیاش نامێنێت بەلای کەمەوە بۆ من، هەر لەوانەشە دوای من هیچ شتێک بۆ هیچ کەسێک نەمێنێت. دونیاش هەمووی دەکوژێتەوە بە کوژاندنەوەی من و نامێنێت. ڕەنگە هی ئەوە بێت کە ئەم دونیایە و هەموو ئەم خەڵکە لە خەیاڵی مندا کۆبوو‌بێتنەوە، بیرمە، دانیشتووم و بیرم لەو شتانە دەکردەوە. هەموو ئەو پرسیارانەم، ئەو پرسیارە کەڵەکە بووانەم یەک لەدوای یەک بۆ شوێنی جیاواز جیاواز دەنارد و شتێکی تازەم چنگ دەکەوت. بۆ نموونە، لەپڕ بیرێکی سەیر هات بە خەیاڵمدا ئەویش ئەوەبوو کە ئەگەر من لەسەر مانگ یان مەریخ بژیامایە و کردەوەیەکی لەڕادەبەدەر ناشرینم بکردبایە و لەسەر ئەوەش سزا و ئازار بدرامایە بە شێوەیەکی وا کە هەر لە خەون و ورێنەدا هەستی پێ دەکرێت، دوای ئەوەش بهاتمایەتەوە سەر زەوی و ئەو هوشیارییەشم بپاراستایە کە

لەسەر ئەستێرەکەی تر چیم کـردووە، لە هەمان کاتدا ئەوەشم بزانیبایە کە ئیتر هەرچی دەبێت تازە هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ ئەوێ، ئایا ئەو کاتە هەموو شتێ بەلامەوە وەک یەک بوو کاتێک لەسەر زەوییەوە سەیری مانگم بکردبایە؟ لەسەر ئەوە هەستم بە شەرمەزاری دەکرد یان نا؟ پرسیارەکانم بێ نرخ و زیادەبوون. لەبەرئەوە کە دەمانچەکە لە بەردەممدایە و بە هەموو (بـوون) مەوە زانیم کەواش دەبێت، بەڵام پرسیارەکان منیان وروژاند و سەرشێتیان کردم، وەک ئەوەی توانای مردنم نەبێت، کە من نەتوانم هیچ پرسیارێک وەڵام بدەمەوە. بە کورتییەکەی ئەم کیژۆڵەیە منی ڕزگارکرد، چونکە پرسیارەکان وایـان لێ کـردم کە خۆکوشتنەکەم دووربخـەمـەوە. لەم ماوەیەشدا هێمنییەک باڵی بەسەر ژوورەکەی کاپیتانەکەدا کێشا. لە یاری کردن تەواوبوون و خۆیان بۆ خەوتن ئامادە دەکرد. بەڵام بە پاڵکەوتنەوە بۆڵە بۆڵیان بوو. جنێوەکانیان بە تەمبەڵییەوە تەواو دەکرد. لەم کاتەدا لەسەر کورسییەکەمم سووکە خەوێک بردمییەوە کە ئەمە یەکەمجارە شتی وا ڕوویدات. بێ ئاگا خەوم لێکەوت.

وەک ئاشکرایە خەون شتێکی لە ڕادەبەدەر سەیر و سەمەرەیە. هەندێکیان بە تەواوی ڕوون و ئاشکران، تەنانەت شتە هەرە وردەکانیان وەک بەشێک بن لە یاقووت وا دەردەکـەون. بەڵام هەندێکی تریان پشتگوێ دەخەیت وەکو ئەوەی هەر نەشتبینیبێت: بۆ نموونە تۆ کات و شوێن جێ دەهێڵیت، واش دیارە خواست و ئارەزوو خەون کێش دەکەن نەک هۆش. دڵ نەک سەر، بەڵام ئای مێشکم چەند شتی نائاسایی لە خەونەکانمدا دەخولقاند، لەگەڵ ئەوەشدا شتی زۆر لە خەونەکانمدا دەبینران. بۆ نموونە براکەم پێنج ساڵ دەبێت کۆچی دوایی کردووە، هەندێک جار لە خەونەکانمدا دەیبینم، دەیبینم و بەشداری ئیش و کارمدەکات و بەیەکیشەوە زۆر دەگونجێین، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەدرێژایی خەونەکە ئەوە دەزانم و لەبیریشمە کە براکەم کۆچی دوایـی کـردووە و نێژراوە. چۆن سەرم سوڕنامێنێت لەوەی کە مردووە و لە تەنیشتمەوە دەوەستێت و هەرچۆنێک بێت خۆی لەگەڵمدا خەریک دەکات. بۆچی مێشکم بە تەواوی ڕێگە بەم شتە دەدات. بەڵام بەسە با بچمە سەر گێڕانەوەی خەونەکەم.

بەڵێ، ئەو ساتە ئەم خەونەم بینی، خەونەکەم لە ڕۆژی سێیەمی تشرینی دووەمـدا بوو ئەوان سەردەکەنە سەرم و دەڵێن کە ئەوە تەنها خەونێک بووە. بەڵام ئایا شیاوە کە خەون بووە یا نا، کە ئەگەر من بەهۆیەوە ڕاستیم بۆ دەرکـەوت؟ بەڵام ئەگەر مرۆڤ جارێک ڕاستی بۆ دەرکەوت و بینی، دەزانێت کە ئەوە ڕاستی بووە و هیچی ترنا. گەر بخەون یان بژین. باشە با خەون بێت، باشە با وابێت، بەڵام ئەم ژیانەی کەوا لەلاتان زۆر پیرۆزە، ویستم بە خۆکوشتنێک بیکوژێنمەوە، بەڵام خەونەکەم، خەونەکەم، ئای چ ژیانێکی تازە و مەزن و نوێکەرەوە و بەهێزی پێ بەخشیم! گوێ بگرن.

-٣-

وەک وتم سوکە خەوێک بردمییەوە، وەک ئەوەی کە لە بیرکردنەوە لەو شتانە بەردەوام بم. لەناکاودا خەونم بینی کە دەمانچەم بەدەستەوەیە، هەر بە دانیشتنانەوە بەرەو دڵمی ڕادەگرم. بەرەو دڵم نەک بەرەو کەللەم. کاتی خۆی وام بڕیاردابوو کە بێگومان دەمانچەکە بەرەو سەرم ڕادەگرم، بەتایبەتی لەلای بەشی ڕاستیش. بەرامبەر سنگم ڕامگرت یەک چرکە یان دووان چاوەڕێم کرد. مۆمەکەم، مێز و دیوارەکە لەپڕ دەستیانکرد بە جوڵانەوە، لاربوونەوە. بەخێرایی تەقاندم.

لە خەوندا هەندێ جار لە شوێنی بەرزەوە دەکەونە خـوارەوە، یان خـەون دەبینن و یەکێک سەرتان دەبڕێت یان لێتان دەدات بەڵام هەرگیز هەست بە ئازار ناکەن. مەگەر لەناو جێگاکەدا خۆتان خۆتان ئازار بدەن تەنها ئەو کاتە ئازارتان دەگات و هەمیشەش بەم ئازارەوە بەئاگادێنەوە، وە هەر ئەمەش بوو لە من ڕوویدا، هەستم بە ئازار نەکرد، بەڵام وامزانی کە بە گوللەکە هەموو گیانم کەوتە لەرزین، لەپر هەموو شتێک کپ بوو. دەوروپشتم لە ڕادەبەدەر لە تاریکیدا نقوم بوو، وەک کوێربووبم یان بەنج کرابم. ئەوەتام لەسەر شتێکی ڕەق ڕاکشاوم و هیچ نابینم و توانای کەمترین جوڵانەوەم نییە. لە دەوروپشتمدا خەڵک هات و چۆ دەکەن و هاوار دەکەن و کاپیتانەکەیش بە دەنگێکی بـەرز قسەدەکات، ئافرەتە خاوەن ماڵەکەیش دەزریکێنێت و لەپڕ کپ بوونێکی تر. دوای ئەوەش ئەوەتا لە تابووتێکی داخراودا هەڵمدەگرن، هەستیش دەکەم تابووتەکە دەلەرێتەوە و بیریشی لێ دەکەمەوە. لەپڕدا و بۆ جاری یەکەمین خەیاڵێک دەوروخولی دام کە من مردووم، بە تەواوی مردووم، من ئەوە دەزانم و گومانیشم لێی نییە، هیچ نابینم و هیچ ناجوڵێمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم و بیریش دەکەمەوە، بەڵام دوای تۆزێک بەرامبەر ئەو شتە دەستەوسان دەمێنمەوە. وەک شتێکی ئاسایی، وەک لە خەوندا بڕوا بەو شتە دەکەم کە بوونی هەیە بەبێ هیچ مشتومڕێک.

ئێ ئەوەتا لەناو زەویـدا دەمنێژن و هەموویان دەڕۆنەوە. منیش تەنیا، بە تەواوی تاک و تەنیا، ناجوڵێمەوە. کاتی خۆی، کاتی ئاگایی هەمیشە کە بیرم لەوە دەکردەوە چۆن لە گۆڕێکدا دەمشارنەوە، وەک تایبەتمەندێتی گۆڕ، بەرامبەری یەک هەستم هەبوو، ئەویش هەستکردن بەوەی کە گۆڕ سارد و شێدارە، هەروەها ئێستاش هەستم بە سەرمایەکی توند کرد، بە تایبەتی لە بەینی پەنجەکانی قاچمدا، بەڵام هەستم بەهیچ شتێکی تر نەدەکرد. ڕاکشابووم، سەیریش لـەوەدا بوو کە چاوەڕوانی هیچ شتێکم نەدەکرد، بەبێ هیچ مشتومڕێک بەوە ڕازی بووم کە مردوو چاوەڕوانی هیچ شتێک ناکات، بەڵام ئەوێ شێدار بوو وە ناشزانم کات چەند تێپەڕی: سەعاتێک یان چەند ڕۆژێکی کەم یان زۆر.

بەڵام لەپڕ دڵۆپێک ئاو کەوتە سەر تابووتە داپۆشراوەکە و لەوێوە ڕژایە سەر چاوی نوقاوی چەپم، بە دوای ئەودا و دوای دەقیقەیەک دڵۆپێکی ترو دڵۆپێکی ترو بەم شێوەیە هەموو دەقیقەیەک. لە دڵمدا تووڕەبوونێک کڵپەی کرد، کە وای لێ کـردم هەست بە ئازارێکی ئۆرگانی بکەم. بیرم کردەوە« ئەمە برینەکەمە. تەقەکردنەکە،گوللەکەش لەوێیە...» دڵۆپەکانیش یەکسەر دەڕژانە سەر چاوە نوقاوەکەم، لە پڕێکدا بانگی خاوەن دەسەڵاتم کرد ،ئـەوەی ئەو شتانەی بە سەرمدا هێنا. بە زمان بانگم نەکرد بەڵکو بە هەموو (بوون) مەوە چونکە نەدەجولامەوە.

–هەچ کەسێک بیت، بەڵام ئەگەر تۆ هەیت وئەگەر شتێک هەبێت ووشیارتر لەوەی کە ئیتر ڕوودەدات دەبانگی بکە بێت بۆ ئێرە. وە ئەگەر حەقم لێ دەکەیتەوە کە ناشیرین و نەزانانە کۆتاییم بە ژیانی خۆم هێناوە وژیانێکی بێ نرختریش لە دوایدا ئەوە بزانە کە هەرچی ئازارێک بچێژم لە هیچ کاتێکدا ناخرێتە ئاستی ئەم سوکایەتی پێ کردنەی ئێستام کە بە بێدەنگی هەستی پێ دەکـەم، بگرە لە بەردەوامی ملیۆن ساڵی تری ئازاریش.

بە داوا لێ کردنەوە بانگم کرد و بێدەنگ بووم. بێدەنگییە قووڵەکە نزیکەی دەقیقەیەکی تەواوی خایاند، کەچی دڵۆپێکی تر کەوتە خـوارەوە، بـەڵام ئـەوەم زانی،زانـیم و بە شێوەیەک بـڕوام بەوە کرد کە هەرگیز جێ پێی پێ لەق ناکرێت کە بێگومان ئێستا هەموو شتێک دەگۆڕدرێت.ئەوە

گۆڕەکەمە و لەپڕ درزی برد. مەبەستم ئەوەیە کە ئایا گۆڕەکەم سەرنەگیراو شەق بردوو بوو،بەڵام بونەوەرێکی تاریک و نە ناسراو هەڵیگرتم.خۆمان لە بۆشایی ئاسمان بینییەوە، لەپڕ توانیم تەماشا بکەم،شەو زۆر تاریک بوو، تاریکییەکی وا کە هەرگیز نەبوویێت ئێمە بەرزبووینەوە و لە زەوی دوورکەوتینەوە. من هیچ پرسیارێکم لەو کەسە نەدەکرد کە بەرزی دەکردمەوە،چاوەڕوان بووم و هەستم بە شانازی دەکرد، وا بڕوام بە خۆم دەهێنا کە ناترسم. نەترساندنەکەشم بووە بیرێکی بەستووی بەدڵداچوو. بیرم ناکەوێتەوە لە فڕینەکەماندا چەند کاتمان بەسەربرد. وە ناشتوانم وێنای بکەم:هەموو وا دەکەوێتەوە وەک هەمیشە لە خەوندا ڕوودەدات. کاتێک ئاستی کات و شوێن جێ دەهێڵیت، ئاستی یاسای(بوون) و هۆش، تەنها لەو خاڵانەشدا ئیستێکمان دەکرد کە دڵ خەونی پێوە دەبینێت. لەبیرمە، لەپڕ ئەستێرۆکەیەکم لە تاریکیدا بەدی کرد «ئەمە سیریوسە؟» (***) پرسیارم کرد. سەبرم سوا هەرچەندە نەمدەویست هیچ پرسیارێک بکەم.»نەخێر،ئەمە هەمان ئەو ئەستێرۆکەیەیە کە لە بەینی هەورەکانەوە بینیبووت کاتێ دەگەڕایتەوە بەرەو ماڵەوە« ئەو بوونەوەرەی کە منی هەڵگرتبوو وەڵامی دامەوە. زانیم کە لەوە دەچێت دەموچاوێکی مرۆڤانەی هەبێت، شتێکی زۆر سەیریش ئەوەبوو کە من ئەم بوونەوەرەم خۆشنەدەویست و ڕقم لێی دەبووەوە.

من بە تەواوی وامدەزانی کە (بوون)م نامێنێت هەر لەبەر ئەوەش بوو گوللەکەم گرتە دڵم، کەچی ئەوەتام دەستم بە دەستی بوونەوەرێکەوەیە،بێگومان مرۆڤ نییە، بەڵام (بـوون)ی هەیە.»ئاە. کەواتە دوای مردنیش ژیان هەیە«.بیرم لەو تەنکە ووشیارییە سەیرەی خەون دەکـردەوە، بەڵام هەموو دڵم بە هەموو قوورسیاییەکییەوە لەگەڵمدا بوو. بیرم کردەوە « ئەگەر جارێکی تر زیندووبوونەوە هەیە، بە پێی وویستی بوونەوەرێک ژیان جارێکی تر هەیە، کەواتە نامەوێت ئازارم بدەن و ناشمەوێت سووکایەتیم پێ بکرێت» بە هاوڕێی ڕێگاکەم ووت»تۆ دەزانیت کە من لێت دەترسێم، هەر لەبەر ئـەوەش ڕقت لێم دەبێتەوە«. نەمدەتوانی لەو پرسیارە پڕ سووکایەتی پێکردنە خۆم بگرم کە دان پێدانانی گرتبووەخۆ، هەست کردنیش بە سووکایەتی پێ کردن وەک سەرە دەرزی لە دڵمدا چەقیبوو. وەڵامی نەدامەوە، بەڵام لە پڕ هەستم کرد کە ڕقی لێم نابێتەوە ، گاڵتەشم پێ ناکات، تەنانەت بەزەیشی پێمدا نایەتەوە.وە ئەم گەشتەشمان ئامانجێکی شاردراوەی هەیە کە تەنها پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە.تۆزە تۆزە ترس لە دڵمدا زیادی دەکرد. شتێکی بێدەنگ بەڵام بە ئازار لە هاوڕێی سەفەرەکەم پێدەگەیشت وەک ئەوە وابوو بمبرێت. ئێمە لە تاریکییەکی بێ کۆتایدا دەفڕین. من دەمێک بوو ئەو ئەستێرانەم نەدەبینی کە بە چاوم ئاشنا بوون. من دەمزانی کە لە بۆشایی ئاسماندا ئەستێرە هەن کە تیشکەکانیان چەند هەزارو ملیۆن ساڵ نەبێ ناگەنە زەوی. لەوانە بوو ئەو بۆشاییەمان ببڕیایە من چاوەڕوانی شتێکی ترسناک و ئازاراویم دەکرد کە دڵمی تەنگ کردبوو. لە پڕ هەستێکی ئاشنا لە پلەیەکی بەرزدا منی ڕاچڵەکاند :لە پڕ ڕۆژەکـەی خۆمانم بینی. ئـەوەم زانی کە ناکرێت ئەمە ئەو(ڕۆژ)ە بێ کە زەویمانی لێ دروست بووە و ئێمەش بێ کۆتایی لێی دوورین. نەڵام لەبەر هۆیەکی نادیار، بە هەموو (بوون)مەوە زانیم کە ئەم (ڕۆژ)ە زۆر لە (ڕۆژ)ەکەی خۆمان دەچێت، دووبارەی ئەوەو دووانەن. ئەم هەستە شیرین و سەرنج ڕاکێشە لە ڕۆحم وورووکابوو: هێزی ڕووناکییە خۆشەویستەکەم، ئەو ڕووناکییەی منی دروست کردبوو هەموو دڵمی سەر لێو کرد لە زیندوێتی و هەستم بە ژیان کرد، بەو ژیانەی یەکەمجار، یەکەمجاری پێش مردنەکەم.

هاوارم کرد :ئەگەر ئەمە (ڕۆژ) بێت و وەک ڕۆژەکەی خۆمان بێت، ئەی کەواتە زەوی لە کوێیە؟ هاوڕێی سەفەرەکەم پەنجەی بۆ ئەستێرەیەک ڕاکێشا کە لە تاریکیدا وەک پیرۆزە دەدرەوشایەوە، دەستمان کرد بە فڕین بەرەو ئەوێ.

– ئایا شتێکی شیاوە ئەم هەموو دووبارەبووانەی گەردوون، ئایا ئەم یاسای سرووشتە بەجێیە؟ ئەگەر ئەوەش کە لەوێیە زەوی بێت، ئایا شتێکی بەجێیە کە وەک زەوی خۆمان بێت. بەتەواوی وەکو ئەوەی خۆمان، بێ بەخت و بێ کەڵک بێت، بەڵام بۆ هەتا هەتایە ئازیز و خۆشەویست، هەروەها هەمان خۆشەویستی پڕ ژان بۆخۆی دروست بکات وەکو زەوییەکەی خۆمان لە لایەن منداڵە بێسفەتەکانیەوە؟ هاوارم کرد، هاوارێکی پڕ داچڵەکین کە پڕی بوو لە خۆنەگرتن بۆ تامەزرۆی خۆشەویستی بەرامبەر ئەو زەوییەی کە جێم هێشت. لەبەرچاومدا سیمای ئەو کیژۆڵەیەی کە ئازارمدا قووت بووەوە. هاوڕێی سەفەرەکەم وەڵامی دامەوە:

– هەموو شتێک دەبینیت. لەرەی غەم لە ڕستەکەیدا بوو، ئێمە زۆر زوو لە ئەستێرەکە نزیک دەکەوتینەوە.. تۆزە تۆزە لەبەرچاومدا گەورە دەبوو، تاوام لێهات کە ئۆقیانووسەکان بناسمەوە، سنووری ئەورووپا بناسمەوە. کتوپڕ هەستێکی زۆر غەریب لە دڵمدا کڵپەی سەند، هەستێکی غەریبی وا کە سەرلێو بوو لە دڵپیسییەکی مەزنی پیرۆز. «چۆن دەبێت ئەم هەموو دووبارەکراوانە، وە لەبەرچی؟ من خۆشەویستیم لە دڵدایە، ئەو خۆشەویستیەم تەنها بۆ ئەو زەوییەیە کە بەجێم هێشتووە، ئەو زەوییەی کە خوێنمی لێ ڕژا کاتێک ژیانی خۆم بە گوللەیەک سڕییەوە. بەڵام من خۆشەویستیم هەرگیز بۆ زەوی سارد نەبۆتەوە، تەنانەت لەو شەوەشدا کە بەجێم هێشت. لەوانەیە لە هەموو کاتێکی تر زیاتر بە ژانێکی گەورەترەوە خۆشم بوێت. ئایا هیچ ژانێک لەم زەوییە تازەیەدا بوونی هەیە؟ ئێمە لەسەر زەوی خۆمان هیچ خۆشەویستییەکی تر ناناسین. من بۆ خۆشەویستی پێویستم بە ژانە. من پێویستمە، من تینووم لەم ساتەدا بۆ ئەوەی بۆ زەوی ڕازی بوونم دەرببڕم و فرمێسکیش لە چاوەکانمەوە بڕژێت. تەنها بۆ ئەو زەوییەی کە بەجێم هێشت. هیچ ژیانێکم ناوێت و بە هیچ شتێکیش ڕازی نابم ئەگەر لەسەر زەوییەکی تر بێت.

هاوڕێی سەفەرەکەم جێی هێشتبووم، زۆر کتوپڕ، وەک ئاگام لەخۆم نەبێت خۆم لەسەر ئەم زەوییە تازەیە بینییەوە. لە ڕۆژێکی هەتاویی پڕ سیحری وەک بەهەشت. وا دەردەکەوت کە وەستابم لەسەر یەکێک لەو جەزیرانەی کە ئەرخەبیلی یۆنانی پێک دێنێت. یان لە پارچە بەشێکی کەناری دەریا بەرامبەر ئەم ئەرخەبیلە. ئاهـ! هەموو شتی تەواو وەک هی خۆمان بەڵام وەکو ئەوە وابوو کە باق و بریقی درەوشانەوەی جەژن بێت، سەرکەوتنێکی مەزن و پیرۆزی دوا چرکە بێت. دەریاکە وەک پیرۆزەیەکی زۆر تەنگ خۆی لە کەنارەکەی دەدا و بە خۆشەویستییەکی ڕوون و بینراو و وشیارەوە ماچی دەکرد. درەختە باریکەلە جوانەکان بە هەموو گوڵە بێ نموونەکانیەوە وەستابوون، گەڵاکانیان کە لە ژماردن نەدەهاتن وایان لێ کردم کە بڕوا بەوە بهێنم کە بە لەرینەوە نەرمەکانیان بەخێرهاتنیان دەکردم وەکو ئەوەی کە چرپەی وشەی خۆشەویستی بێت. گیایە نەرمەکە دەدرەوشایەوە بەهۆی گوڵە بۆن خۆشەکانییەوە. باڵندەکان بە کۆمەڵ دەفڕین بێ ئەوەی لە من بترسن لەسەر لەپی دەستم، لەسەر شانم دەنیشتنەوە. بە خۆشییەوە، بە باڵە بچکۆلە جوانە ئێسک سووکەکانیانەوە باڵە فڕەیان بوو. لە کۆتایدا ئەو خەڵکە دڵخۆشەم بینی و ناسی. خۆیان هاتن بۆلام.. دەوریان دام. ماچیان دەکردم. منداڵەکانی ڕۆژ. منداڵەکانی ڕۆژەکانیان ئاهـ چەند

بێ نموونەبوون. بە هیچ شێوەیەک لەسەر زەوی خۆمان مرۆڤی لەو جوانییەم نەبینیوە، هەرچەندە لە منداڵەکانی خۆشماندا لە ڕۆژەکانی سەرەتای تەمەنیاندا جوانییەکی لەو بابەتە (هەرچەندە کەمیشە) دەبینرێ. چاوانی ئەو خەڵکە دڵخۆشانە ڕوون ڕوون دەدرەوشانەوە. سیمایان تیشکی زیرەکی لێ دەبـــوەوە، هوشیارییەکی پڕ دڵنیایی، ئەم دەموچاوانە شیرین بوون دڵخۆشییەکی منداڵانە لە وشە و دەنگیاندا دەلەرایەوە. ئاهـ، هەموو شتێک تێگەیشتم، یەکسەر تێگەیشتم هەر لەو ساتەوە کە سیمایانم بەرچاوکەوت. ئەو زەوییە زەوییەک بوو کفرکردن پیسی نەکردبوو، خەڵکێکی لەسەر دەژیان گوناح کردنیان نەدەزانی چییە، لە بەهەشتێکی وادا دەژیان وەک بەهەشتەکەی ئادەم و حەوای گوناحکار وەک لە هەموو چیرۆکە ئەفسانە مرۆڤایەتییەکاندا هاتووە، بەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان جیاوازی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئەم زەوییە هەمووی، بە هەموو بەش و سووچەکانییەوە یەک بەهەشت بوو. ئەو خەڵکە لێم وورووکابوون لە دڵەوە پێدەکەنین، زۆر نەرم و نیان لەگەڵمدا، بردمیانەوە بۆ ماڵەوە. هەریەکەیان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە دڵنیام بکەن. ئۆهـ! هیچ پرسیارێکیان لێ نەکردم. وا هاتنە پێش چاوم وەک ئەوەی کە هەموو شتێک بزانن، هەر لەبەر ئەوەش دەیانوویست ئەو ژانەی کە لەسەر دەموچاوم نیشتووە لە کەمترین کاتدا بسڕنەوە.

-٤-

وەک دەبینن ئەمە هەمووی بوو. بەڵام باشە ئەمە با تەنها خەونێک بێت. بەڵام هەستی خۆشەویستیم بەرامبەر ئـەو خەڵکە پـاک و بێ نموونانەدا تا هەتاهەتایە لە ناخمدا دەژی، هەست دەکەم ئێستاش خۆشەویستیان لەوێوە بەسەرمدا دەبارێت.من خۆم ئەوانم بینی، ناسیمن و بۆم دەرکەوتن و خۆشم ویستن، دوایش بە هۆی ئەوانەوە ئازارم چەشت. تەنانەت ئەوساش یەکسەر تێگەیشتم کە من لە زۆر لاوە بە هیچ شێوەیەک لێیان تێ ناگەم. بۆم ڕوون بوەوە کە من، منێکی پێشکەوتووخوازی ڕووسی هاوچەرخ، پێتربۆرگێکی بۆگەن بۆم شیکار نەدەکرا بۆ نموونە کە ئـەوان شتێکی زۆر دەزانـن، بەڵام زانستی ئێمەیان پێ نییە، بەڵام هەر زۆر بە خێرایی بۆم دەرکەوت کە زانیارییان لە هەندێ هۆکارەوە دروست بووە و تێروتەسەل و بێ ناتەواوی کە زۆر جیاوازە لـەوەی لای ئێمەی سـەرزەوی، هەروەها ویستخوازیشیان بە تەواوی جیاوازترە. هیچ شتێکیان نەدەویست و دڵنیاش بوون، نەشیان دەویست بەو جۆرە لە ژیان تێ بگەن کە ئێمە دەمانەوێت تێی بگەین، چونکە ژیانیان خۆی پڕبوو، بەڵام زانیارییان زۆر لەوەی ئێمە قووڵتر و بەرزتربوو، چونکە زانستمان بە دوای ڕوونکردنەوەی ئەوەدا وێڵە کە ژیان چییە، وە هەوڵدانەکەش هەر لەبەر ئەوەیە کە فێری ئەوانی تر بکات بژین، بەڵام ئەوان بەبێ زانست ئەوەیان زانیووە چۆن دەبێت بژین، من ئەمەم هەست پێکرد بەڵام لە زانیارییەکەیان تێ نەگەیشتم. درەختەکانیان پیشان دەدام، بەڵام لەوە سەرم دەرنەدەکرد کە بە چ خۆشەویستییەکی زۆرەوە سەیری درەختەکانیان دەکرد. وەکو ئەوە وابوو کە لەگەڵ زیندەوەرێکدا قسەبکەن کە کتومت لەوان دەکات. ئەوە بزانن کە هەڵە ناکەم ئەگەر بڵێم کە بگرە قسەیان لەگەڵ دەکردن. بەڵێ زمانەکەیان دۆزیبووەوە. من دڵنیام کە ئەو درەختانەش تێیان دەگەیشتن. هەر بەم شێوەیەش سەیری هەموو سروشتیان دەکرد. سەیری ئەو ئاژەڵانەش کە لەگەڵیاندا بە ئاشتی دەژیان. هێرشیان نەدەکردە سەریان. خۆشەویستیان بۆیان خۆشەویستییەکی پڕ دڵنیایی بوو پەنجەیان بۆ ڕادەکێشا. شتی وایان باس دەکرد لەبارەیانەوە کە من تێی نەدەگەیشتم. بەڵام لەوە دڵنیام کە وەک

ئەوەی شتێ بە ئەستێرەکانەوە بیانبەستێتەوە نەک تەنها بە خەیاڵ بەڵکو بە شێوەیەکی زیندوو. ئاهـ، ئەو خەڵکە نەیاندەویست کە من تێیان بگەم. بەبێ ئەوە منیان خۆش دەویست، لەگەڵ ئەوەشدا من ئەوە تێ گەیشتم کە ئەوان بە هیچ شێوەیەک لە من تێناگەن. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە من باسی زەوی خۆمانم بۆ نەکردن و تەنها بە بەرچاوی ئەوانەوە ئەو زەوییەم ماچ کرد کە لەسەری دەژیان. بە بێ هیچ وشەیەک ئەوانم پەرست. ئەوانیش بەوەیان زانی. وازیان لێ هێنام خۆشم بوێن و بیانپەرستم، بە بێ ئەوەی لە خۆشەویستییەکەم شەرم بکەن چونکە خۆیان خۆشەویستییەکی زۆریان لە دڵدا بوو. بە دەست منەوە ئازاریان نەدەکێشا کاتێک فرمێسک لە چاوەکانمدا قەتیس مابوون. هەندێک جار قاچم ماچ دەکردن، هەستم بە دڵخۆشی دەکرد کە ئەوان بە چ هێزێکی پڕ خۆشەویستییەوە وەڵامیان دەدامەوە. هەندێک جار بە سەرسوڕمانەوە لە خۆم دەپرسی: چۆن ئەوان توانییان ئەم هەموو کاتە دووروودرێژە ئــازاری مرۆڤێکی وەک من نــەدەن و بەرامبەر مرۆڤێکی وەک منیش هەستی دڵپیسی و خۆویستی نەبزوێنن؟ وە زۆر جار لە خۆم دەپرسی: ئایا من چۆن توانیم، منێکی لەخۆبایی و درۆزن، باسی ئەو شتانەیان بۆ نەکەم کە دەمزانین و ئەوانیش بێ ئاگا لێی. بێگومان نەمدەویست سەرنجیان بۆ ئەو شتانە ڕابکێشم و لەبەر خۆشەویستیشیان بوو؟ زۆر چالاک بوون، ڕۆح سووک بوون وەک منداڵ. گەڕۆکی ناو داروردەخت و دارستانە بێ نموونەکانیان بوون. گۆرانی خۆش خۆشیان دەچڕی. خواردنێکی سووکیان دەخوارد کە بەرهەمی درەختەکانیان بوو، هەنگوینی دارستانەکانیان، شیری ئاژەڵەکانیان، کە خۆشیان دەویست و بۆ خواردن و جلوبەرگیان زۆر مــانــدوو نــەدەبــوون، بەڵکو زۆر بە ئاسانی بەدەستیانەوە دەهات. خۆشەویستی لە نێوانیاندا هاتوچۆی دەکرد، منداڵەکانیان لەدایک دەبوون، بەڵام ئەو شەهوانییەتە دڵڕەقەی کە هەموومانی گرتۆتەوە لەسەر زەوی لای ئەوان نەبوو. هەموومان و هەریەکیش لە ئێمە دەبێتە سەرچاوەیەکی تاک و تەنیا بۆ هەموو گوناحی مرۆڤایەتیمان. دڵیان بەو منداڵانە زۆر دەکرایەوە کە لەدایک دەبوون، وەک بەشداربوویەکی تازەی دڵخۆشییان. لە نێوانیاندا شەڕ و دڵپیسی نەبوو، نەک ئەمە بەڵکو هەر نەشیاندەزانی ئەمانە چین و چی دەگەیەنن. منداڵەکانیان منداڵی هەمووان بوون، چونکە بە هەموویان یەک خێزانیان پێک دەهێنا. هیچ نەخۆشییەکیان نەبوو هەرچەندە مردنیان هەبوو، بەڵام پیرەکانیان بە هێمنی دەمردن، وەک خەوێکی قووڵیان لێ کەوتبێت، ئەوانیش لە دەوری کۆدەبوونەوە پیرۆزباییان لێ دەکرد و بۆی پێدەکەنین و بە زەردەخەنەیەکی ڕووناکەوە بەڕێیان دەکرد. لە بابەتی ئاوادا هیچ شیوەن و فرمێسکێکم بەدی نەدەکرد، تەنها خۆشەویستی نەبێت وەک ورشە و پرشەیەکی دڵشاد بەڵام نەشئەیەکی خۆش و هێمن بە تێڕامانەوە جێی دەگرتەوە. تەنانەت گومان لــەوە نــەدەکرا کە ئــەوان دوای مردنیش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ مردووەکاندا نەدەپچڕاند. ئەو کۆبوونەوە زەمینییەیان بە مردنیش بڵاوەی لێ نەدەکرا. کاتێکیش من باسی ژیانی ئەبەدیم بۆ دەکردن لێم تێ نەدەگەیشتن، بەڵام لەوە دەچوو گومانیشیان لێ نەبێت و تەنانەت ئەمە نەدەبووە هیچ مەسەلەیەک لەلایان. پەرستگایان نەبوو، بەڵام یەکگرتنێکی بــەردەوام و زیندوویان لەگەڵ هەموو گــەردوونــدا هەبوو. باوەڕکردنیان لانەبوو، بەڵام لەجیاتی ئەوە زانیارییەکی پڕیان لابوو لەبارەی ئەوەوە کە خۆشەویستییەکی زەمینیان تەواو دەکرد بەرامبەر سنووری سروشتی زەوی، چ بۆ مردووەکان و چ بۆ زیندووەکان پەیوەندیەکی فراوانتر دروست دەکەن لەگەڵ هەموو گەردووندا. بە دڵخۆشییەوە

چاوەڕوانی ئەم ساتەیان دەکرد، بەڵام بەبی ئەوەی پەلە بکەن، تامەزرۆیشیان بۆ دەرنەدەخست بەڵام وەکو ئـەوەی لە خولیای دڵیاندا خاوەنی بن لە نێوان خۆیاندا باسیان دەکرد. لە ئێوارەکاندا کاتێک خۆیان بۆ خـەو ئامادە دەکـرد، حەزیان دەکـرد هەندێ کۆڕاڵی ڕێکخراو و گونجاو ئامادە بکەن. لەم گۆرانیانەدا هەموو هەستی ڕۆژی بەسەرچوویان بەسەردەکردەوە. دەیانپەرست و خواحافیزییان لێ دەکرد. سروشت و زەوی و دەریا و دارستانەکانیان دەپەرست. حەزیان لەوەبوو گۆرانی بەسەر یەکدا هەڵبدەن و وەک منداڵ نازی یەکتریان دەگرت. ئەمانەش سادەترین گۆرانی بوون، بەڵام گۆرانییەک کە لە دڵەوە هەڵدەقوڵا و دەچووەوە ناو دڵ. بەڵێ، بەس تەنیا لە گۆرانییەکاندا نا، بەڵکو هەموو ژیانیان وەک دەبینرا کە بە شێوەیەک دەیانبردە سەر کە خۆشی وەربگرن لە بینینی یەکتری و هیچی ترنا، ئەمەیش عەشقێکی گشت و پڕ بوو. گۆرانییەکانی تر کە ئاهەنگساز و پڕ لە تامەزرۆیی بوون تێی نەدەگەیشتم. نەمدەتوانی بە هیچ شێوەیەک لە وشەکانی بگەم و ڕۆ بچمە نێو هەموو ماناکانیانەوە، بە شێوەیەک مانەوە کە نەدەگەیشتنە مێشکم، کەچی دڵم وەک ئەوەی خۆی لە خۆیدا زیاتر و زیاتر بچێتە ناویان. هەندێک جار پێم دەووتن کە ئەمە من خۆم زۆر لە مێژە خولیام بووە و هەستم پێ کردووە وە ئەم هەموو خۆشی و پیرۆزییەش وای بۆ دەچووم کاتێ لەسەر زەوی بووم وەک سۆزێکی ئاواتخواز کە هەندێ جار دەگەیشتە ئاستێکی غەمباری لە توانابەدەر، وە هەستم بە هەموویان کـردووە، بە پیرۆزییەکەیان لە خەونەکانی دڵمدا و لە ئاواتەکانی مێشکمدا کە وای لێ کردووم هەندێک جار کە نەتوانم لەسەر زەوییەوە سەیری ئەو خۆرە ئاوابووە بکەم بەبێ ئەوەی فرمێسک هەڵبڕێژم... هەمیشە غەمێکی قووڵی پڕ لە ڕقم بەرامبەر مرۆڤەکانی زەوی خۆمان هەبوو: بۆچی ناتوانم ڕقم لێیان نەبێتەوە بەبێ ئەوەی خۆشم نەوێن، بۆچی ناتوانم لێیان خۆش نەبم کەچی خۆشەویستیم بۆ ئێرە پڕە لە خەم؟ بۆچی ناتوانم خۆشم بوێن لە کاتێکدا کە ڕقم لێیان دەبێتەوە؟ گوێیان بۆ دەگرتم سەیرم دەکرد کە ناتوانن لێم تێبگەن، بەڵام هیچ پەشیمان نیم بەوەی کە ئەو شتانەم بۆ باس کردن: ئەوەم زانی کە ئەوان لەو هێزە پڕ خەمەم دەگەن بەرامبەر ئەو کەسانەی کە بەجێم هێشتن. بەڵێ، کاتێ تێیان دەڕوانیم بەو سەرنجە جوانە پڕ خۆشەویستییەیانەوە، کە کاتێک هەستم کرد کە دڵم لەلایان زۆر بەبێ تاوان و پاک مایەوە وەک دڵی خۆیان، پەشیمان نەبووم لەوەی کە تێیان نەگەیشتم. هەست کردنم بە پڕێتی ژیان ناخمی داگیرکرد و بە بێدەنگی نوێژم بۆ کردن.

ئاهـ، ئێستاکە هەموو لە بەرچاومدا پێکەنینیان دێت و سوورن لەسەر ئەوەی کە مەحاڵە نووستوویەک لە خەونیدا ئەم هەموو بەسەرهاتە ببینێت کە من دەیگێڕمەوە، وە منیش لە خەومدا بینیم یان هەستکردنێکم لەناو دڵدا دروست بوو کە لە وڕێنەی تاوە هاتووە. بەسەرهاتەکەش خۆم دروستم کردووە، لە کاتێکدا خەبەرم بووەتەوە. کاتێکیش ئەوەم بۆ ڕوون کردنەوە کە لە ڕاستیدا ئاساییە شتێکی وا ڕوویدات. ئۆهـ خوایە چ پێکەنینێک لە بەرچاومدا پێکەنین و چ نوکتەیەکیشیان بۆ ڕەخسا! ئۆهـ، بەڵێ، بێگومان تەنها هەست کردن بەو خەونە منی داگیر کرد، تەنیا خەونەکەش بە ساغ و سەلامەتی ڕژایە خوێنی دڵی بریندارمەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وێنە و شێوە ڕاستەقینەکانی خەونەکەم، ئەوەی کە بەڕاستی بینیبووم دەست نیشان کراوبوو بە گونجاندنێکی تـەواوەوە. زۆریش جوان و بێ وێنە بوو، وە زۆریش ڕاست بوو بە شێوەیەک کە کاتێک خەبەرم بـووەوە نەمتوانی بەم وشە بێ هێزانەی خۆمان بیگێڕمەوە. بەو مانایەی کە مێشکم سەرسام

بوو، ئەویش ئەوە دەگەیەنێت بەبێ ئەوەی ئاگاداربم ناچاربووم کە لە دوایدا گێڕانەوەکەی هەڵبەستم، وە شێواندم، بێگومان لە ئاواتێکی گەرم و گوڕەوە تەنها تۆزێکی لێ دەگێڕمەوە و لە نزیکترین کاتیشدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چۆن بڕوا بکەم کە ئەو هەموو شتە ڕووی داوە؟ لەوانەیە هەزار جار ڕووناکتر و خۆشتر بووبێ لەوەی دەیگێڕمەوە؟ با خەونێک بێت، بەڵام ئەوانە نەدەکرا ڕوویان نەدایە. با نهێنییەک ئاشکرا بکەم: ئەو شتانە لەوانەیە بە هیچ شێوەیەک خەون نەبووبن! چونکە ئەوەی دوایی ڕوویدا تا ئاستی ترسناک شتێکی ڕاست بوو. نەشدەبوو تەنها خەونێک بێت. با بڵێین دڵم ئەو شتەی خوڵقاندووە، بەڵام ئایا دڵم چۆن ئەو هێزەی هەبوو بتوانێت ئەو ڕاستییە ترسناکە بخوڵقێنێت کە دوایی بەسەرمدا هات؟ ئایا دەشێت دڵێکی ئاوا لاواز دروستی بکات و مێشکێکی ئاوا بە ناز و بێ نرخ ئەو دۆزینەوەیەی ڕاستیە بخوڵقێنێت؟ ئۆهـ، خۆتان حوکم بدەن. تا ئێستا ڕاستیم شاردۆتەوە. بەڵام ئێستا دەیدرکێنم. بە کورتی هەموویانم بۆگەن کرد!

-٥-

بەڵی، بەڵی وا کەوتەوە کە هەموویانم بۆگەن کرد! چۆن ئەوە ڕوویدا نازانم لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە ڕوونی لە یادمە. خەونەکەم هەزاران ساڵ فڕی، هیچم تێدا نەمایەوە تەنها هەست کردن بە هەریەکەیان نەبێت. تەنها ئەوەم دەزانی کە من بوومە هۆی گوناحی کەوتن، وەک کرمێکی پیسی دەزوولەیی، وەک پەتای تاعوون کە هەموو وڵاتان دەگرێتەوە. منیش ئەوانم تووش کرد، ئەو زەوییە پاکەی پێش من.

فێری درۆبوون، درۆیان خۆشویست. جوانێتی درۆیان زانی. ئۆهـ لەوانەیە ئەو شتە بەدەستی ئەنقەست دەستی پێ نەکردبێت، بە گاڵتەیەک بە نازێک، بە یارییەکی خۆشەویستی، لە ڕاستیدا لەوانەیە لە پەتاکەوە بێت، بەڵام پەتای درۆ چووە ناو دڵیانەوە. بە دڵیان بوو. دوای ئەوە شەهوەت پەیدابوو. شەهوەتی دڵپیسی لەدایک بوو. دڵپیسیش ڕقی دروست کرد... ئاهـ، نازانم بیرم نایەتەوە، بەڵام دوای تۆزێک، دوای ماوەیەکی زۆر کەم یەکەم خوێن ڕژا. سەرسام بوون و داچڵەکین، جیابوونەوە، پەیوەندییەکانیان لاواز بوو. یەکێتیان پەیدابوو، بەڵام دژ بەیەک بوون. گلەیی و لۆمەکردن دەستی پێ کرد. عەیبیان ناسی. عەیبیش گەیشتە ئاستی دڵفراوانی. مانای شەرەف لەدایک بوو. هەر یەکێتیەکیش ئاڵای خۆی بەرزکردەوە. ئازاری ئاژەڵەکانیان دەدا. ئاژەڵەکانیش لێیان دووردەکەوتنەوە و چوونە دارستانەکانەوە و بوون بە دوژمنیان. بۆ جیابوونەوە خەباتیان کرد. بۆ مانەوە بە تەنیا، بۆ تایبەتێتی، لە پێناوی ئەوەی کە ئەمە هی منە و ئەوەشیان هی تۆ. بە زمانی جیاواز کەوتنە قسەکردن. ئازاریان ناسی و خۆشیان وویست. تینووی ئازاردان بوون. وایان لێ هات دەیانووت کە ڕاستی دەست ناکەوێت لە ڕێگای ئازارەوە نەبێت، لەو کاتەوە بوو ئیتر لەلایان زانست سەری هەڵدا، وە کاتێکیش دڵڕەقییان نواند دەستیان کرد بە باس کردنی برایەتی و مرۆڤایەتی. ئەم بیرانە تێگەیشتن. وە کاتێکیش بوونە پیاوکوژ دادگایان دروست کرد. هەر بۆ خۆشیان یاسای تەواویان نەخشەکێشا بۆ ئەوەی بیپارێزن. بۆ پاراستنی ئەو یاسایانەش پەتی سێدارەیان نایەوە. ئەوان تۆزە تۆزە هەستیان بەوە کرد کە لەدەستیان چووە. حەزیان بەوە نەکرد تەنانەت باوەڕ بەوە بکەن کە ساتێک لە ساتەکان دڵپاک و بەختیار بوون. گاڵتەیان بە گریمانی بەختیاری کۆنی خۆیان کرد و وە ناویشیان لێ نا خەون. نەشیانتوانی لە وینە و شێوەدا وێنای بکەن. بەڵام ئەو شتەی کە سەیر و سەمەرەیە ئەوەیە کە کاتێک هەموو بڕوایەکیان بەو

بەختیارییە کۆنەیان نەما ناویشیان لێ نا ئەفسانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ویستێکی زۆر بەهێزیان هەیە کە سەرلەنوێ دڵساف و بەختیار ببنەوە، جارێکی تر وەکو منداڵ، حەزی دڵیان خۆش ویست.

ئەو حەزەیان پەرست. پەرستگایان دروستکرد. نوێژیان بۆ ئەو بیرە کرد، بۆ ئەو حەزە، کەچی لە هەمان کاتدا بڕواشیان بەوەیە کە مەحاڵە ئەو شتە بێتە دی. بوونیشی زەحمەتە. بەڵام دەیپەرستن و سوژدەی بۆ دەبەن و فرمێسکیش لە چاوەکانیاندایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر گریمانی ئەوە هەبێت کە بگەڕێنەوە بۆ حاڵەتی بەختیاری و دڵسافی، ئەوەی کە لە دەستیان چووە، وە ئەگەر یەکێک کتوپڕ پێشانیدان و لێی پرسین: ئایا دەتانەویت بۆی بگەڕێنەوە؟ لەوانەشە زۆریش کە نەیانەوێت. دەیانگوت «با درۆزن بین، بۆگەن، دڵڕەق بین، ئێمە ئەوە دەزانین، بۆ ئەوەش دەگرین و هەر بەوەشەوە دەتلێینەوە، وە سزای خۆمان دەدەین زیاتر لەو دادپەروەرە دڵ نەرمەی کە حوکممان دەکات و ناوەکەشی نازانین، بەڵام زانستمان هەیە، لە ڕێگەی ئەوەشەوە جارێکی تر ڕاستی دەدۆزینەوە، بەڵام ئەوسا بە هوشیارییەوە وەریدەگرین، زانین لە سۆز پیرۆزترە، هوشیاری ژیانیش پیرۆزترە لە ژیان. زانست حیکمەتمان دەداتێ. حیکمەتیش یاساکان دەدۆزێتەوە، وە زانینی یاساکانی بەختیاری لە بەختیاری پیرۆزترە«.

ئا ئەمەیان دەووت ئەوسا دوای ئەم وشانەش هەچ کەسێک خۆی لە هەموو کەسێک خۆشتردەویست. نەدەکرا گەر وایان نەکردبایە. هەریەکەیان دڵپیسییەکی گەورەی هەبوو بەرامبەر خودی خۆی. بە هەموو هێزی خۆشی تێدەکۆشا بۆ دەست بەسەردا گرتن و کەم کردنەوەی نرخی ئەوانی تر. ئا لەمەدا ژیان وێناکراو، کۆیلەیەتی لەدایک بوو، تەنانەت کۆیلەی خۆبەخت کراویش لە دایک بوو.

لاوازەکان خۆیان دایە پاڵ بەهێزەکان، هەر لەبەر ئەوەی کە بەهێزەکان لاوازەکانی لە خۆیان لاوازتریان دەشێلا و خەڵکی ئیمانداریش پەیدا بوون کە چاو بە فرمێسک دەهاتە لایان و باسی گەورەیەتی کەسایەتی خۆیانیان دەکرد. باسی ونبوونی سنوورەکان و گونجاندنەکان، باسی لەدەستدانی ڕەوشت. ئەوانیش گاڵتەیان بە قسەکانیان دەکرد، بەردەبارانیان دەکردن خوێنی پاک لە بەردەمی پەرستگاکاندا ڕژا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک کەس پەیدابوون بە جۆرێک بیریان دەکردەوە کە: چۆنە ئەگەر جارێکی تر یەکبگرنەوە بە شێوەیەک کە هەریەکە خۆی لە هەموو کەسی زیاتر خۆش بوێت و لە هەمان کاتدا لەسەر ڕێگای کەسی تر نەوەستێت. با هەموو . با هەموو کەس بە یەکسانی بژی، بە شێوەیەک وەک لە کۆمەڵگایەکی گونجاودابن. شەڕی گەورە گەورە بەهۆی ئەم بیرەوە ڕوویدا. هەموو شەڕکەرەکان لە هەمان کاتدا بڕوایەکی تەواویان بەوە بوو کە زانست و هوشیاری و هەستی پارێزگاری کردنی خود لە کۆتاییدا وا لە مرۆڤ دەکات کە یەکبگرن لە کۆمەڵگایەکی گونجاوی وادا کە پابەندی وشیاری بێت. لەبەرئەمە و بۆ بەدەست هێنانی خێرای ئەم مەسەلەیە، لەم کاتەدا وشیارەکان خەریک بوون کە ناووشیارەکان بسڕنەوە و ئەوانیش کە لە بیرەکەیان ناگەن بۆ ئەوەی ڕێگەی سەرکەوتنیان لێ نەگرن. بەڵام هەستی پارێزگاری کردنی خود زۆر زوو لاواز بوو. لە خۆبایی بووەکان و خاوەن شەهوەتەکان بە ڕوونی یان داوای هەموو شتێکیان دەکرد یان داوای هیچ شتێک. بۆ ئەوەیش کە هەموو شتێکیان دەست بکەوێت کەوتنە دڕندایەتی ئەگەر دەستیش نەکەوت ئەوا بۆ خۆکوشتن. ئاینەکان دروست بوون بۆ پەرستنی نەبوون و تێکشکاندنی خود، بۆ ئارامگرتنی هەتا هەتایی وێران کردن. لە کۆتاییدا بە دەست ئەو هەوڵدانە بێ ئاکامەیانەوە شەکەت بوون. چەشتنی

ئازار بە دەموچاویانەوە نیشت. دواییش هەر ئەوانە بەیانی ئەوەیان کرد کە ئازار چەشتن جوانییە، تەنها لە ئازاردا بیر هەیە، لە گۆرانییەکانیاندا باسی ئازاریان دەکرد، لەگەڵیاندا دەڕۆیشتم و هەردوو باڵم کردبووەوە و بۆیان دەگریام ، بەڵام خۆشم ویستن، لەوانەیە لە جاران زیاتر، ئەو کاتەی کە هیچ ژانێک لەسەر سیمایان نەنیشتبوو، ئەو کاتەی کە هەموویان دڵساف و جوان بوون. زەوییە قێز لێ کراوەکەیانم زیاتر لەو کاتەی کە بەهەشت بوو خۆش ویست، هەر لەبەر ئەوەش کە ژان تێیدا لە دایک بوو. ئاه، هەمیشە خەم و ژانم خۆش دەویست، بەڵام تەنها بۆ خۆم، بەس بۆ خۆم، بەڵام گریانم هات بۆ خەم و ژانیان و بەزەییم پیایاندا هاتەوە. دەستی تەڕ و فرمێسکاویم پێیان وشک دەکردەوە، خۆم تاوانبار و نالەبار و نەعلەت لێکراوی ئەم خەمەم بووم. پێم دەووتن کە هەموو ئەم شتانە من کردوومن، تەنیا من. من بووم جیابوونەوە و پەتا و درۆم بۆ هێنان! لێیان پاڕامەوە کە لەسەر خاچ بمبەستنەوە. فێریشم کردن چۆن چۆنی خاچ دروست بکەن. نەمدەتوانی و هێزی ئەوەشم نەبوو کە خۆم خۆم بکوژم، بەڵام دەمویست کە ئازاردانیان لێ قبووڵ بکەم. تینووی ئازار بووم، تینوو بووم بۆ ئەوەی کە لەم تلانەوەیەدا تا دوا دڵۆپ خوێنم بڕژێ. بەڵام تەنها ئەوەیان کرد کە پێم پێبکەنن، لە دوایشدا بە شێتیان لە قەڵەم دام. دڵخۆشییان دەدامەوە و دەیانووت کە خۆیان حەزیان لەوە بوو کە ڕوویداوە، وە ئەوەی کە ڕوویداوە هەر دەبوایە ببێت. لە کۆتایدا وتیان بۆ ئەوەی مەترسی دروست نەکەم لەسەریان، ئەگەر بێدەنگ نەبم ئەوا دەمبەنە شێتخانە. لەم کاتەدا ژانێکی زۆر ڕۆچووە ناخمەوە. تا دڵم ڕاوەستا، وام هەستکرد کە دەمرم و لێرەدا....... باشە ئا لەم کاتەدا خەبەرم بووەوە.

بەیانی بوو، مەبەستم ئەوەیە جارێ دونیا ڕووناک نەبووبوەوە، بەڵام سەعات شەش بوو، لەسەر ئەو کورسییە خۆم بینییەوە، مۆمەکەش هەمووی سووتا بوو، خەڵکەکەی ژووری کاپیتانەکەش نووستبوون. هێمنییەکی دەگمەن لە ماڵەکەماندا بوو. یەکەم شت کە کردم ئەوەبوو کە بە سەرسامییەکی زۆرەوە هەستام: هیچ کاتێک شتی لەو بابەتەم بەسەر نەهاتووە، شتێک تا ئاستی بی نرخی و بچووکی. هیچ کاتێکیش بۆ نموونە بەو شێوەیەی سەر کورسییەکە لە خەو هەڵنەستاوم. لەم ساتەدا و لە کاتی هەستاندا وەک هۆشم بێتەوە بەر خۆم، لەپڕ دەمانچە پڕکراو و ئامادەکراوەکە لەبەر چاومدا قووت بووەوە، بەڵام کتوپڕ لەخۆم دوورخستەوە! نەخێر! لە ئێستەوە بەرەو ژیان، بەرەو ژیان! قۆڵەکانم بەرزکردەوە. بانگی ڕاستییەکی ئەبەدیم کرد، بانگم نەکرد بەڵکو گریام، نەشئەیەکی پڕ دڵشادی کە پێوانە نەدەکرا بەرەو هەموو بوونم بەرزبووەوە، بەڵێ، ژیان و بانگەواز! ئاە هەر لە چرکەی یەکەمەوە بانگەوازم بەرزکردەوە، بێگومان، بۆ هەتاهەتایی ژیان من دەڕۆم و بانگەوازم هەیە، دەشمەوێت هەمبێت، بانگەوازی چی بکەم؟ بانگەوازی ڕاستی دەکەم، چونکە ڕاستیم بینی، بەم چاوانەی خۆم بینیم، هەموو پیرۆزییەکەم بینی.

ئەمە منم، لەو کاتەوە هەر بانگەواز دەکەم! وە منیش لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەوانەم خۆش دەوێت کە گاڵتەم پێدەکەن، لە هەموو کەسێ زیاتر ئەوانم خۆش دەوێت. بەڵام بۆچی وا؟ نازانم و ناشتوانم شی بکەمەوە، بەڵام با وابێت. ئەشڵێن: تۆ لە مەسەلەکەدا تێ کەوتوویت، ئەگەر تۆ هەر لە ئێستەوە وا تێکەوتبیت، ئەی لە دواڕۆژدا چۆن؟ هەر ئەو ڕاستییە: لە مەسەلەکەدا تێ کەوتووم، لەوانەشە دوایی خراپتر بکەویتەوە. بێگومان چەند جارێکی تر تێدەکەوم تا ئەو کاتەی کە دەزانم چۆن بانگەواز بکەم و بە چ وشەیەک و بە چ کردەوەیەک، چونکە هاتنەدی ئەوە زۆر گرانە. بەڵام ئێستا هەموو شتێ

وەک ڕۆژی ڕووناک دەبینم، بەڵام گوێ بگرن: کێ لە مەسەلەکەدا تێ نەکەوتووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەس لە ووشیارترینەوە تا دوا دەست بڕ بەرەو یەک ئامانج دەڕۆن، بەڵام بە ڕێگای جیاواز جیاواز. ئەمەش ڕاستییەکی کۆنە، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا تازە بێت ئەوەیە کە نابێت بە تەنها من تێبکەوم، چونکە من ڕاستیم بینی، بینیم و دەشزانم کە خەڵک دەتوانن جوان و بەختیار بن، بەبێ ئەوەی کە توانای ئەوەیان نەمێنێت کە لەسەر زەوی بژین. نامەوێت و ناشتوانم وا بیربکەمەوە کە خراپە کردن حاڵەتێکی سروشتیی مرۆڤە. خەڵکیش بە هیچ پێکەنینیان نایەت بەم بیرەم نەبێت. بەڵام چۆن وا بیرنەکەمەوە، کە خۆم ڕاستیم بینی، بە مێشکم دروستم نەکردووە، بەڵام بینیم، بینیم و وێنە زیندووەکەی تا هەتاهەتایە ڕۆحمی داگیرکردووە. بە شێوە گشتییە دەستنیشانکراوەکەی بینیم. بە جۆرێک کە ناتوانم وا بیربکەمەوە کە لەلای خەڵکی نەبێت. کەواتە، چۆن تێ کەوتووم؟ بێگومان لادەدەم، نەک جارێک، بەڵکو چەند جاریک، لەوانەشە بە وشەی نامۆ بدوێم بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆرنا.

ئەو وێنە زیندووەی بینیم هەمیشە لەگەڵمدا دەبێت، بۆم ڕاست دەکاتەوە و ڕێگەم پێ نیشان دەدات. ئۆهـ، ئەوەتا من چالاکم، من تازەم. من دەڕۆم دەڕۆم ئەگەر بۆ هەزارساڵیش بێت. ئایا ئێوە ئەوە دەزانن کە من لە سەرەتادا ویستم ئەوە بشارمەوە کە هەموویانم بۆگەن کرد، بەڵام ئەمە هەڵە بوو، هەڵەی یەکەمیش بوو.

بەڵام ڕاستی چرپاندی بە گوێمدا کە درۆنەکەم، پارێزگاری کردم، ڕێگەی پێ نیشاندام. بەڵام چۆن بەهەشت دروست دەکرێت؟ نازانم چونکە ناتوانم تەعبیری لێ بکەم، دوای ئەو خەونە وشەکانم لێ ونبوون، بەلای کەمەوە هەموو وشە سەرەکییەکان، وشە پێویستەکان. بەڵام با وابێت: دەبێت بڕۆم، دەشبێت قسەبکەم، بە ماندووێتی. هەر لەبەر ئەوەش وا دەکەم هەر چۆنێک بێت چونکە ئا بەم چاوانەی خۆم بینیم. بەڵام گاڵتەچییەکان ئەوە تێ ناگەن. دەڵێن «تۆ خەونت بینیووە، قسەی هەلەق و مەلەقە، وڕێنەیە«. ئاخ! تۆ بڵێی ئەمە ژیرێتی بێت! ئەوانە بە خۆیان زۆر دەنازن! خەون! خەون چییە؟ ئایا ژیانمان خۆی خەون نییە؟ با ئەمەشی بخەمە سەر و بڵێم: با وابێت، با ئەمە هەرگیز نەیەتەدی. با بەهەشتیش بوونی نەبێت (بێگومان من ئەمە دەزانم!)، با وابێت، بەڵام هەر بانگەوازی ئەوەمە. لەگەڵ ئەوەشدا چەندە سادە بێت، ئەگەر بێت و ڕۆژێک لە ڕۆژان، ساتێک لە ساتەکان هەموو ئەو شتانە یەکسەر بێنەدی! لە هەموو شتێک سەرەکی تر یەکتریتان خۆش بوێت و ئەمەیش لە هەموو شتێک سەرەکی ترە و هەموو شتێکیشە. پێویستمان بە هیچ شتێکی تر نابێت: دەشبینن چۆن هەموو شتێک دێتە دی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە تەنها لە ڕاستییەکی کۆن زیاتر نییە کە دووبارەکراوەتەوە و بلیۆن جار خوێنراوەتەوە، بەڵام قەت جێبەجێ نەکراوە! «هۆشیاری ژیان لە ژیان زیاترە، وە زانینی یاساکانی بەختیاری لە بەختیاری پیرۆزترە« — دژی ئەمەش دەبێت تێبکۆشین! تێدەکۆشم. ئەگەر هەمووان بیانەوێت، کەواتە کتوپڕ هەموو شتێک دێتەدی. بەڵام ئەو کیژۆڵەیەی کە دەگەڕام بە دوایدا دۆزیمەوە... من دەڕۆم! و دەڕۆم.

پەراوێز:

(*) دیڤان: وەک کەرەوێتە وایە، بەڵام دەکرێتەوە و وەک قەرەوێڵەی لێ دێت. (و)

(**) شتۆس: یارییەکی کۆنە و بە کارت دەکرێت. (و)

(***) سیریوس: ڕووناکترین ئەستێرەی گەردوونە. (و)



ریچارد داوکینز

**هەندێ جار بەڵگە، بینینی تەنیا نیە، بەڵکو بینین، پشتگیری بەڵگەکان دەکات. بۆ نموونە لەبارەی کوشتنیکەوە، هەندێ جار هیچ کەسێك ( جیاواز لە بکوژ و کوژراو ) شاهیدی ڕووداوەکە نەبوون.**

ژۆلیت گیان

ئێستاکە بوویتە دە ساڵان، دەمەوێ لەبارەی هەندێ مەسەلەوە بۆت بنووسم کەپێموایە گرنگن. ئایا هەرگیز بیرت لەوە کردوەتەوە کەئێمە چۆن ڕێمان بەو شتانە بردوە کە دەیزانین ؟ بۆ نموونە لەکوێ دەزانین کە ئەستێرەکان چۆن چاولێکدەنێن کەوەک خاڵی ورد ورد لەئاسماندا دەبینرێن، کە لەڕاستیدا تۆپگەڵێکی ئاگراوی گەورەن هەروەکو خۆر کە زۆر لەئێمەوە دوورن ؟ وە ئایا دەزانین کەشتی زەوی کە تۆپێکی بچوکترە، بەدەوری یەکێک لەو ئەستێرانەدا دەسوڕێتەوە کە ناوی خۆرە ؟ وەڵام بەمشێوەیە: بە بەڵگە! هەندێ جار بەڵگە بەمانای ( بینین یا بیستن، دەستلێدان، بۆنکردن،..) شتێک تابزانین کە ئەوشتە بوونی هەیە. ( کەیهان نوردان)* بە ئەندازەی کافی لە زەوی دورکەوتەوە تا بەچاوی خۆیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، خڕی زەوی ببینن.

هەڵبەتە هەندێ جار هەروەها چاوی ئێمە پێویستی بەیارمەتیدانە. ئەستیرەکان بەشەودا کە لەئاسماندا چاو ئەتروکێنن وخۆیان دەنوێنن، بەڵام ئەگەر بە تەلەسکۆبێک سەیریان بکەین، دەبینین کە ئەم گۆی زەویە جوانە لە واقعدا هەسارەیەکی دیارە. شتێکە کە بەبینینی ڕاستەوخۆ ( یا بیستن، دەست لیدان...) بەدەست دێت و دەبینرێت. هەندێ جار بەڵگە، بینینی تەنیا نیە، بەڵکو بینین، پشتگیری بەڵگەکان دەکات. بۆ نموونە لەبارەی کوشتنێکەوە، هەندێ جار هیچ کەسێک ( جیاواز لە بکوژ و کوژراو ) شاهیدی ڕووداوەکە نەبوون. بەڵام چاودێرانی ئاسایش دەتوانن بەخستنەپاڵ یەکی بینراوە جۆربەجۆرەکان گومان لەکەسێک بکەن. ئەگەر نیشانەکانی بوونی جێپەنجەی کەسێک بەچەقۆیەکەوە بدۆزرێتەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کەسە پێشتر دەستی بەر ئەو چەقۆیە کەوتووە. هەڵبەتە ئەم مەسەلە بەتەنیا

قاتل بوونی کەسەکە ناسەلمێنێت، بەلام کاتێک ئەو بەڵگەیە لەپاڵ بەڵگەیتردا دەبینینەوە، دەتوانرێ بە بەڵگەگەلێکی باش لەقەڵەم بدرێ. هەندێ جار چاودێرانی ئاسایش بە بروسکەیەک پەی بەخاڵی کۆتای هەموو بەڵگەکان دەبەن وپێکەوە گرێیان دەدەن. چاودێرانی ئاسایش بەخۆیان دەڵێن: ئەگەر بکوژ واو وای کردبێت، ئەم بەڵگانە بەتەواوی لۆجیکی دێنە پێشچاو. زانایان کەسانێک کە تایبەتمەندن بەپشکنینی ڕاستەیەکانی جیهان، بەڕێگەیەکی لەچەشنی چاودێرانی ئاسایش کاردەکەن. ئەوان لە فۆناغی یەکەمدا گومان دەکەن و لەخۆیان دەپرسین ئەگەر لە ڕاستیدا ئەم دیاردانە بەم شێوەیە بونایە دەبوایە ئاواو ئاوا واقعی ڕوویبدایە، بەم قۆناغە دەڵین پشبینیکردن. بۆنموونە ئەگەر گریمانەی خڕی زەوی بەفەرز وەرگرین، ئەتوانین ئەو چاوەڕوانیەمان هەبێت گەر گەڕۆکێک کە لەخاڵی سفرەوە دەستپێدەکات و ڕاستەوخۆ رێگە دەگرێتەبەر، سەرئەنجام دەگەرێتەوە هەمان خاڵی دەستپێکردنەوە. کاتێک کە پزیشکێک پێتدەلێ کە تۆ سورێژەت هەیە، بە سەیرکردنێک سەراپای نەخۆشیەکەت دەستنیشان ناکات بەڵکو لە هەنگاوی یەکەمدا ئەوە بە فەرز ئەگرێ کە ڕەنگە تۆ سورێژەت هەبێت. دواتر بەخۆت دەڵێ: ئەگەر بەڕاستی ئەمە نەخۆشی سورێژە بێ، دەبێ چاوەڕانی چ هێما و نیشانەگەلێک بکەی. بەسوود وەرگرتن لە چاو (ببینم کە داخ بوویت) لە گەرما یا بەدەستلێدان نێوچاوانت گەرمە؟ بە گوێگرتن ئایا کاتیک کە هەناسە دەدەیت قەفەزەی سنگت خیزە خیز دەکات؟. تەنیا پاش هەموو ئەو تاقیکردنەوانەیە کە پزیشک بڕیاری کۆتای دەگرێ و دەڵێ : لێکدانەوەی من ئەوەیە کە ئەم منداڵە سورێژەی هەیە. هەندێ جار پزیشکەکان بۆ چارەسەر کردنی ورد تافیکردنەوەی تریش ئەنجام دەدەن. بۆ نموونە فەحسی خوێن دەکەن،..یا لەم ڕێگەیەوە بە دەست و چاو گوێچکەکانی خۆی پشگیری بۆ گریمانەکەی بەدەستدێنێت.

ئەو ڕێگە و شێوازانەی کە زاناکان سوود لە بەڵگەنامەکان دەبینن بۆ ئەوەی دەرکی جیهان بکەن، زۆر لەوە وشیارانەترو ئاڵۆزترە کە من لە یەک نامەدا بیگونجێنم. بەلام ئێستە دەمەوێ کەمێک زیاتر لەبارەی بەڵگەنامەوە قسەت بۆ بکەم کە دەلیلێکی باشە بۆ باوەڕهێنان، لەهەمان کاتدا ئەمەوێ ئاگاداری بکەمەوە لە سێ هۆکاری خراپ بۆ باوەڕ کردن . ئەو هۆکارانە بریتین لە«نەریت»، «ئۆتۆریتە« (مرجەعیەت) ە « ئیلهام».

سەرەتا باپێکەوە لە نەریت بکۆڵینەوە. چەند مانگ لەمەوبەر من بۆ بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بانگهێشکرابووم کە لەوێ نزیکەی پەنجا منداڵ لە ئاینە جۆرجۆرەکان لە دەوری یەک کۆببوونەوە. هەندێکیان مەسیحی بوون، ئەوانیتریش موسڵمان، یەهودی، پەیڕەوانی ئاینی هندی یا سیک. پیاوێک کە میکرۆفونەکەی بەدەستەوە بوو بە هۆڵەکەدا دەگەڕاو لەلای منداڵێکەوە دەچووە لای منداڵایکیتر و لەبارەی باوەڕیانەوە پرسیاری لێدەکرن. وەڵامگەلێک کە درایەوە پڕاوپڕی ئەو ڕوونکردنەوەیە کە من مەبەستمە لەبارەی نەریتەوە. هەر بەوشێوەی کەچاوەڕوان دەکرا وەڵامەکانیان بچوکترین پەیوەندی بە بەڵگەوە نەبوو. هەرکامەیان باوەڕی دایک وباوک و سەرپەرشتیارانی خۆیان دووپات دەکردەوە؛ کە ئەوان بە نۆبەی خۆیان لەسەر بنچینەی بەڵگەننامە بنیادنەنرابوو. بۆ نموونە ڕستەگەلێکی لەم جۆرەیان دەوتەوە: ئێمە هندیەکان باوەڕمان ئاواو ئاوایە؛ ئێمە

موسڵمانان بەو شێوەو بەو شێوە بیردەکەینەوە؛ ئێمە مەسیحەیەکان باوەڕگەلێکی ترمان هەیەو.... بەدڵنیای هەموو ئەوانە ناتوانن دروستبن، لەبەر ئەوەی باوەڕەکانی ئەوان جیاواز بوو. پێشکەشکاری بەرنامەکەش هەروەها ئەو خاڵەی بە دورستی هەست پێکردبوو وە بچکۆلەترین هەوڵی بۆ ناچار کردنی منداڵەکان بۆ وتـوێـژکـردن لەگەڵ یەک لەسەر باوەڕەکانی خۆیان نـەدەدا. لەوێدا تەنیا پرسیار دەکرا کە بڕوای ئەوان لەکوێوە هاتووە؟ لێرەدا تەنیا دەمەوێ بپرسم کە باوەڕکانی ئەوان لە کووێوەهاتوون؟ لە نەریتەوە، نەریت بەمانای یەک زنجیرە باوەڕ و بڕوایە کە دەست بەدەست و نەوە بۆ نەوە لە باوە گەورەکان و دایە گەورەکانەوە بۆ باوکان و دایکان و لەوانیشەوە بۆ ڕۆڵەکانیان دەگوازرێتەوە. وە ئەم کارە بۆ چەندین سەدە درێژەی کێشاوە. هەندێ جار ئەم کارە لە ڕێگەی کتێبەوە ئەنجام دەدرێ، تەنانەت هەندێجار باوەڕی نەریتی لەڕێگەی هیچوپوچیشەوە، دەست پێدەکات. ڕەنگە هەندێ بۆ یەکەمجار خۆیان داستانیان دروست کردبێ، وەک داستانی سور، خوای نورسی یا زئوس و... بەلام کاتێک ئەم داستانانە بۆ چەندین سەدە دەست بەدەست دەگوازرێنەوە، تەنها لەبەر ئەوەی ئەمانە بـاوەڕی کۆن و دێرینن، بە ڕوکـەش ئەیانکات بە شتێکی تایبەتی. کێشەی نەریت لەوەدایە هەرچەند باوەڕێکی کون و دێرین بێت، هێشتا هەر وەک هەمان دروستی و نادروستی ڕۆژگارەکانی سەرەتایە. ئەگەر تۆ داستانێکی نادروست بەرهەم بێنی، تێپەڕبوونی سەدان و هەزاران ساڵ بەهیچ شێوەیەک ئەو دروستر ناکات!

زۆرترین خەلکی ئینگلیز دوای کڵێسای ئینگلیزەکان کەوتوون، بەلام ئەمە تەنیا یەکێک لە بەشەکانی مەیسحیەتە، بەشگەلێکی تـری هـەیـە، وەک ئۆرسۆزۆکسی ڕوسـی، کاسۆلیکی ڕۆمی کلێسای متدیست. هەموو ئەوانە باوەرگەلێکی جیاواز لەیەکن، ئیسلام، یەهودی دیسان باوەڕگەلێکی جاوازترن دیسانەوە لـەوانـەش جـۆری جیا جیایان هەیە. هەندێکجار خەڵکانێک کە جیاوازگەلێکی بچوکیان لـەبـارەی بـاوەڕیـانـەوە هەیە، دەکـەونـە سەنگەر لەیەکگرتن و لەبەر ئەو پێکەوە نەگونجانە، شەڕ دەکەن. ڕەنگە پێت وابێ کە ئەوان هۆکارگەلێکی دروست و بەهێزیشیان هەبێ بۆ باوەرکانی خۆیان. بـەلام لە ڕاستیدا باوەڕەکانی ئـەوان بەتەواوی بەستراوەتەوە بە نەریتە جۆر بەجۆرەکانەوە. ئێستە لێگەڕێ بەشێوەیەکی تایبەت لەبارەی نەریتەوە قسەت بۆ بکەم. کاسۆلیکەکان لەو باوەڕدابوون خودی مریم دایکی عیسا ئەوەندە کەسێکی تایبەتی بووە کە هەرگیز بەمەرگی ئاسایی نەمردووە، بەڵکو لاشەی بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە. نەریتگەلێکی تری مەیسحی ئەوەیان بەلاوە پەسەند نیە و پێیان وایە کە مریەمیش وەک هەر کەسانێکی تری ئاسایی مـردوە. لە نەریتەکانی تری وەک کاسۆلیکدا بەو تینوتاوە ستایشێکی وای ناکەن وپێدا هەڵنادەن، بـەلام لەبەشەکانی تـری کاسۆلیکدا نـازنـاوی «شابانوی بەهەشت»ی پێ نەدراوە. ئەو نەریتەی پێیوایە مریم هەڵکشاوە بۆ ئاسمان زۆر کۆن نیە. لەخودی ئینجیلدا هیچ ئاماژەیەک بە شێوازی چۆنیەتی مەرگی ئەو نەکراوە، لەبنەڕەتدا بە دەگمەن لە ئینجیلدا ئاماژە بۆ ئەم ژنە بێچارەیە کراوە. ئەو

باوەڕەی کە مریەم  بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە، تەنها شەش سەدە دوای سەردەمی عیسا هاتۆتە گۆڕێ. لەسەرەتاوە ئەم داستانە بەهەمان شێوە دروستبوو کە داستانی «بەفری سپی» دروستکراوە. بەڵام بە تیپەڕبونی ساڵانێکی زۆر هێواش هێواش وەک نەریتێکی لێهاتووە و کەم کەم خەڵکی هەرچی زیاتر ئەمەیان بەهەند گرتووە. هەرچەندە نەریتێک دێرینتر بێت، خەڵکی زیاتر بەجدی وەریدەگرن. سەرئەنجام ئەم نەریتە لەم ساڵانەی دوایدا لە سالی ١٩٥٠دا وەک باوەڕێکی ڕەسمی کاسۆلیک ڕەسمەیەتی پێدراو پەسەندکرا. من لەوساتەدا نزیک بەهاوتەمەنی ئێستەی تۆ بووم. بەڵام ئەو داستانە بەهیچ شێوەیەک باشتر نەبوو لەوەی کە ٦٠٠ ساڵ پاش عیسا دروستکرابوو. لە کۆتای نامەکەدا دووبارە دەگەڕێمەوە بۆ باسی نەریت، بەڵام بەرلەوە ئاوڕێک لە دوو هۆکاری تری خراپ دەدەمــەوە لەبارەی باوەڕەوە کە ئۆتۆریتە و ئیلهامە. ئوتۆریتە وەک هۆکارێک بۆ باوەڕکردن، بەمانای باوەڕبوون بەشتێک لەبەرئەوەی کەسانێکی گرنگ ئەوەیان بەتۆ وتووە. لە کەنیسای کاسۆلیک پاپا وەک گرنگترین کەس ئەو ڕۆڵەی لە ئەستۆگرتووە، خەڵکی باوەڕیان وایە کە قسەکانی ئەو دروستە. تەنیا لەبەر ئەوەی کە پاپایە، لەیەکێک لە مەزهەبەکانی ئیسلامدا کەسێکی بەتەمەنی ڕیشدارە کە پێیدەڵێن ئایەتوڵا کە هەمان ڕۆڵ دەگێڕێت. زۆریک لە موسڵمانان لەم وڵاتانەدا لەوباوەڕەدان کە ئەگەر بڕیاری کوشتن لەلایەن ئەم ئایەتوڵاوە لە وڵاتیکی تر دەربچێت ئەوان ڕێگە پێدراون کە کەسانێک بکوژن.

کاتێک کە دەڵێن ساڵی ١٩٥٠ پێڕەوانی کڵێسای کاسۆلیک ناچاربوون ئەوە پەسەند بکەن کەجەستەی مریم هەڵکشاوە بۆ ئاسمان، مەبەستم ئەوەیە کە لەم ساڵەدا پاپا بەخەڵکی ووت دەبێت بڕوا بەوە بکەین، هەر بەو ئاسانیە پاپا ووتی دەبێ وابێت، کەواتە دەبێ دروست بێت ! ئێستا ڕەنگە هەندێک لە قسەکانی پاپا دروست بێت و هەندێکی نادرست. هیچ دەلیلێکی نیە مادام ئەو کە پاپایە بڕوا بە قسەکانی بکرێت زیاتر لەوەی کە هەر کەسکیتر دەیلێ. پاپا لە ساڵی ١٩٩٥دا فەرمانی بەپەیرەوانی خۆیدا کە منداڵ بوون بەرتەسک مەکەنەوە، ئەگەر خەڵکی بیانەوێ بە شێوەیەکی کوێرانە ئەم فەرمانەی پاپا پەسەند بکەن، ئاکامی ئەمە زۆربوونی خەڵک و برسیەتیەکی فـراوان، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، شەڕ، کێشە و گیروگرفتی زۆرتر بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ.
هەڵبەتە لە بواری زانستیشدا دیسان هەندێکجار هەموو بەڵگەنامەیەکمان نەدیوە و لە قسەکانی کەسانی تر بەهرەمەند دەبین، بۆ نموونە من بەچاوی خۆم نەمدیوە کە ڕوناکی بەخێرای سێ سەد هەزار کیلۆمەتر لە یەک چرکەدا جوڵە بکات. لەڕاستیدا من باوەڕم بەقسەی ئەو کتێبانە کردوە کە بەمن دەڵێن خێرایی ڕوناکی ئەوەندەیە. ئەمەش زۆر لە ئوتۆریتەی پێشتر ئەچێت، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر لە ئوتۆریتە باشترە. لەبەرئەوەی کەسانێک کە ئەم کتێبانەیان نووسیوە خۆیان لە بەڵگەنامەگەلێک سوودمەندبوون و هەر کەسانێکیش بیانەوێ دەتوانن چاوبگێڕن بەم بەڵگەنامانەدا و ئەوانە چەندین جار تاقی بکەنەوە. ئەمە بەڕاستی مایەی ئاسودەیە و پێشکەوتنەکانی زانست ئاسانتردەکەنەوە. بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەوە تەنانەت قەشەکانیش لافی ئەوە لێنادەن کە بەڵگە

و ئەرگۆمێنیتان بۆ هەڵکشانی مریەم بۆ ئاسمان هەیە.

سێهەمین هۆکاری خراپ بۆ باوەڕکردن، ئیلهامە، ئەگەر لەساڵی ١٩٥٠ پرسیار لە پاپا بکرایە کە چۆن بەو ئاکامە گەشتووە کە مریەم لە ئاسماندا ون بووە، ڕەنگە بیوتبایە کە ئەو ئیلهامی وەرگرتووە. ئەو دەرگای لەسەر خۆی داخستووە و لە ژورەکەی خۆیدا چەندین کاتژمێر بە تەنیا دانیشتووە و بۆ چاودێریکردن دوعـای کـردوە. لەگەڵ خۆیدا بیریکردوەتەوە و بیریکردوەتەوە، کەم کەم زووزوو لە دەرونـی خۆیدا دڵنیایی پەیداکردوە. کاتێک کەسانێکی مەزهەبی وەها هەستێکیان لە دەروندا هەیە کە دەکرێ شتێک بەبێ هیچ بەڵگە و بەڵگەنامەیەک ڕاست بێت، بەمە دەڵێن ئیلهام. تەنیا پاپا لافی وەحی و نێردراویەتی لێنەداوە، گەلێک لە خەڵکانی مەزهەبی ئەم کارە ئەنجام دەدەن. ئەمە یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی باوەڕەکانی ئەوانە. بەڵام ئایا ئەمە بەڕاستی هۆکاریکی دروستە؟ گریمان کە من بە تۆم ووت کە سەگەکەت مردووە، ڕەنگە زۆر ناڕەحەت بیت و بپرسیت: ئایا دڵنیایت؟ لەکوێ دەزانیت کە مردوە ؟ چی ڕوویداوە ؟ ئێستە بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەگەر من ووتم «ڕاستیەکەی من نازانم کە پۆپ مردوە ، هیچ بەڵگەو بەڵگەنامەیەکیشم نیە، تەنیا یەک هەستی دەرونی عەجیب و غەریب بەمن دەڵێ کە ئەو مردوە!» ڕەنگە لەبەر ئەوەی کەبەبێ هۆ ترساندمی لێم نیگەران بیت. لەبەرئەوەی کە دەزانی هەستێکی دەرونی، خۆبەخۆ هۆکارێکی باش نیە بۆ باوەڕکردن بە مەرگی سەگێک. تۆ گەواهی و بەڵگەنامەت دەوێ. هەموو یەک لەئێمە هەستی دەرونیمان هەیە، ئەم هەستە هەندێ جار دروستە و هەندێ جار نادروست , لەهەرحاڵدا ئینسانەکان جیاوازن هەستگەلێکی جیاوازیان هەیە؛ کەواتە چۆن دەزانین کە کامیان دروستە و کامیان دروست نیە؟ تەنیا ڕێگەیەک بۆ ئەوەی کە دڵنیابین کە سەگێک گیانی لەدەستداوە، ئەوەیە کە سەگەکە بە مردوی ببینین، یا بە گوێ گرتن لە هەناسەی تاقیبکەینەوە کە دڵی لەکار کەوتووە، یان کەسێک بەئێمە بڵێ کەخۆی سەگەکەی دیوە و بەڵگەی واقعی بۆ نیشاندانی مەرگی سەگەکە لەبەردەستدا بێت. هەندێجار کەسانێک دەڵێن دەبێ تەنیا پشت بە باوەڕکردنە دەرونیەکان ببەستین، ئەگینا چۆن دەزانی کە «ژنەکەت تۆی خۆشدەوێت»، بەڵام ئەم بەڵگەیە هەڵەیە. دەکرێ بەڵگەگەلێکی زۆر لە گۆڕدا هەبێ بۆ ئـەوەی کە کەسێک تۆی خۆش بووێ. کاتێک کەسێ پەیوەندی بەتۆوە هەیە، هێماگەلێکی بچوک بچوک بەدرێژای ڕۆژ دەتوانیت ببینیتەوە، هەموو ئەوانە پێکەوە گرێدەدرێت، ئەمە یەک هەستی بەتەواوی دەرونی لەچەشنی ئیلهامی قەشەکان نیە، بەڵگەی دەرەکیش بۆ ئەم هەستە دەرونیە هەیە. شێوەی نیگاکردن، ئـاوازی دەنگ، گرنگیپێدان و میهرەبانی هەموو ئەمانە بەڵگەی واقعین.

هەندێکجار کەسانێک هەستێکی گەورەی دەرونیان هەیە کە کەسێک ئەوانی خـۆشـدەوێ، لەکاتێدا هیچ بەڵگە بۆ ئەمە لە گۆڕدا نیە. لەم حاڵەتەدا ئەوەی کە ئیمکانی هەیە بەهەڵەدا چون ئەگەرێکی زۆر زیاترە. هەندێک هەستێکی گەورەیان هەیە کە

یاریکەرێکی ناودار عاشقی ئەوان بووە. لەکاتێکدا کە ئەو یاریکەرە تەنانەت ئەوانیشی نەدیووە، هزری ئەو کەسانە نەخۆشە، هەستە دەرونیەکان دەبێ لە لایەن بەڵگە و ئەرگۆمینتە دەرکیەکانیشەوە پشتڕاستکرێنەوە، ئەگینا ناتوانین لێیان دڵنیابین. هەستی دەرونی لە زانستیشدا بەنرخە، بەڵام تەنیا بۆ دروستکردنی ئایدیا، تاکو ئەو ئایدیانە بۆ بوونی بەڵگە تاقی بکەیتەوە. زانایەک دەتوانی دەرکێکی تـەواو دروستی هەبێت و ئایدیایەکی زۆر باشی بەبیردابێت. ئەمە بەتەنیا هۆکارێکی باش نیە بۆ باوەڕکردن، بەڵام دەتوانێت هۆکارێکی باش بێت بۆ کات پێ بەخشین بۆ تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوە.

زاناکان هەمیشە بۆ هەستکرن و ئایدیا پەیداکردن لە هەستی دەرونـی بەهرەمەند دەبـن، بەڵام ئەو هەست و پێشبینیکردنانە تا بە بەڵگە و بەڵگەنامە نەسەلمێنرێت بەهایەکی ئەوتۆی نیە. ووتـم کە دەگەڕێینەوە بۆ باسی نەریت، ئەمجارەیان لە ڕوانگەیەکی ترەوە تاوتۆی دەکەین، دەمەوێ هەوڵ بدەم تا گرنگی نەریتتان بۆ ڕوون بکەمەوە. هەموو ئاژەڵەکان بەهۆی گـەڕان وپشکنین بەناو ڕەوتی گۆڕان و گەشەسەندندا بەجۆرێک پێکهاتوون، تا لە دۆخی ژینگەیەکی ئاسایدا ژیان بەسەر بەرن و بمێننەوە. شێرەکان بۆ زیندومانەوە لە دەشتەکاندان دروست بوون، قرژانگە دڕکدارەکان بۆ زیندو مانەوە لە ئاوی شیریندا ژیان بەسەردەبەن، لەکاتێکدا کە قرژانگی دەریای لە ئاوی سوێردا ژیان بەسەر دەبەن. ئینسانەکانیش دیسان جۆرێک لە جانەوەرن کە بۆ زیندومانەوە لەجیهانێکی پڕ لە... ئینسانیتردا دروستکراون. ئێمە وەک شێر و قرژاڵەکان خۆمان ڕاوی خواردنی خۆمان ناکەین، بەڵکو ئێمە خواردن لە کەسانیتر دەکڕین، کە ئەوانیش لەکەسانیتر کڕیویانە. ئێمە لە دەریای ئینسانەکاندا مەلە دەکەین، دروست وەک ماسی دەریاکان بۆ مانەوەمان پێویستی بەئاوە، ئینسانەکانیش بەهەمان شێوە بەهۆی مێشکیانەوە دەتوانن پەیوەندیان پێکەوە هەبێ، هەمان ئاوی دەریا کە سوێرە، دەریای ئینسانەکانیش پڕیەتی لە شتگەلێکی دژوار و سەخت کە دەبێت فێربین وەک زمان. تۆ بە ئینگلیزی قسەدەکەیت، بەڵام دۆستەکەت (ئان کاترین) بە ئەڵمانی قسە دەکات. هەرکام لە ئێوە بە زمانێک قسە دەکەن کە گونجاو بێت لەگەڵ مەلەکردنی دەریای ئینسانی پەیوەندیەکانی ئێوە. زمان هەروەها بە هۆی نەریتەوە دەگوازرێتەوە، هیچ ڕێگەیەکی تری نیە. لە ئینگلیزیدا پپیک (بەخشین)ە لەکاتیکدا لەئەلمان «ئین هوند»ە. هیچکام لەم دوو وشەیە دروسترنیە لەویتر. ئەم وشانە لە سەردەمانی ڕابردووەوە بۆ ئێمە گواستراونەتەوە. منداڵان بۆ ئەوەی بتوانن لە دەریای ئینسانی خۆیاندا مەلە بکەن، دەبێ زمانی وڵاتەکەی خۆیان و گەلێک شتیتر لەبارەی خەڵکی وڵاتەکەی خۆیانەوە فێربن. دروست هەروەک کاغەز وشکەرەوە، منداڵان دەبێ گەنجینەیەکی گەلێ فراوان لە زانیاری نەریتی پەلکێشکەن. لەبیرتبێت کەزانیاری نەریتی هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە دایک و باوک و سەرپەرشتکارانەوە بە منداڵان دەگات. مێشکی منداڵ دەبێ هەموو ئەو زانیاریانە وەرگرێ. هەڵبەتە ناکرێ چاوەڕوانی ئەوە لە منداڵ بکەین تا لەنیوان زانیاری باش وەک لە وشەکانی یەک زمان و زانیاری خراپ و ئەهمەقانەی نەریت

لەچەشنی سیحر و جاد و شەیتان، جیاوازی بکات. چونکە منداڵان دەبێ ڕاکێشەری زانیاری نەریتی بن، هەروەک چۆن هەرشتێک گەورەساڵان بەوان بڵێ چ دروست و چ نادروست - باوەڕدەکەن. زیاتر ئەو شتانەی کە کەسانی بالغ بە منداڵی دەڵێن دروست و لەسەر ئەساسی بەڵگەیە؛ یان لایەنی کەم بە ڕێژەیەک پەسەندترە. بەلام ئەگەر هەندێ لەوانە نادروست بێ، بێئەقلانەوە و تەنانەت شەڕانیانە بێت، هیچ شتێک ڕێگری لە باوەڕپێکردنی منداڵ ناگرێ. ئێستە کاتێک کە ئەو منداڵە گەورە دەبێ چی دەکات؟ دروست هەمان زانیاری نادروست دەگوازێتەوە بۆ منداڵانی نەوی پاش خۆی. کەواتە کاتێک کە شتێکی هەڵە و بێ بەڵگە بۆ یەک جار باوەڕی پێدەکەیت، ئیتر شتێک ڕێگری لێناکات و دەتوانێ بۆ هەمیشە بەردەوام بێت.

ئایا هەمان دۆخ لەبارەی ئاینەکانیشەوە ناچێتە پێشەوە؟ باوەڕکردن بەوەی خوا یان چەند خوایەک هەیە، باوەڕکردن بە بەهەشت، باوەڕکردن بەوەی کە مریەم هەرگیز نەمردوە، یا عیسا باوکی ئینسانی نەبووە، باوەڕ بەوەی کە دوعاکان گیرادەبن. باوەڕ بە گۆڕینی شەراب بۆ خوێن و... هیچ کام لەم باوەڕانە بەهۆی گەواهی و بەڵگەنامەوە پشگیرییان لێناکرێ، بەهەرحاڵ ملیۆنەها ئینسان باوەڕیان بەوانە هەیە. ڕەنگە بەوهۆیەوە بووبێ کە ئەم مەسەلانە، کات و سەردەمانێک بەوان وتراوە کە ئەوەند بچوک بوون کەهەر شتێکیان پێ بووترایە باوەڕیان دەکرد. ملیۆنەها ئینسان ئیتر باوەڕیان بە شتگەلێکی بەتەواوی جیاواز هەیە، لەبەر ئەوەی بە منداڵی شتگەلێکی جیاوازیان پێ وتراوە و فێرکراون.

بە منداڵانی موسڵمان شتگەلێکی جیاواز، منداڵانی مەسیحیەکان بە شتگەلێکی تر بارهێناوە، هەر کامێکیان بەو قەناعەتە گەشتوون کە باوەڕی ئەوان دروستە و باوەڕی ئەوانیتر نادروستە. تەنانەت لە نێو مەسیحیەتدا، کاسۆلیکە ڕۆمیەکان باوەڕی جیاوازیان هەیە لە کڵێساکانی ئینگلیس یا کڵێساکانی ئەسقەفی، .... هەرکامیان دڵنیان لەوەی کە خۆیان ڕاستن و ئەوانتر نادروست. ئەوان بەشتگەلێکی جیاواز باوەڕیان هەیە، دروست بەو هۆیەوە کە تۆ ئینگلیزی قسە دەکەی و ئان کاترین بە ئەڵمانی. بەو جیاوازیەوە کە هەر زمانێک لە وڵاتی خۆیدا زمانێکی دروستە. بەڵام دینەکان ناتوانن لە وڵاتیکدا دروست و لە وڵاتێکی تردا نادروست بن؛ لەبەر ئەوەی کە باوەڕەکان بە تەواوی جیاوازن. مریەم ناتوانێ لە ئیرلەندی کاسۆلیکی زیندوبێت و بەلام لە ئیرلەندی باکوری پرۆتستانتی مردو بێت.

لەبارەی ئەم قسانەوە دەتوانین چ کارگەلێک بکەین؟ هەڵبەتە لە تەمەنی تۆدا کارگەلێکی زۆر لە دەست نایەت، بەلام دەتوانی ئەم شێوەیە تاقی بکەیتەوە؛ جارێ ئەگەر کەسێک شتێکی گرنگی پێ ووتی، لەگەڵ خۆتا بیرکەرەوە: ئایا ئەمە لەو شتانەیە کەخەڵکی بە بەڵگەوە بڕوا دەکەن؟ یا لەو شتانەیە کە بەخاتری نەریت، ئۆتۆریتە، و ئیلهام باوەڕیان کردوە؟ ئەگەر نەیانتوانی وەڵامێکی باشت بدەنەوە، هیوادارم بەرلە باوەڕکردن بە یەک قسە لە ووشەکانی، باش بیرلێبکەیتەوە.

بابە خۆشی ئەوێیت

سەرچاوە: WWW. iran-tribyne.com

# بەشی هەشتەم لە کتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

## Resiste

## ڕاسیست

سـازدانـی: نیـنـار

و. لـه سـویدییـەوە: هیـوا قـادر

**نینار:** تۆ پێتوانییە داپۆشینی بەشێک لە دەموچاوی ژنانی موسڵمان پەیوەندی بە نەریتی بۆماوەی ڕۆمەکانەوە هەبێت؟ کاتی خۆی لە میستێرڤیلان لە پۆمپایی شتێک هەبووە سەرنجی خەڵکێکی زۆری ڕاکێشاوە، ئەویش لە ڕاستیدا "فالۆس ـ کێرێکی" زۆر گەورەبووە. پێیان وتووە "فاسنیوس" و هەمیشەش بە قوماشێکی ڕەش داپۆشراوە بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت. "پاسکال کیوگنەرد" لە کتێبەکەی خۆیدا "سێکس و تیرۆر" خوێندنەوەیەکی باشی بۆ ئەم دیاردە سەیرە کردووە. ئەو ئەڵێت: "غەیبانییەت کاتێک برەو ئەستێنێت کە


ئەدۆنیس

**بیرمەندان و شاعیران ئەیانەوێت ئازادبن لە هەموو یاسا و ڕێسایەك، لەبەر ئەوەیە بەتایبەتی حەزیان لەو شتانەیە کە حەرام و قەدەغەکراوە. سەرپێچیکردن نیشانەیەکە بۆ ئازادبوون و دژایەتیکردنی ئەو یاسا دینیانەی کە لەبەرامبەردا وەستاون.**

ترس و فاسنیوس لەگەڵ یەکتریدا ئاوێتە ئەبن". ئـەوەش لە بوونی فاسنیوسەوەیە کە وائەکات فاسنیوسییەت گەشەبکات. فاسنیۆس خراوەتە ناو چەقی ئەو بیروباوەڕە بە پیرۆزکراوەوە و بە پەڕۆیەکی ڕەش داپۆشراوە. لەم بیروباوەڕە دینییەدا ترس وابەستەکراوە بەو ئـازارەوەی کە ئاوێتەیە بە هەستی دەسەڵاتدارێتی.

سـەرپـۆش نـەدان بـەسـەردا لـەلایـەن ئافرەتانەوە سمبولێکی گەورەیە، "ئایا ئەبێت ئافرەتان سەریان داپۆشن بۆ ئەوەی جۆرێک لە تامەزرۆیی دروستبکەن؟" ئەمە بۆ خۆی دیاردەیەکی بە پیرۆزکردنیشی تیادایە، چونکە تەنها خودایە کە سیمای خۆی هەرگیز پیشان نـادات. تەنها خاڵێکی پۆزەتیڤ لە لەچک کردنی ئافرەتاندا هەبێت لەوەدایە کە خودی ئافرەت ئەبێتە کەسێکی پیرۆزی ئەوتۆ کە سەرنجی پیاوان بەلای خۆیدا ڕائەکێشێت و ئەبێت بە سەرچاوەیەکی فەنتازیا بۆ سێکس.

ئەدۆنیس: ئەمە ڕاستە. جارێکیان لە ئەوروپا بەهەندێک لە هاوڕێکانم وت: "نابێت سەرتان لەوە بسوڕمێت کاتێک کە خانمێکی لەچک بەسەر ئەبینن، تەنانەت نابێت سەرتان لەوەش بسوڕمێت کە ئەوە پیاوانن داوا لە خانمان ئەکەن سەر و سیمای خۆیان داپۆشن. چونکە تەنها سیمایەک کە بتوانێت کێبەرکێ لەگەڵ سیمای خودادا بکات خانمانن. هەر لەبەرئەمەشە کە پیاوان سەرو سیمای خانمان دائەپۆشن.

**نینار:** ڕاستە، من لەمە تێئەگەم و لەگەڵتام، بەڵام

بۆچی ئەبێت دینە تاکخواییەکان هێندە لەگەڵ ئافرەتاندا توندبن؟ ئایە ئەمە تەنها ڕەنگدانەوەیەکی ناو کۆمەڵگایە؟ یاخود بەهۆی هۆکاری ترەوەیە؟

ئەدۆنیس: ئەمە "نەریت"ێکە پشتی بە خوێندنەوەیەکی سیاسیانەی قورئان بەستووە، دیارە ئەمەش بۆخۆی هەڵەیە.

**نینار:** بەڵام بۆچی؟ بۆ ئەبێت لە هەموو دینەکاندا وابێت! لە دینی جولەکەدا بۆ نموونە ئەرسەدۆکسەکان لە کاتی نوێژی بەیانیاندا ئەڵێن: "خوایە گیان من سوپاسی تۆ ئەکەم کە بە ژن خەلقت نەکردووم". من ئەمەم لە فیلمی "کادۆش"ی ئامۆس گیتایدا گوێ لێ بووە، کە باس لە ژیانی تایبەتی و کۆمەڵایەتی قوتابییەکی ئایینناس ئەکات، کە چۆن لەگەڵ ژنەکەیدا ئەژی و بە چ چاوێکەوە سەیری ئەکات. هەڵوێستی ئەو پیاوە زۆر توند و کورت بینانەیە. دیارە بە دڵنیاییەوە دڵڕەقی و بەسوک سەیرکردنی ئافرەتان لای موسوڵمانانیش هەیە.

ئەدۆنیس: ئەم بەسوک سەیرکردنە لای موسڵمانان تەنها لە ئاستی شەریعەدا هەیە. بەو پێیەی پیاوی موسڵمان هەقی تەواوی لەزەتبردنی هەیە. پیاوێک ئەتوانێت چوار ژن یان پێنج یان شەش بهێنێت. بەهۆی ئەم لەزەتبردنە جەستەییەوە ئیسلام وەک بونێک بۆ لەزەتبردن و چێژلێبینین سەیری ئافرەتان ئەکات. پیاوێکی موسڵمان لە پێناو لەزەتبردنی خۆیدا هەقی ئەوەی هەیە چۆنی بوێت ئاوا دەسەڵاتی جەستەیی خۆی بەسەر ژندا بسەپێنێت.

**نینار:** بەڵام لێرەدا تەنها هەر پیاوە ئەیەوێت لەزەتەکان بۆ خۆی قۆرخبکات. ئەمەش تەنها هەر بۆ لەزەتبردنی خۆیەتی!

ئەدۆنیس: وایە ئەمە ڕاستە. هەر بۆ پیاوە.

**نینار:** ئەی سەبارەت بە زۆرەملێکردن ئەڵێی چی؟ هەموو لەزەتبردنەکان لێرەدا تەنها هەر بۆ پیاوانە نەک ژنان؟

ئەدۆنیس: بەڵام پێش ئیسلام ئافرەت وەک ئەوەی خۆی ئارەزووی کردووە ئازادانە بڕیاری جیابوونەوە و شووکردنی داوە. هیچ کەسێکیش ڕەخنەی لە ئارەزووەکانی نەگرتووە و دەستی نەخستۆتە کارەکانییەوە.

**نینار:** ڕاستە، پێش ئیسلام وابووە، بەڵام من قسەم لەسەر دینە تاکخواییەکانە. بۆ ئەبێت ئافرەتان بچەوسێننەوە؟

ئەدۆنیس: لەبەرئەوەی ئەم دینانە باوکسالارن! باوکێک لە جێگای خودایە و ئافرەتیش ئەبێت گوێڕایەڵی بێت و دوای بکەوێت، بەتایبەتیش ئەگەر هات و ئافرەت لەڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆ نەبێت. ئەوکات ئەبێت بە بەشتێک لە شتەکانی پیاو. ئەمەش بۆخۆی زۆر دژەگوتن ئەهێنێتە ئاراوە. بۆ نموونە ئەوترێت ئافرەتان "پاک نین" و بەشێوەیەکی تایبەتیش وا سەیرئەکرێن. باشە، بەڵام ئەگەر هات و ئافرەتان بوونەوەرێکی پیسبن ئەی چۆن ئەم بوونەوەرە پیسە توانیوێتی ئەو پیاوانەی وەک مەسیح و موحەمەد پێغەمبەر بخاتەوە. باشە گەروایە

ئەو چۆن ئەتوانێت ئەم پیاوە باشانە بهێنێتە ناو دنیاوە؟ لەلایەکەوە پێی ئەوترێت پیس و لەلایەکی تریشەوە پێغەمبەران و پیاو چاکان ئەخاتەوە. ئێمە کەوتوینەتە بەردەم ئەم دژە گوتنانەوە و تەنانەت لەبەردەم چەندان قسەی پڕوپوچی تریشداین.

**نینار:** بەڵام لە ڕاستیدا موحەمەدی پێغەمبەر کەسێکی ئاسایی بوو تا ئەوکاتەی هەڵبژێردرا و وەحی بۆهاتووە. هەروەها دایکی پێغەمبەریش وەک هەر ئافرەتێکی ئاسایی تر وابووە. ئەوە خودا بووە کە پێغەمبەری هەڵبژاردووە.

ئەدۆنیس: ڕاستە، وەها ئەوترێت و ئینسانیش باوەڕ بەمە ئەکات.

مەبەستم ئەوەیە بڵێم لەو کاتەی کۆمەڵگادا دینە تاکخوداییەکان گۆڕانکار و شۆڕشگێڕبوون. دینە تاکخوداییەکان هۆشیاربوون چونکە لەبری ئەوەی لەشکر کۆبکەنەوە و سوپایەک بۆ کوشتن و بڕین پێکبهێنن بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگابکەن، هاتن کەرەستەی ئایدۆلۆژییان بەکارهێنا. بەم شێوەیە هەموو دینە تاکخواییەکان دژ بە نوێکردنەوە و داهێنان وەستانەوە. هیچ دینێکی تاکخوایی نەیتوانیوە لە ڕووی هونەریی و تەنانەت فەلسەفی و شیعرەوە بگات ئاستی سۆمەری و بابلی و یۆنانی کۆن و فیرعەونەکانی میسر. ئەمە ئەوە پیشان ئەدات کە ئەم دینانە ئەزمونێکی قوڵیان نەبووە تا لەسەری بڕۆن بەڵکە هەر زوو بوون بە سیاسەت و پڕۆژەیەک بۆ دەستبەسەراگرتن.

**نینار:** باشە بۆچی ئەبێت ئافرەت گەرەنتی شەرەفی خێزان بێت؟ یەکەم شتێک کە کچ ئەبێت بیکات پاراستنی کچ بوونی خۆیەتی، سەرباری ئەوەش ئەبێت شوو بە پیاوێکی باش بکات. بۆچی نابێت پیاو هیچ بەرپرسیارییەکی لەم چەشنەی لەسەر شان بێت؟ بۆچی ئەبێت هەر ئافرەت بکەوێتە ژێر ئەم بارەوە و هەموو بەرپرسیارییەک لەسەر شانی ئەوبێت؟ ئایە هۆی ئەوەیە کە پیاو توانای ئەم بەرپرسیاریەتییەی نییە بیخاتە سەر شانی؟

ئەدۆنیس: نەخێر، لەبەرئەوەی پیاو لەبەرەی دەسەڵاتدارانە. بۆیە هیچ کەسێک داوای هیچ شتێک لەو ناکات. ژن پلەیەکە لەناو ئەو هەرەمەدا. باسکردن و هێنانەکایەی ئافرەتێک پەیوەندی بە هەموو خێزانەکەوە هەیە. هێنانەکایەی ئافرەت شتێکە کە قەدەغەیە بهێنرێتە کایەوە. ئەم سەرپێچیکردنە لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا قەدەغەیە. ئافرەت گەرەنتی میراتییە لەهەمان کاتیشدا وەک نەزانێک سەیرئەکرێت. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا گرنگە کە بزانرێت کێ باوکی منداڵە. بۆیە خیانەتکردن قەدەغەیە. کاتێک منداڵێک لەدایک ئەبێت، چ میراتییەکی بۆ ئەمێنێتەوە؟ هەموو ئەمە پرسیارێکی ئاڵۆزی ئابووریی لە پشتەوەیە. بۆیە شاعیرێکی وەکو ئەبو نەواس ئەنووسێت: "انیفت نفسی العزیزە ان تقنعە الا بکل شیئ حرام". بەسادەیی واتاکەی ئەوەیە کە ئەڵێت: "نەفسی من هەمیشە مەیلی بەلای حەرامدا ئەچێت".

بیرمەندان و شاعیران ئەیانەوێت ئازادبن لە هەموو یاسا و ڕێسایەک، لەبەر ئەوەیە بەتایبەتی حەزیان لەو شتانەیە کە حەرام و قەدەغەکراوە. سەرپێچیکردن نیشانەیەکە بۆ ئازادبوون و دژایەتیکردنی ئەو یاسا دینیانەی کە لەبەرامبەردا وەستاون.

**نینار:** من بیر لە هۆیەکی تر ئەکەمەوە: من پێموانییە ئەمە ئەو هۆکارەبێت کە وای لە خێزانی خۆرهەڵاتی کردووە هێندە وابەستەی یەکتربن. بەجۆرێک لە ڕووی جەستەییەوە ئەبنە خاوەنی یەکتریی و منداڵیش ئەبێتە موڵکی دایک و باوک. ئەگەر هات و کچێکی گەنج "کونبکرێت" لەلایەن خۆشەویستەکەیەوە کەسەر بەو خێزان و بنەماڵەیە نییە کە ئەبوایە شووی پێبکردایە، ئەوا ئەمە وەک "کونکردنی" باوکی کچەکە لێک ئەدرێتەوە. ئەندامانی خێزان ئەوەندە لە ڕووی جەستەییەوە لەیەکتری نزیکن، کە وائەکات سەرتاپای خێزانەکە، بە باوک و دایکیەوە هەستبکەن کە هەموویان بەجارێ "کونکراون".

ئەدۆنیس: وایە، ئەکرێت بە دەستدرێژییەک لێکبدرێتەوە دژ بە هەموو خێزانەکە. دەستدرێژی بۆ سەر کچەکەیان پەلامارێکە بۆ سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەیان.

**نینار:** وایە، ئەمەش هۆی ئەو نزیکایەتیەیانە لەیەکتری. بەڵام کاتێک کچێک لەگەڵ پیاوێکدا ڕابوێرێت کە خۆشی ئەوێت ئەوا ئەوە بەیەک گەیشتنە نەک دەستدرێژیکردن. بەڵام ئەگەر ئەمە پەیوەندی بە لاقەکردنی کچەکەوەبێت ئەمایان شتێکی ترە.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر

**نینار:** دەستپێبکەینەوە؟

ئەدۆنیس: سەرچاوان! با دەستپێبکەینەوە.

**نینار:** ئایە لە ڕاستیدا بۆچی ئینسان پێویستی بە بیرۆکەی خودا هەیە؟ دیارە مەبەستم خودای دینە تاکخوایەکانە؟ بۆچی ئینسان ئینسانێکی تر بە "خودا"ی خۆی هەڵنابژێرێت؟ کەسێک کە خۆی زۆر خۆشیبوێت و وەک ئەوەی کە ئەوترێت خودایانەبێت؟ بەهەرحاڵێک من کەسێکی وەهام هەیە، یاخود لایەنی کەم حەزئەکەم ئەوکەسەی خۆشمئەوێت وەهابێت. کاتێک من پیاوێکم خۆشئەوێت بەهوشیارییەوە وەک خودایەک سەیری ئەکەم. کاتێکیش لەیەکتری جیائەبینەوە زۆر قورس و ناخۆشە، ئیتر وایە عەشقی ژیان وات لێ ئەکات جارێکی تر عاشق بیتەوە و ئەو کەسەش وەک خودا سەیربکەیت. ئێمەی خانمان وەک خوداوەندێک لەبەردەم خۆشەویستەکانماندا خۆمان نابینین؟ ئایە پێتوایە ئەم قسەیەی من ئەیکەم منداڵانەبێت؟ یاخود هێشتا شتێکی گەنجانەم تیاداماوە کە نامەوێت دەستبەرداربیم؟

ئەدۆنیس: ئینسان "بیرۆکەی خودا"ی بۆیە هێناوەتە ئاراوە تا لەگەڵ پەنهانبوونی دنیا و کێشەی مردندا ڕێکی بخات. ئەم بیرۆکەیە زۆر کۆنە و پێش سەردەمی دینە تاکخواییەکان هەبووە. بەڵام بیرۆکەکە بەکۆمەڵێک شێوازی جیاواز لەلایەن کۆمەڵێک خەڵکی جیاواز و لە کۆمەڵێک قۆناغی

مێژوویدا پەرەی پێدراوە و ئامادەکراوە. بیرۆکەی خودا لای دینە تاکخوابییەکان دواهەمین بیرۆکەی پەرەپێدراوە. ئەوەتا ئێستا تەنها خودایەک هەیە لەبری هەموو ئەو خوادایانەی پێشوو کە هەبوون.
هەروەها خودا بیرۆکەیەکی ڕێزلێگیراوی ئەوتۆیە کە یارمەتی ئینسانەکان ئەدات لەبەرامبەر ئەو ترسەی کە لە نادیار هەیانە: مەبەستم نادیاریی دوای مردنە ـ بەوەی کە ئینسان باوەڕی بەدنیایەکی ترە دوای مردن. ئایە ئەبێت ئەوە چ جۆرە ژیانێکی تربێت؟
هەندێک باوەڕیان بەچوونە بەرەی خودا و بەهەشت هەیە دوای مردن. بەڵام زۆر کەسی تریش بە هیچ جۆرێک باوەڕی بە خودا نییە. باوەڕیان وایە کە ئینسان بەشێکە لە سروشت، یەکێکە لەو بوونەوەرە زیندووانەی سەر زەوی، دوای مردنیش تێکەڵ بەسروشت ئەبێت و ئەبێتە خۆڵ. بێ لەوەش پێیان وایە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە مردنی ئینسانەوە هەیە هەمووی پەیوەندی بە ترسی ئینسانەوەیە لە مردن، ئەم قەناعەتەش ڕێزی لێ ئەگیرێت و ئەتوانرێت تێیبگەیت. ئەمە بۆخۆی مەسەلەیەک نییە ئینسان بتوانێت لە چوارچێوەی لۆژیک و عەقڵدا مامەڵەی لەگەڵدابکات. ئینسان ناتوانێت ڕەخنە لەباوەڕبوون بە خودا بە پێوەری عەقڵی بگرێت، چونکە ئەمە پەیوەندی بە دڵ و هەست و ڕۆحی ئینسان و لاوازییەکانی و ئەو ترسەوە هەیە کە لەبەرامبەر بیرکردنەوە لە مردن هەیەتی. ئینسان ئەتوانێت ڕێز لە باوەڕبوون بە خودا نەگرێت، تۆ ناتوانیت ئەمە توڕبدەیت و ڕەخنەی لێبگریت گەرهاتوو تۆ ڕێزت بۆ ترسی خەڵکی و ناچاربوونی دانەنابێت ـ گەر تۆ حورمەتی ئەوەی بەرامبەر بگریت ئەبێت وابکەیت. تەنها شتێک کە ئینسان ئەتوانێت بیکات ئەوەیە کە لەبەرامبەر ئەو جۆرە باوەڕانەدا هەڵوێست وەربگریت، ئەبێت ڕێ بەخۆت نەدەیت بەشداری بکەیت. ئینسان ئەتوانێت باوەڕی بەهەر شتێک هەبێت کە ئەیەوێت، بۆ نموونە باوەڕت بە ئینسان هەبێت.

**نینار:** ئایە چ شتێک پێویست ئەکات بکرێت بۆئەوەی ئینسان وەک خودایەک سەیری ئینسانێکی تر بکات؟

ئەدۆنیس: من ئەمویست ئێستا باس لەوە بکەم. ئینسان هەبووە هەوڵی لەم جۆرەی هەبووە و کردوشیەتی، تەنانەت لەناو ئیسلامیشدا ئەمە هەبووە، وەک خودا سەیری هەندێک لە ئینسانەکانیان کردووە. باوەڕیان پێ هێناون و لەگەڵ پەیوەندییەکانی خۆیاندا گونجاندوویانە. بەڵام ئەو ئینسانانە خودا نەبوون، بەڵکە هاتوون ئەو نادیارییانەیان لەبەردەمی خەڵکیدا سەرلەنوێ پیشانداوەتەوە، ئەو نادیارانەی کە ناتوانرێت هەستیان پێبکرێت لەڕێگەی غەیبەوە نەبێت. خەڵکیش هەبووە خودای لە ناو گوڵێک، خونچەیەک، ڕووبارێک، شاخێکدا بینیوە، وەک ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە چەندان خودا هەبووە. هەندێک کەسیش هەن ئینسانیان بەشێوەیەکی ئەوەندە پیرۆز سەیرکردووە کە دواتر وەک خودایەک

سەیریان کردووە.

**نینار:** تۆ مەبەستت پێغەمبەرەکانە؟

ئەدۆنیس: نەخێر، پێغەمبەرەکان بەبێ دینە تاکخواییەکان بوونیان نەدەبوو.

**نینار:** وایە، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەو ئینسانانانە کامانەن کە یارمەتی کەسانی تریان داوە تا لە شتە نادیارەکان بگەن؟ لەڕاستیشدا من ئەو ئینسانانەم زۆر خۆشئەوێت کە خودا لە گوڵێک، ڕووبارێک یان شاخێکدا ئەبینن. ئەوانە خەڵکانێکی مەزنن.

ئەدۆنیس: نازانم ئینسان هەقی ئەوەی هەیە وابڵێم یان نا، چونکە بەتایبەتی زۆرینەی موسڵمانان وەک بێ دین و خیانەتکار و ساویلکە سەیری ئەو کەسانە ئەکەن. ئەمەش کارێکی کردووە کە ڕاوەدونـان و چەوساندنەوەی ئەو جۆرە کەسانە زۆر ئاسانبێت. بۆیە ئەبێت ئینسان ڕێز لە موسڵمانەکان بگرێت و بەو جۆرە قسەیان لەگەڵدا نەکات.

**نینار:** مەبەستت چیە کە دەڵێیت "ئینسان هەقی ئەوەی هەیە وابڵێم یان نا"؟

ئەدۆنیس: زەحمەتە باس لەمە بکەیت. خەڵکی واهەن پێیانوایە کە خودا چۆتە ناو عەلییەوە و لە ڕێگەی ئـەوەوە خۆیی پیشانداون. بەڵام بۆ ئـەوەی هیچ تێگەیشتنێکی هەڵە لێرەدا دروستنەبێت ئەمەوێت هێما بۆ ئەوە بکەم کە ئینسانێک لەدایکبووبێت و نەخۆشکەوتبێت و نانیخواردبێت و مردبێت ناکرێت وەک خودا سەیربکرێت. بۆ ئەوەی تۆ وێنەیەکی تەواوی خودا لە ئینسانێکدا دروستبکەیت ئەبێت ئەو ئینسانە قابیلی مردن نەبێت. بۆیە ئەو گروپانە پێیانوایە خودا هاتۆتە ناو عەلییەوە نەک خۆی خودابێت. بەڵام موسڵمانە ئیماندارەکانی تر ئەم بیرۆکەیە ڕەتئەکەنەوە و پێیانوایە ئینسان ئەکرێت لەڕێگای خوداوە وەحی بۆ بێتەخوارەوە، بۆ نموونە سۆفییەکان. لەڕاستیدا ئەمەش لە وەسەنییەکانەوە ماوەتەوە کە باوەڕیان بە فرە خودایی هەبووە ـ لەم ڕوانگەیەوە ئەو تێگەیشتنە سەبارەت بەخوداکردنی ئینسان بۆ ئینسان دروستبووە.

**نینار:** باشە، بۆچی قورئان وەرناگێڕنە سەر هەموو زمانەکان؟

ئەدۆنیس: قورئان بۆ زۆر زمان وەرگێڕاوە. بۆ نمونە بۆ سەر زمانی ئەندەنوسی، ئۆردو، تورکی. بەڵام ئەوەی کە بیەوێت خوێندنەوەیەک لە قورئاندا بکات دەبێت ئەم زمانە بزانێت. ئەوانەشی کە خۆیان فێری عەرەبی دەکەن زۆرینەیان دینداریەکانن. ئەوان پێیانوایە کە پەیوەندی نێوان زمانی عەرەبی و قورئان پەیوەندییەکی تایبەتە. ئەوانە حەزدەکەن چۆن قورئان لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەر دابەزیوە هەرئاواش بیخوێننەوە، ئەیانەوێت لەو ڕێگەیەوە بڵێن کە عەرەبی زمانێکی ڕەسەنە. هەروەها باوەڕیشیان وایە نابنە خاوەنی ئیمانێکی تەواو گەر هات و قورئان بە زمانی عەرەبی نەخوێننەوە کە زمانێکە قورئانی لە ڕێگەیەوە پێ دابەزیوە.

**نینار:** ئیسلامییەکان بانگەشەی ئـەوە دەکـەن کە قورئان دۆخی ئافرەتانی بەرەو باشی بردووە

چونکە پێش ئەوان کچە مەلۆتکەکانیان زیندەبەچاڵ کـردووە، ئایە ئەمە وابـووە؟ لەهەمان کاتیشدا من هەمیشە پرسیومە گەر وابووبێت ئەی چۆن شاعیرە جاهلییەکان ئەو هەموو شیعرە جوانەیان لەسەر عەشق و ئافرەت نووسیوە، ڕازیشبوون لە کۆمەڵگایەکی وادا بژین کە دڕندەترین تاوانی لەو چەشنەی تێدا ڕووبـدات، کچی ساوا زیندەبەچاڵ بکرێت تەنها لەبەر ئەوەی لە "ڕەگەز"ێکی نزمە و مێیە.

ئەدۆنیس: من باوەڕ ناکەم ئەمە ڕاستبێت. عەرەبەکان کچی مەلۆتکەیان بە زیندوێتی زیندەبەچاڵ کردبێت، ئەمە مێژوییەکی دروستکراوی دەستی مێژونووسە ئیسلامەکانە. هیچ بەڵگەیەک نییە کە عەرەبەکان بەهۆی برسێتی و ترسی ئابڕووچوونەوە ساواکانی خۆیان زیندەبەچاڵ کردبێت. نابێت ئێمە باوەڕ بەم جۆرە مێژووانە بکەین. تەنانەت ئەوەش هەڵەیە کە ئێمە قۆناغی پێش ئیسلام بە قۆناغی بێ مەعریفەیی ناوبەرین، ئەو سەروەختە پێش هاتنی ئیسلام عەرەبەکان خاوەن کلتوری خۆیان بوون. ناوبردنی ئەو قۆناغە بە قۆناغی "جاهلی" تەواو هەڵەیە و هیچ ڕەوایەتییەکی نییە. پێویستە ئینسان خۆی بەدووربگرێت لەو جۆرە تێگەیشتنە. هەموو ئەو ئەگەر و بیانوانە لەسەر ئەو قۆناغە ئەبێت بسڕێتەوە، ئەبێت هیچ حسابێکیان بەهیچ شێوەیەک بۆ نەکرێت.

نینار: گەر وابوایە ئەزانرا چونکە کاتێک کە تۆ غەزەلێک یان شیعرێکی ئیرۆتیکیانەی ئەو سەروەختە ئەخوێنیتەوە، ئەوکات ئەزانیت ئەوان چۆن باسی عەشق و جوانی ئافرەتانیان کردووە.

ئەدۆنیس: لەوەش زیاتر تۆ باسی ئەو ئازادیانەی ئـافـرەت بخوێنەرەوە کە باسیان کـردووە. لەو سەروەختەدا بڕیاری تەڵاقدان لەدەستی ژندا بووە و هەر خۆشی بڕیاری شووکردن و چونە لای هەرچ کەسێکی داوە کە ویستوێتی. چیرۆک هەیە سەبارەت بەوەی کە ئافرەتێک لەگەڵ چل پیاودا شوویکردووە بێ ئـەوەی هیچ کەسێک لەسەر ئەمە ڕەخنەی لێگرتبێت.

**نینار:** ئایا کۆمەڵگەی ئەو سەروەختە دایکسالاربووە؟

ئەدۆنیس: نەخێر، بـەڵام ئافرەتان ئازادییەکی گەورەیان هەبووە، وە لە هەندێک خێڵدا...

نینار: کافربوون، وانا؟

ئەدۆنیس: بەڵێ.

**نینار:** ئەی زۆرینەی خوداکانیان ئافرەت نەبوون؟

ئەدۆنیس: با وەکو عوزا، مەنات و لات بۆ نموونە ئافرەتبوون.

تێبینی:

ئەم بەشە تەنها نیوەی بەشی هەشتەمی کتێبی "گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا"یە.

سەرچاوە:

Samtal med min far, Adonis

Ninar Esber



# وێستگەکانی سەردەم

*ستیڤان زڤایج.. و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان
*کازانۆڤا و.لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع
*هێرتا مۆڵەر و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر
*فرانتز کافکا ئیدریس عەلی
*بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

# ستیڤان زڤایج.. بەهۆی هەرەسهێنانی ئەوروپاوە خۆیکوشت

نووسینی: یوسف یەڵدا
و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

نوسەر و ڕۆماننوسی نەمسایی "ستیڤان زڤایج ١٨٨١ - ١٩٤٢" لە ساڵی ١٩٤٢ خۆیکوشت، ئەمە دروست لەو کاتوساتە گونجاوەدا بوو کە نیشتیمانە ڕۆحییەکەی، واتە ئەوروپا، لەو سەردەمەدا بەدەست نەهامەتیەکانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە دەیناڵاند و خۆی وێران دەکرد. ئەمە بەپێی ئەو نامەیەیە کە پێش خۆکوشتنەکەی نوسیویەتی و بەم دوایانە لە میدیاکانی ئیسرائیلەوە بڵاوکراوەتەوە. کتێبخانەی نیشتیمانی ئیسرائیل، بە بۆنەی


ستیڤان زڤایج

**ستیڤان زڤایج لە نامەکەیدا دەنوسێ: (لە هەمو جارەکاندا، فێردەبووم چۆن ئەم وڵاتەم زیاتر خۆشبوێت، نەمدەتوانی لە هیچ شوێنێکی دیکەدا سەرلەنوێ ژیانم بنیاتبنێمەوە، ئەمە دوای ئەوەی هەمو ئەو کەسانەی بە زمانی دایکم قسەیان دەکرد و نیشتیمانە رۆحییەکەم، واتە ئەوروپا، لە دەستدا کە خۆی وێران دەکرد).**

تێپەڕبوونی حەفتا ساڵ بەسەر کۆچی دوایی ئەدیب و ڕۆژنامەنوس و بیرمەندی بە ڕەگەز جوولەکە، نامەکەی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکردۆتەوە کە بە زمانی ئەڵمانی نوسراوە. زڤایج ساڵی ١٩٣٦و دوای ئەوەی ماوەی سێ ساڵ بوو نازیەکان جڵەوی حوکمیان لە ئەڵمانیا گرتبووە دەست و دوو ساڵ بوو نەمسایان داگیرکردبوو، ڕایکرد بۆ بەرازیل. ئەم نوسەرە لە شاری بیترۆبۆلیس کە تەنها ٦٦ کیلۆمەتر لە شاری ریۆ دی جانیرۆوە دوورە، بڕیار دەدات سنورێک بۆ ژیانی خۆی و هاوسەرەکەی دابنێت. زڤایج لەو نامەی ماڵئاواییەیدا کە بە وشەیەکی پورتوگالی دەستپێدەکات و مانای (یان) دەگەیەنێت، دەڵێ: (ئەو بە تەواوی ئیرادەی خۆیەوە و بەو پەڕی هۆشیارییەوە ماڵئاوایی لەم جیهانە دەکات)و زۆر سوپاسی بەرازیل دەکات بۆ ئەو میوانداریيە باشەی لەبەرامبەریدا نواندویانە. ستیڤان زڤایج لە نامەکەیدا دەنوسێ: (لە هەمو جارەکاندا، فێردەبووم چۆن ئەم وڵاتەم زیاتر خۆشبوێت، نەمدەتوانی لە هیچ شوێنێکی دیکەدا سەرلەنوێ ژیانم بنیاتبنێمەوە، ئەمە دوای ئەوەی هەمو ئەو کەسانەی بە زمانی دایکم قسەیان دەکرد و نیشتیمانە رۆحییەکەم، واتە ئەوروپا، لە دەستدا کە خۆی وێران دەکرد).










زڤایح پێش ئـەوەی بۆ هەمو هاوڕێکانی هیوای: (مانەوەیان لە ژیـان بۆ بخوازێت تاکو دوای ئەم شەوە زەنگە تاریک و دوور درێژە، بەیانییەکی ڕووناک ببینن)، هۆکارەکانی پەنابردنی خۆی و هاوسەرەکەی بۆ خۆکوشتن باسدەکات: (لەبەرئەوە، حەزدەکەم لە کاتوساتی گونجاودا، وەک پیاوێک کە کارە ڕۆشنبیرییەکانی، هەمیشە جێگای خۆشبەختییە پاک و بێگەردەکەی و ئازادییە شەخسییەکەی بووە، سنورێک بۆ ژیانم دابنێم).

نامەکە دەکەوێتە دەست پۆلیسی بەرازیلەوە، بەڵام لەبەر ئـەوەی نامەکە بە ئەڵمانی نوسرابوو، بۆیە پۆلیسەکان ناچار دەبن بڕۆن بۆ لای یەکێک لە پزیشکە جولەکەکان، تاکو نامەکەیان بۆ وەرگێڕێت. لەو کاتەدا پزیشکەکە لەبەر بەها مێژوییەکەی نامەکە، دوا دەکات نوسخەی ئەسڵی نامەکە لای خۆی هەڵبگرێت، بەڵام پۆلیسەکان داواکەی ڕەتدەکەنەوە، چونکە پۆلیسەکان وەک بەڵگەیەک بۆ ئەو کێشەیە پێویستیان بە نامەکە بـووە. دوای تێپەڕبوونی بیست سـاڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا، هەمان پزیشک دەتوانێ نامە ئەسڵیەکە لە پۆلیسێکی خانەنشین کراو بکڕێتەوە. لە ساڵانی نەوەدەکاندا نامەکە دەدات بە کتێبخانەی نیشتیمانی ئیسرائیل، کتێبخانەکەش بەم دواییانە نامەکەی لە میدیاکانەوە بڵاوکردەوە.

سەرچاوە: ئیلاف، یەکشەمە، ٢٠١٢/٢/٢٦

# كازانۆڤا
# نوسەرو وەرگێڕو
# مێژونوسێکی مەزن

نووسینی: ئەنیسە مەخالدی
و.لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

کەوتونەتە داوییەوە، تەنانەت ناوی بووە بە نازناوێکو بەو کەسانە دەوترێت لە هونەری ڕامکردنی دڵی خانمانی شۆخو شەنگدا لێزان و بەتوانان. وەلێ ئەوەی زۆر کەس ئایزانن ئەوەیە ئەم مرۆڤە سەرچڵە ئیتاڵییە، نوسەرێکی نایاب و گەڕیدەیەکی گەورە بووە، لە سەدەی هەژدەهەم و لە میانەی کتێبەکانییەوە، وێنەیەکی گشتگیرو تێروتەسەلی کۆمەڵگای ئەوروپی ئەو سەردەمەی کێشاوە. ئەمەیە لە دواهەمین بەرهەمەکانیدا (بیرەوەریەکانی ژیانم) دەیبینین کە بە ناوی «جاک کازانۆڤا دو سنگال»وە بڵاویکردۆتەوە، ئەو بەرهەمە کتێبێکی گەورەیە و لە دە بەش پێکهاتووەو ٣٧٠٠ لاپەڕەیە و لە پاریس و لە کتێبخانەی نیشتیمانی فرانسوا میتێران لە پێشانگایەکدا نمایشکراوە.


کازانۆڤا

**نوسینەکانی کازانۆڤا ئەوە دەردەخەن کە عەشقێکی زۆری بۆ گەڕان و سەفەرکردن هەبووە. ئەو گەڕیدەیەکی گەورەیە، حەفتا هەزار کیلۆمەتری لە شاری بوندوقییەی ئیتالییەوە بۆ لەندەن و لەوێوە بۆ مەدرید و سان پترسبۆرگ، بە تێپەڕین بە قوستنتنییەدا بڕیوە.**

بەڕێوەبەرانی کتێبخانە فەرەنسییەکە ڕایانگەیاند دوای دانوسانێکی چڕوپڕ لەگەڵ بڵاوکەرەوەی ئەڵمانی (فریدریش برۆکهاوس)کە سێساڵی خایاند و لەبەرامبەر بڕی زیاد لە حەوت ملیۆن یۆرۆ، توانیان ئەو دەستنوسە ئەسڵییە وەربگرن. ئەمە وادەکات ئەو دەستنوسە بە ڕەهایی گرانترین کتێبی کتێبخانە فەرەنسی و جیهانییەکان بێت. بەڕێوەبەری کتێبخانە نیشتیمانیەکە «برۆنۆ راسین» ئەوەی ئاشکرا کردووە تەواوی بڕە پارەکە، دیاری کۆمپانیایەکی فەرەنسی گەورەیە و کۆمپانیاکە حەزی نەکردووە ناوی خۆی ئاشکرا بکات و پێیخۆشبووە شوناسی بە نهێنی بمێنێتەوە. لەبەر ئەو بەها ئەدەبی و مێژوییەی ئەم توحفەیە لەخۆیگرتووە، پرۆسەی پێدانی پارەکە بێ هیچ دوو دڵییەک بەڕێوەچووە. وەزیری رۆشنبیری فەرەنسیا «فریدریک میتێران» دەستکەوتنی کتێبخانەی نیشتیمانی بۆ چاپە ئەسڵییەکەی ژیاننامەی جیکومۆ کازانۆڤا، بەوە وەسفکرد کە: (گرنگترین دەستکەوتی کتێبخانەی نیشتیمانییە لەکاتی دروستبونییەوە)و ئاوا وەسفی دەستنوسەکە دەکات: (بەنرخترین پارچەیە کە فەرەنسا دەستیکەوتووە).

**کازەنۆڤا.. نوسەرێکی سەرسوڕهێن**

یەکەمین موفاجەئەی ئەم پێشانگایە کە تایبەتە بە سەرکێشە ئیتاڵییەکە، بریتییە لە ئاشکراکردنی کەسێتی (نووسەر) کە بەپێی تێڕوانینی نوسەری فەرەنسی «ڤیلیپ سۆلرس»بلیمەتییەکەی هیچی لە بلیمەتی ناودارانی وەک ڤۆڵتێر کەمترنییە. ڤیلیپ سۆلرس لە ژێر ناونیشانی (کازانۆڤای نایاب) ژیاننامەیەکی بۆ نوسیوە. کازانۆڤا لە خێزانێکی هونەرمەند کە حەزیان لە ئەدەب بووە، لە دایکبووە. بۆ هەر وڵاتێک رۆشتبێت یەکەمجار سەردانی کتێبخانەکانی کردووە و ماوەیەکی زۆر تێیدا ماوەتەوە. ئەو زۆری دەنوسی، نامەی دڵداری زۆری بۆ دڵدارەکانی نوسیوە، وەلێ بەشی هەرە

زۆریان لە ترسی ئەوەی نەبادا ئابڕوچونی دڵدارەکانی لێبکەوێتەوە، سوتاندووە. هەروەها چوار شانۆنامە و چیرۆکی نوسیوە، چەندین وەرگێڕانی بۆ کارەکانی ڤۆڵتێرو هۆمیرۆس ئەنجامداوە و چەندین توێژینەوەی لە بـواری مێژوو و بیرکاریدا نوسیووە. بەڵام بە بەهاترین نوسینەکانی، پێدەچێ ژیاننامەکەی خۆی بێت کە ڕۆژنامەی (ئێکسپرێس) بە باشترین کاری ئینسایکلۆپیدیایی سـەدەی هـەژدەهـەم وەسفی دەکات. ئەو ژیاننامەیە کە ئیشکردن تێیدا نزیکەی نۆ ساڵی خایاندووە، بە خەتی خۆی نوسراوەتەوە، وەک ئەوەی لە پێشانگای کتێبخانەکەدا نمایشکراوە. «ماری لۆر بریفۆ» کە لە کتێبخانە نیشتیمانیەکەدا بـەر پرسی بەشی دەستنوسەکانە، بـاس لەوە دەکـات کازانۆڤا لە ساڵی ١٧٨٩و لەسەر داوای هاوڕێیەکی دەوڵەمەندی کە ناوی شازادە «لین» بووە، دەستیکردووە بە نوسین. کازانۆڤا لەو کاتەدا تەمەنی ٦٤ ساڵ بووە. ڕۆژانە تێکڕای ١٣ کاتژمێر سەرقاڵی نوسین بـووە، لە ساڵی ١٧٩٢ بەهۆی توشبونی بە نەخۆشی خەمۆکییەکی توندەوە، بۆ ماوەی ١٨ مانگ لە نوسین دورکەوتووەتەوە، دوای ئەوە دەستیکردۆتەوە بە نوسین و تاکو مردنی لە ساڵی ١٧٩٨ بەردەوام بووە. لە خوارەوەی هەمو لاپەڕەیەکدا یەکەمین پیتەکانی ناوی خۆی نوسیوە، تەنها لاپەڕەی کۆتایی نەبێت کە تاڕادەیەک وەک لاپەڕەیەکی بەتاڵ دەردەکـەوێـت و وادیـارە بە دەستێکی لـەرزۆک و لاوازەوە تێیدا نوسراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت تا ساتەوەختی مردنی هەر سەرقاڵی نوسین بووە.



یەکەم بەهای یادەوەریەکانی، بەهایەکی ئەدەبییە کە بە زمانێکی فەرەنسی ڕەوان نوسراوە. هەرچەندە کازانۆڤا ئیتاڵی بووەو زمانی فەرەنسی باش نەزانیوە تەنها لەکاتی گەورەبونیدا نەبێت، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شەیدای زمانی مۆلێر بووە. ئاستی زانستییە بەرزەکەی (بڕوانامەی دکتۆرای لە یاساو لە زانکۆی بادۆ بەدەستهێناوە)، لەگەڵ ڕۆشنبیرییە بەرفراوانەکە و پەیوەندیکردنی بە ناوەندەکانی ماسۆنیەتەوە لە سەرەتای ساڵی ١٧٥٨، هەمو ئەوانە یارمەتیاندا نزیکبێتەوە و بگاتە ناوەندەکانی ڕۆشنبیران و خانەدانەکان، لەو میانەیەدا ڤۆڵتێرو جان جاک ڕۆسۆی ناسی و لەسەر دەستی هاوڕێ نوسەرەکەی «کلۆد بوسار دو کربیۆن» زمانی فەرەنسی بەباشی فێربوو.

دووەمین بەهای یادەوەریەکانی، ئەو شێوازە خۆش و ئاسان و جوان و سادەیەیە کە ئەم سەرچڵە ئیتاڵییە لە نوسینەکانیدا بەکاریهێناوە و تێیدا توانا و وزە داهێنەرەکانی تەقیوەتەوە. لە ڕێگەی بەکارهێنانی زمانێکی مەجازییەوە، خـۆی لە بریندارکردنی هەست و سۆزەکانی دیکە بـەدوور گرتووە، خۆی لەو زمانە ئابڕوبەرەیە بەدوور گرتووە کە هەندێ لە نوسەرەکانی سەردەمەکەی بەکاریاندەهێنا. بۆ نمونە ئەو بەم دەستەواژانەی خـوارەوە وەسفی ئافرەت دەکات: (ئافرەت باخچەیە، بەهەشتێکە ڕوبارەکانی چێژ و لەزەتی تێدایە، گوڵ و سێو و میوەی تێدایە کە هەندێجار حەرامە، بەڵام لە هەمو بارودۆخەکاندا بۆ لێکردنەوە و خواردن شیاوە).

«ئەنتوان دو باک»ی توێژەر کە کارێکی تەلەفزیۆنی سەبارەت بە ژیانی کازانۆڤا لە ژێر ناونیشانی (کازانۆڤا و بیرەوەریەکانی ژیانم) لەگەڵ کەناڵی پێنج واژۆ کـردووە، دەڵـێ: (ئـەوەی لە شێوازی نوسینی کازانۆڤادا جێگای سەرسوڕمانە، ئەوەیە خۆی لە هەمو کۆت و بەندێک ڕزگار کردووە، ئەو جارێک گاڵتەئامێزە و جارێکی دیکە جدییە، بەڵام

لە هەمانکاتدا هەم هەزەلییە و هەم ڕەشبینیشە، ئەمەش ڕێگەمان پێدەدا دان بەوەدابنێن کازانۆڤا نوسەرە، بگرە لە نوسەرە گەورەکانە).

بە پێی قسەی «بلیز سوندرار»ی نوسەر بێت، ژیاننامەکەی کازانۆڤا بەهایەکی مێژویی گەورەی هەیە، ئەم نوسەرە پێیوایە ئەو ژیاننامەیە یەکەمین ئینسایکلۆپیدیایەکی گشتگیرە لەسەر سەدەی هەژدەهەم. بەرپرسی بەشی فەلسەفە و مێژو لە کتێبخانەی نیشتیمانی فرانسوا میتێران «فریدریک منفران» دەڵێ: (کانانۆڤا لەوەدا سەرکەوتوو بووە ئەو لایەنە شاراوانەی سەردەمی ڕۆشنگەری ئاشکرا کردووە کە کتێبە مێژوییەکانی دیکە پشتگوێیان خستووە و ئاوڕیان لێنەداوەتەوە. ئەو سەردەمە بە تەنها سەردەمی پێشکەوتن و سەرکەوتنی عەقڵ و زانست نەبووە، بگرە بایی خۆی ئاڵۆز و ناڕۆشن و تاریک بووە. گێڕانەوەکانی ئەم گەشتیارە ئیتالییە سەبارەت بە ژیانی ناو کۆشک و سالۆنە تایبەتییەکان، کۆمەڵێ بەڵگەی زیندوون لەسەر بەردەوامبوونی کارە کۆنەکان، وەک شەیدابوون بە کیمیا و بەختگرتنەوە و هەیمەنەی پیاوانی ئاینی لە هەمو شوێنێکدا. بۆ نمونە لە ژیاننامەکەیدا و لە میانەی گەشتەکەی بۆ ئیسپانیا، چەندین لاپەڕە بۆ دادگاکانی بە مەسیحکردن کە لە ئیسپانیای ئەو سەردەمەدا بوونێکی زۆریان هەبووە، تەرخانکراوە).

## کازانۆڤا..گەڕیدەیەکی گەورە

هەروەها بەشێک لە پێشانگاکە، بۆ ژیانی کانانۆڤا تەرخانکراوە کە یەکێکە لە کەسایەتیە ئیتالییە هەرە بەناوبانگەکانی جیهان. شازادە (لین) کە یەکێکە لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی و تاکو دوا ڕۆژەکانی تەمەنی لەگەڵیدا بووە، دەڵێ: (تابلێی قۆز و جوان بووە، بەڵام سەرنجڕاکێشانەکەی لە قۆزی و جوانی ڕوخسارییەوە نەبووە، چونکە ئەو زۆر گەنمڕەنگ بووە و دوو لێوی ئەستوریشی هەبووە. باڵابەرزو ناوشان پان بوو، هەمو سیحری ئەو لە چاوەکانیدا کۆببووەوە، ئەو چاوانەی هەندێجار پڕ بووە لە زیرەکی و هەست ناسکی و هەندێجاری دیکە پڕ بووە لە هێز و ئاڵۆزی).



نوسینەکانی کازانۆڤا ئەوە دەردەخەن کە عەشقێکی زۆری بۆ گەڕان و سەفەرکردن هەبووە. ئەو گەڕیدەیەکی گەورەیە، حەفتا هەزار کیلۆمەتری لە شاری بوندوقییەی ئیتالییەوە بۆ لەندەن و لەوێوە بۆ مەدرید و سان پترسبۆرگ، بە تێپەڕین بە قوستنتنییەدا بڕیوە. ئەو بۆیە سەفەری دەکرد تاکو زەوی و کۆمەڵگا و کەلتووری تازە بدۆزێتەوە، هەروەها بۆیە سەفەری دەکرد چونکە پیاوێکی بازرگان و سیخوڕ بووە و لەلایەن چەندین سەفیرەوە کاری نهێنی پێڕاسپێردراوە، هەروەها قومارچییەکی پلە یەک بووە. یەکێک بووە لەوانەی شەیدای شاری پاریس و لەندەن بووە، بەڵام خۆشەویستی بۆ نیشتیمانەکەی خۆی قوستەنتنییە، لەسەرو هەمو شتێکەوە بووە. نزیکەی حەڤدە ساڵ دوور لە قوستەنتنیە ژیاوە، بەپێی دانپیانانەکانی خۆی لە یادەوەریەکانیدا، ڕۆژی گەڕانەوەی بۆ شارەکەی خۆی لە ساڵی ١٧٧٤ خۆشترین ڕۆژی ژیانی بووە.

## عاشق و مرۆڤ

کازانۆڤا بەوە ناسراوە عەشقێکی گەورەی بۆ ئافرەت و چەندین پەیوەندی دڵداری هەبووە، بەپێی ئەو دانپیانانەی لە ژیانامەکەیدا هاتووە، ژمارەی پەیوەندییە دڵدارییەکانی گەشتووەتە ١٢٢ پەیوەندی. «ماکسیم رۆڤەر» خاوەنی کتێبی (کازانۆڤا چیرۆکی ڕاکردنم لە زیندانی بوندوقییە) کە لەلایەن دەزگای ئەلیا بۆ بڵاوکردنەوە چاپکراوە،

دەڵێ: (ژمارەکە بۆ خۆی پێوەر نییە، چونکە ئەو پیاوانەی لە سەردەمی ئەودا ژیاون، لەوانەیە ژمارەیەکی زۆرتر ئافرەتیان ناسیبێت. بەڵام ئەوەی کازانۆڤا جیادەکاتەوە بریتییە لەو خۆشەویستیە ڕاستەقینەیەی بۆ ئەو ئافرەتانە هەیبووە. ئەو هیچ پەیوەندییەکی نەدەبەست ئەگەر بە تەواوی شەیدای نەبوایە و دڵی بۆی لێنەدایە و تەنها دوای ئێش و ئازارێکی زۆر جێیاندەهێشت).

خانم «شانتال تۆماس» کە نوسەر و توێژەرێکی پسپۆڕە لە ئەدەبی سەدەی هەژدەهەم دەڵێ: (کازانۆڤا خۆشەویستی خۆشویستووە، لای ئەو هەستی عاشقبوون پەیوەست بووە بە خۆشەویستی زۆری بۆ ژیان. ئەو حەزی لە خواردنی باش و جلوبەرگی گرانبەها و هەمو لەزەتەکانی ژیان بووە. لە هەر وڵاتێک کە پێی تێخستبێت، بە دوای پەیوەندی ئافرەتانەی نوێدا گەڕاوە، بەڵام نەیویستووە ئەو پەیوەندیانەی زۆر بخایەنێت. خۆشەویستی ئەو بۆ سەفەرو گەڕان، ڕێگربووە لەبەردەم پەیوەندی درێژخایەندا. ڕاکردنی لە زیندانی بلۆم، دوای ١٤ مانگ زیندانیکردن، ئەگەرچی ڕێوڕەسمێکی پاسەوانی توندوتۆڵ گیرابووەبەر، ئەوە دەردەخات ئەو چەند حەزی لە سەفەرو گەڕان بووە)

کازانۆڤا لە ژیاننامەکەیدا، لای سێ ئافرەت ڕادەوەستێت، یەکێک لەوانە «تیرێز»ە، ئەم خانمە گۆرانیبێژێکی ئۆپرای ناسراوەو خەڵکی شاری ناپۆلی بووە، بە دەنگە خۆشەکەی کازانۆڤای سەرسام کردبوو، پەیوەندییەکەیان بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بووە. هەروەها لە ژیاننامەکەیدا بە دوورو درێژی لەسەر خانم «هنریات»ی نوسیووە و بە (خۆشەویستی ژیانی) وەسفی کردووە. ئەو خانمە ئەرستۆقراتێکی دەوڵەمەند بووە سەر بە چینی خانەدانەکان بووە، پێدەچێ ئەو خانمە «هنریات دو فرانس» بێت کە یەکێک بووە لە خزمە نزیکەکانی پاشای فەرەنسای ئەو سەردەمە. لە لاپەڕە ٥٠٩ کتێبەکەدا بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفی دەکات:

(لە یەکێک لە ئاهەنگەکانی ئۆپرادا، کاتێ هنریاتـم بینی بەلامەوە سەیر بوو، ئەم خانمە ناسکە، بەرەو لای سەکۆکە دەڕوات و داوا لە ژەنیارێکی گەنج دەکات ئامێری کەمانچەکەی پێبدات. کاتێ بینیم ئەو ئامێرە مۆسیقییە دەژەنێت، هەستمکرد لێدانە بەهێزەکانی دڵم، دەمکاتە لاشەیەکی سارد و سڕ).

«لیدیا فلام» پسپۆڕی دەرونناسیو خاوەنی کتێبی (کازانۆڤا.. ئەو پیاوەی بە ڕاستگۆیی ئافرەتی خۆشدەویست) دەڵێ: (ناڕەوایە دۆن جوان بە کازانۆڤا بەراورد بکرێت، یەکەمیان ڕقی لە ئافرەت بوو، ئەمە تەواو پێچەوانەی کازانۆڤا بوو کە بە ڕاستی ڕێزی ئافرەتی دەگرت و وەک دەوترێت ئەو بۆ ئەوە لەدایکبووە تا ئافرەتەکان دڵخۆش بکات. بۆ نمونە کازانۆڤا هەرگیز هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئافرەتی بیانی نەبەستووە کە زمانەکەی نەزانیبێت و نەتوانێت گفتوگۆ و دەمەتەقێی لەگەڵدا بکات. ئەو پێش ئەوەی عاشق بێت هاوڕێی ئافرەتەکان بووە).

ڕەنگە دەرهێنەری ئیتالی «ڤیلینی» لە فیلمەکەیدا (ئال کازانۆڤا دو فریدریکۆ فیلینی) ساڵی ١٩٧٦، باشترین کەس بێت لە کەسێتی ئەم سەرکێشە ئیتاڵییە مەزنە نزیکبوبێتەوە. ئەو دەرهێنەرە بەشێوەیەک وێنەی کازانۆڤای کێشاوە وەک ئەوەی مرۆڤێکی لاوازی ئازارچەشتوبێت، مرۆڤێک بۆ ئەوەی لەو مۆتەکانە ڕابکات کە بە درێژایی ژیانی لەگەڵیدا بووە، نوقمی لەزەتەکانو ژیانێکی نامرادانە بوو.

سەرچاوە: لاپەڕەی ڕۆشنبیری الشرق الاوسگ، ٢٩ کانونی دووەم، ٢٠١٢

# گفتوگۆ لەگەڵ
# هێرتا مۆڵەر

سازدانی: ئێرنست گراندیتس
و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر

**نووسین لە ژیانی مندا پەناگایەکە**

ئەم گفتوگۆیە کە دەیخوێنیتەوە، مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٩ لە لایەن (ئێرنست گراندیتس) کە لە بەرنامە پێشکەشکەرانی تۆڕی تەلەفزیۆنی نەمساو ئەڵمانە (٣sat) لەگەڵ هێرتا مۆڵەر ئەنجامدراوە. هێرتا مۆڵەر ساڵی ٢٠٠٩ بەهۆی ڕۆمانی (هەناسە سواری Atemschaukel) خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرتووە. خانم مۆڵەر دوازدەهەمین ژنە نووسەرە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبێ.

**- کاتێك هەواڵی پێدانی نۆبڵی ئەدەبیت زانی، وتت: (ئەم خەڵاتە) پەیوەست نییە بە منەوە، بەڵکو پەیوەستە بە کتێبەکانمەوە. هێشتایش هەروا بیردەکەیتەوە؟**

**کاتێك بیر لە بابەتێك دەکەمەوە، ئەم ئەزموونانە لە ناو ناچن. ئاشکراتر و ڕوونتر دەبن. ئەم کارە لە لایەکەوە مرۆڤ ئازار دەدات، لە لایەکیتریشەوە جۆرە پێویستییەکە کە دەبێ مرۆڤ بیهێنێتەدی. بەڵام من دەروونناس نیم و نازانم تا چ ڕادەیەك ئەم کارە دەتوانێ یارمەتی مرۆڤی ئازار دیتو بدات. نازانم ئەگەر نەمدەنووسی لەمە شێتتر دەبووم یا ئەگەر نەمدەنووسی شێت دەبووم. نازانم**



کازانوڤا

* تەواو بەمجۆرە بیردەکەمەوە. (پێکەنینی بینەران) یەک دوو هەفتەی تر، هەموو شتێ دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی، کەف و کوڵەکان دادەمرکێنەوە. واهەستەکەم بینەران لە من زیاتر هاتوونەتە جۆش. (هەموو پێدەکەنن.)

**- بەڵام بە وتەی(ئەلفرێد یلینگ) ئەم خەڵاتە بەم مانایەیە کە تۆ دەتوانی بێ خەمی نان کارەکەت بکەیت.**

* هەرگیز خەمی نان نەبۆتە ئاستەنگ لەبەردەم کاری مندا. لە ڕۆمانیا کاتێ کارەکەم لە دەستدا و قەرزار بووم، دەهاتە پێش کە پارەم نەبوو، تەنانەت نەمدەتوانی نانێکی ئێوارە بۆ خۆم ئامادە بکەم. هەربۆیە دەزانم ئەگەر مرۆڤ تەواو موفلیس بێت، زۆرخراپە.
بەڵام لەو کاتەوەی هاتم بۆ ئەڵمانیا، ژیان و بەرنامەی کارم ڕێکوپێک بوو و تا ئەمڕۆیش بەخت یاوەرم بووەو توانیم لە ڕێگەی کتێبەکانمەوە، لە ڕێگەی کۆڕی چیرۆک خوێندنەوە و خەڵاتە ئەدەبییەکانەوە، خەرجی ژیانم دابین بکەم. هەر بۆیە لە لایەنی داراییەوە ئارێشەیەکم نییە و هیچ کاتێ ناچار نەبووم بۆ پارە بنووسم، هەرچەند هەندێک کات پێویستم بە پارە بووە، بەڵام هەرگیز بیرم لێنەکردۆتەوە.

- کۆمیتەی خەڵاتی نۆبڵ وەک نووسەرێک کە لە سروشتی بێ نیشتیمانی بەچاکی شارەزایە، باسی ئێوەی کرد. ئایا تۆ هەست بە بێ نیشتیمانی دەکەیت؟ یا ئەوەی کە لە ڕوانگەی تۆوە زمانی ئەڵمانی جۆرێکە لە نیشتمان؟

* زمان، نیشتیمان نییە. لە وتارێکیشدا ئاماژەم پێدابوو. ئەم گوزارشتەی کە زمان نیشتیمانی منە، ئەو کۆچبەرە ئەڵمانیانە دروستیان کرد کە هیتلەر و حکومەتی نازی ڕاویان نابوون بۆ دەرەوەی وڵات. بە ڕاستی ئەوان هەقیان بوو وا بیربکەنەوە. ئەم گوزارشتە هی ئەوانە چونکە دەبوو دڵنیایی لە ناسنامەی خۆیان پەیدا بکەن لە تاراوگەدا.
بەهەرحاڵ هەستەکەم گەر مرۆڤ لە ئەڵمانیا بژی، کە وڵاتێکی دیموکراتییە، شوێنێکە مرۆڤ ئازادانە دەتوانێ بۆ هەر کوێ بێت و بچێت، باشترە ئەم دەستەواژەیە بە کارنەبات. سەرباری ئەمەیش مرۆڤی

کۆچبەر کاتێ وڵاتەکەی جێدەهێڵێ، عەشقی بۆ زمانی دایکی زیاتر دەبێت. زمانی دایک بەشێکە لە جەستەی ئەو. مرۆڤ کاتێ دەمرێ، زمانەکەی لە دەست دەدات. بەڵام ئەم بەڵگەیە نابێتە ئەوەی کە زمان نیشتمانی مرۆڤ بێت. زمان نیشتیمانی مرۆڤ نییە.
زێدی مرۆڤ شتێکە لە زماندا ڕایدەگەیەنێ. بە بۆچوونی من جیاوازی نێوان ئەم دوو چەمکە، زۆر گرنگە. گەر من لە جێیەک بژیم و ڕێگە نەدەن بژیم... وەک ئەو چینییانەی کە لە زینداندا دەژین، ئایا زمان زێدی ئەوانە؟ واتا زمانی ئایدۆلۆژی چینی کە دیکتاتۆرەکانی چین بەکاریان دەبرد، زێدی ئەو زیندانییە سیاسیانەیە؟ جارجارێ بە ڕێکەوت بەو دەلیلەی کە مرۆڤ لەگەڵ دیکتاتۆرەکاندا زمانێکی هاوبەشی هەیە، زمان ناتوانێ ببێتە زێدی مرۆڤ و بەم دەلیلەیش زمان، جارجارێ زێدی مرۆڤ نییە، کە مرۆڤ قسەی دوژمنکارانەی لایەنی بەرامبەری تێدەگات. هەمیشە زمانی هاوبەش یەک زمان نییە. بەم دەلیلانەی کە وتم، گوزراشتی (زمـان زێدی مرۆڤە) لای من نرخ و بایەخی نییە.

**- تۆ دەتـەوێ بە نووسینەکانت کارێك بکەیت کە دیکتاتۆرییەت و ئەزموونی مرۆڤەکان لە سیستمێکی دیکتاتۆریدا لە بیرنەچێتەوە.**

* ئەو پەیامە پیرۆزباییانەی کە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتەوە بە دەستم دەگات، خۆشحاڵم دەکات. کاتێ ئـەم پەیامانە دەخـوێـنـمـەوە، ئـەویـش لە خەڵکانێکەوە کە دیکتاتۆریەتییان ئەزموون کردووە، واهەستەکەم ڕەنگە بوو بێتمە هۆی ئەوەی کە ئەوان شاد بن. بەڵام بەهەرحاڵ ناتوانم وا بنوێنم کە لە سەرەتاوە مەبەستم ئەمەبووە. ئەم کارە دەستبرییە، من پەیامبەرێک نەبووم، بـەڵام هەمیشە کارێکم ئەنجامداوە کە دەبوو ئەنجامی بدەم. بابەتی زۆرێک لە نووسینەکانم ئەزموونی کەسی و ئازارگەلێکە کە لە ژیاندا بینیومەو ئەمانە بە زۆرەملێیی گۆڕاون بۆ بابەتی ئەدەبیات.
من ئەم بابەتانەم هەڵنەبژاردووە. ئەم بابەتانە بەسەر مندا سەپاون. ئێستا ئەگەر ئەم هەوڵانە ئەنجامی هەبووە، چاکە، خۆشحاڵم. بەڵام ناتوانم بەمشێوەیە وا بنوێنم کە ئەمە خواست و ئامانجی من بووە. ئەگەر وابووە، بێگومان ئەم هەوڵانە نەدەگەیشتە جێیەک. هەستەکەم گەر نووسەرێک بە مەبەستی پڕوپاگەندە قـەڵـەم بوەشێنێ، کـارەکـەی شتێکی گەمژانە دەردەچێت. ئەگەر مەبەستمان بێت، ڕاگەیەنەری پەیامێک بین، بۆ نموونە: قەڵەم دژی دیکتاتۆری بوەشێنین، لە چاوتروکانێکدا تێکستەکە دەگۆڕێ بۆ تێکستێکی ئایدۆلۆژیک، با دژی دیکتاتۆریش بێت. متمانەم بەمجۆرە ئەدەبیاتە نییە.

**- وتووتە دەبێ سەیری سەرچاوەی ئازارەکان بکەین. هەستەکەیت ئەگەر مرۆڤێك خەریکی ئەم ئازارانە بێت، دەتوانێ بەمشێوەیە شیفای خۆی بدات؟**

* بەڵام خۆ من نەخۆش نیم (پێدەکەنێ)
– مەبەستم ئازارێکە کە نووسەر هاندەدا بۆ نووسین.
* نازانم. ڕەنگە خەریکبوون بەم ئازارانەوە یارمەتی کەسانێک بدات و ببێتە پەناگایەک لە ژیانی ئەواندا. نووسین لە ژیانی مندا پەناگایەکە. نازانم بۆچی. نووسەرانێکیش هەن کە ئەزموونی دیکتاتۆریەتییان نییە، بـەڵام نووسین لە ژیانی ئەوانیشدا هەر پەناگایەکی دڵنیاییە. هەستەکەم هەر کارێک کە مرۆڤ لە ژیانیدا ئەنجامی دەدات، گەر ببێتە هۆی ئـەوەی کە مرۆڤ سەیری دەرەوەی خۆی بکات، مانایەک دەداتە ژیانی. هەست ناکەم چاوەڕوانی لەوە زیاترت هەبێت.
کاتێک بیر لە بابەتێک دەکەمەوە، ئەم ئەزموونانە لە ناو ناچن. ئاشکراتر و ڕوونتر دەبن. ئەم کارە لە لایەکەوە مرۆڤ ئازار دەدات، لە لایەکیتریشەوە جۆرە پێویستییەکە کە دەبێ مرۆڤ بیهێنێتەدی. بەڵام من دەروونناس نیم و نازانم تا چ ڕادەیەک ئەم کارە دەتوانێ یارمەتی مرۆڤی ئازار دیتو بدات. نازانم ئەگەر نەمدەنووسی لەمە شێتتر دەبووم یا ئەگەر نەمدەنووسی شێت دەبووم. نازانم.

**- لە ڕۆمانەکەتاندا (هەناسە سـواری) باسی نیشتەجێکردنی زۆرە ملێی ڕۆمانییە بە ڕەگەز ئەڵمانییەکان دەکەن لە دەورانی ستالیندا، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە. دایکی تۆ لە یەکێ لەم ئۆردوگایانەدا بووە. ئەو هاوڕێیەکی**

**هەبوو بە ناوی(هێرتا) کە لە ئۆردوگاکەدا لە برسا مرد. ئایا دەتوانین بڵێین دایکی تۆ، کاتێ تۆی ناونا(هێرتا)، ڕووبەڕووی ئەو کارە بۆوە کە تۆ و برسێتی پەیوەندیتان هەبێت؟**

* (ڕادەمێنێ و سەر ڕادەوەشێنێ) بە دڵنیاییەوە وەها مەبەستێکی نەبووە. (پێدەکەنێ) دایکم لەو باوەڕەدابوو کە بێگومان دەبێ من کارێکی ئابرومەندانەم هەبێت. پیشەیەک کە بتوانم لە ڕێگەیەوە خەرجی ژیانم دابین بکەم و مانگانەیەکی جێگیرم هەبێت و بێگومان ڕازی نەبوو کچەکەی ببێتە نووسەر. دەیوت: دەترسم ئەعسابت خراپ بێت و باوەڕی وابوو کە نووسین و خوێندنەوەی کتێب ئەعسابی مرۆڤ خراپ دەکەن و مرۆڤ نەخۆش دەخەن. (پێدەکەنێ.) هەڵبەتە ئەو لەسەر حەق بوو.

مرۆڤ کاتێ لە خۆی دەپرسێت ئاخر ئەمە چ پیشەیەکە من هەڵمبژاردووە و خەریکی چیم و ئەم کارە چ کەڵکێکی هەیە؟ بەهەرحاڵ نووسەری کارێکی سەیرە. ئەگەر دایکم ناویناوم هێرتا بەم دەلیلە بوو کە بەڵێنی بە هاوڕێکەی دابوو ئەگەر کچێکی ببێ، ناوی دەنێ هێرتا. ئەو وەفای بۆ بەڵێنەکەی هەبوو و ئەم کارەیش جێگەی ڕێزە.

**- ئێوە نیازتان وابوو ڕۆمانی(هەناسە سواری) لەگەڵ ئۆسکار پاستیۆری هاوڕێتان بنووسن. بەڵام ئۆسکار پاستیۆری پاڵەوانی چیرۆکەکەتان مرد و تۆیش ناچار بوویت بە تەنیا کتێبەکە بنووسی. ئۆردوگای کار، بابەتێك کە تۆ لەم کتێبەدا باسی دەکەیت، لە ڕۆمانیا بابەتێکی یاساغ بوو. دایکی تۆ هەرگیز لە بارەی ئەمەوە قسەی نەدەکرد و ئۆسکار پاستیۆریش حەزی نەدەکرد قسە لە بارەی ئەم بابەتەوە بێنێتە ئاراوە. چۆن بوو ڕازی بوو کە لەگەڵ تۆدا ئەم کتێبە بنووسێ.**

* ئۆسکار پاستیۆر لە کتێبەکانیدا، لە هەموو کتێبەکانیدا، بە زمانی بەستراوەوە شتگەلێکی زۆری لە بارەی ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێوە نووسیوە. ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ بابەتی ئۆردوگا ئاشنا بێت، لە کتێبەکانی پاستیۆردا چەندینجار تووشی ئەم بابەتە دەبێت. کاتێ پێموت دەمەوێ لە بارەی نیشتەجێی زۆرەملێی ڕۆمانییە بە ڕەگەز ئەڵمانییەکانەوە کتێبێک بنووسم، پێی وتم لەم کارەدا هاوکاریت دەکەم.

دەیزانی کە دایکی من لە ڕیزی کەسانێک بوو کە ئەویان بردبوو بۆ ئۆردوگا. بە گشتی ئۆسکار پاستیۆر لە دەستەی ئەو خەڵکە خۆڕاگرەبوو، تەنانەت لە بارەی ژیانی تایبەتیشییەوە زۆر قسەی نەدەکرد. بەهەرحاڵ گەر متمانەیت بە دەست بهێنایە لە بارەی ئەم بابەتانەوە قسەی دەکرد. بەڵام نەک بۆ میدیاکان. کاتێ دەستمان بە قسەکرد لەم بارەیەوە، ئەگەری هەبوو یادەوەرییە لە بیرکراوەکانی هاتبێتەوە بیر. ئەو لە هەموو ئەم ساڵانەدا خەونی بە ئۆردوگاوە دەبینی. بە تووندی ئازاری بینیبوو و هەرچی زیاتر پێکەوە قسەمان دەکرد، بە ڕوونییەکی زیاترەوە ئەو یادەوەرییانەی بیردەکەوتەوە، تا ئەوەی ڕۆژێکیان ڕێکەوتین لەگەڵ ئەو چووین بۆ ئۆکرانیا و سەردانی ئۆردوگاکەمان کرد.

– هەندێک لە ڕەخنەگران باوەڕیان وایە کە لە کتێبەکانی تۆدا ڕووداوی ترسناک هەیە کە بەسەر خەڵکی ئۆردوگاکەدا هاتووە،ئەمە لە ئەدەبیاتدا بە شێوازێکی شاعیرانە دەربڕاوە، بۆیە کتێبەکەی تۆ لە هەندێک لایەنەوە شایانی تەحەمولکردن نییە. بەڵام من هەستمکرد لە چیرۆکەکانی تۆدا ئەم ڕووداو و کارەساتانە بە زمانێکی درەوشاوەی شاعیرانە گوزارشتیان لێکراوە، بەڵام هاوکات لە قسەی شاعیرانەی تۆدا جۆرە دڵنیاییەک هەیە. بە بۆچوونی تۆ بۆ بەیانکردنی ڕووداوێک کە ناکرێ بە سادەیی بەیانی بکەیت، زمانی شاعیرانە چ بایەخێکی هەیە؟

* مەسەلەکە زمانی شاعیرانە نییە. نازانم بە بۆچوونی خەڵکی کوێی کارەکانی من زمانێکی شاعیرانەی هەیە. هەندێک دەربڕینی وەکو (فریشتەی برسێتی) یا (بوونە پێست و ئێسک) لەوەی ئۆسکار پاستیۆرە، بەڵام پاستیۆر ئەم وشانەی لە چەمکێکی شاعیرانەوە دەرنەبڕیوە کە بە شێوازێکی تەواوی شاعیرانە هەستی پێبکرێت. بەڵکو ئەوە تایبەتە بە شێوازی نووسینی خۆیەوە.

لە ڕاستیدا شێواز فۆرمێکی بەرجەستەکراوی بیرە. هەربۆیە نووسەر ناتوانێ هەمیشە شێوازەکەی

بگۆڕێت و بڕیار بدات کە لە ئەمڕۆوە بە شێوازێکی تر بنووسێت. ڕەنگە نووسەرانێک هەبن بتوانن شێوازەکەیان بگۆڕن. بەڵام ئەم کارە لە توانای مندا نییە. شێوازی دەربڕینێک کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە بەکارم هێناوە، بۆ من تاقە ڕێگەی باسکردنی ئەم بابەتە بووە. من لەسەر بنەمای ئەزموونەکانی پاستیۆر ئەم کتێبەم نووسی، بەڵام گێڕەرەوەی یەکەم کەسی چیرۆکەکە لەگەڵ ئۆسکار پاستیۆردا جیاوازی هەیە. هەوڵمدا ئەزموونی خەڵکانی تریش بخەمە سەر ئەزموونەکانی ئەو.

لە ڕاستیدا (من)ی چیرۆکەکە بە مانایەک لە ماناکان وێناکردنی ئۆسکار پاستیۆرە. ناچاربووم وەها وێنایەک لەوەوە دروست بکەم. چونکە ئەو شتانێکی بە من دەوت و زۆر شتیشی بە نەوتراوی دەهێشتەوە. بەم دەستپێکە، نەوتراوەکانیش دەوتران. لەبەرئەوەی شێوەی دەربڕینی من لەم کتێبەدا لە ڕاستیدا فەرمانێکی ناچاری و تاقە ڕێگەی نووسینی ئەم کتێبە بوو. ئەسڵەن زمانی شاعیرانە یانی چی؟

وردەکاری زمان بۆ من گرنگ بوو. ئەو زمانەی هەڵمبژارد دەبوو وەها بچێتە قووڵایی بابەتەکەوە تا ڕۆحی قسە بەیان بکات. دەمویست وەها جوانییەک بەکار بەرم. زمانێک کە هەر ڕستەیەکی تا ڕادەیەکی باش بگات و کارەساتە ستەمکاریەکانیش پیشان بدات. (جوان) وشەیەکی تەمومژاوییە. کاتێ ناتوانین وەسفی شتێک بکەین، دەڵێین جوانە. دەڵێین هونەر جوانە. کاتێک ناتوانین تەحەمولی شتێک بکەین، دەڵێین جوانە. هونەر جوانە.

**- لەگەڵ ئەم وردەکاریانەدا، بە بۆچوونی تۆ یەکێ لە پێوانەکانی سەرکەوتنی هەر کارێك، وردەکارییە لە زماندا.**

* بەڵێ. وردەکاری لە ڕیتمی هەر ڕستە و پاراوی ڕستەکاندا، بە شێوەیەک کە بکرێ ئاسان بیخوێنیتەوە. ئەگەر ڕستەیەک بە دەنگی بەرز بخوێنینەوە و ساتمەیەکی تێکەوێت، بێگومان ئەو ڕستەیە گرفتی هەیە. دەبێ هەموو ڕستەکانی دەقەکە لە شوێنی خۆیاندابن. وا چاکە لەگەڵ هەر بڕگەیەکی شاعیرانەدا بڕگەیەکی بەڵگەیی هەبێت، بە شێوەیەک کە تێکستەکە بێزارت نەکات و بڕگەکان بتوانن کەموکوڕی یەکتری تەواو بکەن.

بەڵام هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی قسەدان. قسەی کۆتایی خودی تێکستەکە دەیکات. تێکست، داوای شێوەی خۆی لە نووسەرەکە دەکات و منی نووسەریش دەبێت وەڵامی خواستەکانی تێکستەکە بدەمەوە. هەموو ئەمانەیش لە کاتی نووسیندا ڕوودەدەن. بەرلەوەی دەست بۆ قەڵەم بەرم، نازانم چی ڕوودەدات.

**- تۆ حەزت لە نووسین نییە، بەڵام نووسین یەخەی گرتویت. دەتوانین بڵێین کە نووسەری ژیانی تۆی لە دەورانی دیکتاتۆریدا قوتارکردووە؟**

* ڕەنگە. لەبەرئەوەی من نەناسراو نەبووم. دیکتاتۆرەکان هەرچەندێک کە بە ڕواڵەت بەهێزن و متمانەیان بە خۆیان هەیە، هەر کە جیهانی ئازاد ڕەخنەیان لێدەگرێ، وەک ئەوەیە پەلەپیتکەیان لێدابن. لانیکەم کاردانەوە بەرامبەر ئەو ڕەخنانە پیشان دەدەن و تەنانەت وا دەنوێنن کە ڕەخنەکان بۆ ئەوان گرنگ نین. لە ڕۆمانیاش هەر وابوو.

لەو ساتەوەی بوومە ئەندامی ئەنجومەنی قەڵەم و یەکێتی نووسەران، لەو ساتەوەی کە ئازادی سەفەرکردنیان پێدام، یا خەڵاتی ئەدەبی (ئەسپێکت) (Aspekte)یان دامێ، ئەمانە منیان بەرامبەر بە دیکتاتۆریەت دڵنیاکرد. وەک ئەوە وابوو لە بەرامبەر گۆڕانی ئاووهەوا پاڵتۆیەکم لەبەرکردبێت، هاوڕێکانیشم لەپاڵ مندا هەستیان بە ئارامی دەکرد. ئیتر نەیاندەتوانی بە ئاسانی کارەکانم لێ بشێوێنن و بمخەنە چاڵەوە. بەڵێ. ئەدەبیات منی بە زیندوویی هێشتەوە.

سەرچاوە:

http://www.medad.net/wpm/?p=559
http://www.medad.net/wpm/documentary/wp-content/uploads/201002//herta_mueller.pdf

# فرانتز كافكا..

ئیدریس عەلی

وەرگێڕ و نووسەر ( ڕەووف بێگەرد) لە بواری وەرگێڕانی بەرهەمی ئەدەبی و شاكارە جیهانییەكاندا، خزمەتێكی ئەوتۆی پێشكەش كردووە كە شایانی ستایش و ڕێزگرتنە، دەپرسم ئەگەر ( زۆربا و ئاهەنگی ماڵئاوایی و تاوان و سزا و دڵۆپە خوێنەكانی سەر بەفر و دووا گفتوگۆكانی بۆرخێس و نامەكانی فروغ و چیخۆف و چەندین دەقی شانۆیی و دەیان چیرۆك و كتێبی گیرفان و بابەتی دیكەی ئەدەبی) لە لایەن ڕەووف بێگەردەوە وەرنەگێڕدرابانایە سەر زمانی كوردی، دەبوو حاڵی كتێبخانەی كوردی چۆن بوایە و خوێنەری كورد لە چ

چێژێکی ئەدەبی بەرهەم و تێکستی ئەو ناودارانە بێبەش بوایە؟ بێگومان بەر لە رەهەندەکانی تر، رەهەندی زەوق و سەلیقەی ئەوەی چ شتێک شایەنی ئەوەیە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی، بۆ خودی وەرگێڕ گرنگە، ئەمەش ئاگایی ئەدەبی و هۆشیاری و پاشخانی رۆشنبیری هێزی کەشفکردنی پانتاییە ئیستاتیکیەکانی دەوێـت، کە بێگومان مامۆستا رەووف خاوەنی بەم بەهرە و وزە و توانا مەعریفی و ئەدەبیی و رۆشنبیرییە.

لە مـاوەی رابــردوودا و لە درێــژەی ئەو هــەوڵ و خزمەتە بـەرچـاوانـەی خـۆیـدا، نـاوبـراو کۆمەڵە چیرۆکێکی ( فرانتز کافکا) ی وەرگێڕایە سەر زمانی کـوردی و پێشکەشی خوێنەری تامەزرۆی کورد کردو بەمەش گۆشەیەکی دیکەی کتێبخانەکانمانی بە بەرهەمی یەکێک لە بلیمەتەکانی دیکەی دنیا ئاوەدان کردووە، ئەم کتێبە لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە چاپ و بلاو کراوەتەوە و لە کۆمەڵێک چیرۆکی کورت و درێژ پێکهاتووە لەوانە: ( پەیجورەکانی سەگێک، توونچی، هونەرمەندی برسیەتی، لانــە، پزیشکی گـونـد، بلۆم فیلد، چەقەڵ و عەرەب، ئاژەڵێکی دوو رەگ، دورووشمی شار، بەدحاڵیبوونێکی رۆژانە، نووسراوێکی کۆن، هاورێیەتی، مستەکۆڵەیەک لە دەروازەی کۆشک، گراکۆسی راوچــی، تاقیکردنەوە، ئەسکەندەری گــەورە، گوندێکی دراوسێ،حیکایەتێکی چکۆڵە، پاسەوان، سیرنەکان، سەفەر) هاوکات هەر لەناو ئەم کتێبەدا و لە بەشی کۆتاییدا، دو لێکۆڵینەوەی ( میلان کۆندێرا و لاینیل تریلینگ) لەسەر چیرۆکەکانی کافکا نووسراون و پاشان پانۆرامای ژیانی کافکا لەگەڵ کۆمەڵێک وێنەدا بلاوکراوەتەوە کە دیسان بەو هۆیەوە خوێنەر دەتوانێت باشتر لە رەهەندەکانی ژیانی ئەم نووسەرە بلیمەتە تێبگات.

رەووف بێگەر لە دەسپێکی کتێبەکەدا لەبری پێشەکی ئـامـاژەی بـەوە داوە کە باشترین کار بۆ بەرجەستەکردنی کەسایەتی هەر داهێنەر و نووسەرێک و گەیشتن بە رەهەندەکانی بیر و مەودای بۆچوونەکانی، لەو بەرهەمانەوە بەدەست دێن کە نووسەرێک لە نزیکەوە ئەو داهێنەرانەی نووسیوە.

بەم پێیە دەگەینە ئەو حەقیقەتەی کە وەرگێڕی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی کافکا بۆ خۆی تەمەنێک لە ناو کایەی ئەدەبیدا ژیاوە و بەهۆی تموح و خەونی بێ سنووریەوە بۆ گەیشتن بە مەودای زیاتر، ئاشنای بەرهەمی داهێنەرانی دنیا بووە، خەونی هەرچی زیاتر خوێندنەوە و خۆ رۆشنبیرکردن بە زمانی جیا جیا، بە بێ گوێدانە ماندوو بوون و بێئاگا لە تێپەڕینی زەمەن، ئاشنای کردووە بە دنیای قوڵ و فراوانی کافکا، ئا لێرەوەیە دەبینین ئەم ( بێگەرد) ە، هەمیشە بەرهەمی ناوازە هەڵدەبژێرێت و شارەزایانە بەهای ئیستاتیکی و فەزای فەنتازی تێکستەکانمان بە زمانێکی ئەدەبی جوان بۆ وەردەگێڕێت.

لە نووسینێکدا لە سەر کافکا، میلان کۆندێرا دەڵێت: لە دنیای کافکاویەتدا کۆمیدیا ناکۆک نییە لەگەڵ تراژیدیا، بەلام لای شکسپیر وایە، بە جۆرێکی تر لە دنیای کافکادا کۆمیدیا لەبەر ئەوە بوونی نییە، کە بەهۆی ئاسانیی دەنگەوە زیاتر قبوڵی تراژیدیا بکرێت، ئەمە وا نییە و ئەو هەرگیز لەگەڵ تراژیدیادا نییە، بەڵکو کۆمیدیا لە ناو منداڵدانیدا تراژیدیا دەخنکێنێت.

لە لایەکی ترەوە ( لاینیل تریلینگ) لە نووسینێکی رەخنەییدا سـەبـارەت بە چیرۆکی ( گراکۆسی راوچی) کافاکادا باس لەوە دەکات کە هەر کەس ئەم چیرۆکەی کافکا بخوێنێتەوە رەنگە بە سەر

سامییەوە هـاواری لێ هەڵسێت: ئـەم چیرۆکە مکانای چییە؟ ئەم ریوایەتە سەیرە دەیەوێت چ شتێکمان پێبڵێت؟ ئەو دەشڵێت: لە گەڵ هەموو ئەمانەشدا، چیرۆکەکەی کافکا ئەگەرچی گوێ بە لۆژیکی ئێمە نادات بەڵام دەیەوێت شتێکمان لەگەڵدا بڵێت، تەنانەت لە خوێندنەوەی یەکەمدا، کە بەرەو دژواریەکی رۆحیمان دەبات، دەزانین چ شتێکی بۆ پێوتن پێیە.

چیرۆکەکە ئەفسانە ئامێزە، ئەفسانەیەکە باس لە کۆمەڵێک رووداوی ناو ژیانی مرۆڤ دەکات لە هەلومەرجێکی میتافیزیکیدا، ئەفسانە کەسانێک درووستی دەکەن کە بەشێوەیەکی رێژەیی لە قۆناغی سەرەتایی گەشەکردنی کلتووردا دەژین.

لە راستیدا مەبەستی کافکا تەنها گێڕانەوەی ئەو شتانەیە کە بەزەینیدا تێپەڕ دەبێ نەک درووستکردنی چیرۆکێکی سەرنجراکێش کە رووداوەکان بەرەو لوتکە ببات و لەوسەرەوە کە ناوبراو هەستی خوێنەری زۆر بەلاوە گرینگ نییە، نیازێک بۆ درووستکردنی ئاڵۆزی نابینێ، رووداوەکان لە زەمینەیەکی بێ گرێ و رێکوپێکدا وەگـەڕ دەکـەون و هەندێک جاریش پێش گەیشتن بە ئەنجام دەگەنە کۆتایی، دەبێت بوترێت کافکا زۆر پێشتر لە پێشرەوانی سەدەی بیست، زۆرێک لە رێسا و یاسا باوەکانی چیرۆکی کلاسیک لە نووسینەکانی خۆیدا تێکدەشکێنێت و بەبێ ئەوەی واتا بکاتە قوربانی، تەنیا پەردە لەسەر ئەو راستییانەی کە لە ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤدا روودەدەن لادەبا و بۆ یەکەمجار مرۆڤ لەگەڵ حەقیقەتێکی رووت رووبەروو دەبێتەوە.

لە لایەکی دیکەوە ئەو پرسانەی نێو دنیای کافکا ئەگەرچی دیار و هەست پێکراون، بەلام بۆ ئەوە ناشێن کە لێکۆڵینەوەی زۆریـان لەسەر بکرێن، چونکە ئەو وەک بیرمەندانی زانستی کۆمەلایەتی لەگەڵ رووکاری پرسەکان رووبەروو نابێتەوە واتە بە چاوی دیاردەی کۆمەڵایەتی تەماشایان ناکات، کە بە لێکۆڵینەوە و نمونە وەرگرتن و ئامار و شتی لەمجۆرە بتوانرێت چارەسەر بکرێن، ئەمەش ئەو تایبەتمەندێتییە ئاشکرا دەکات کە دنیای چیرۆک و رۆمانەکانی کافکای پێدەناسرێتەوە، واتە نووسین بە جۆرێکی دیکە، هەروەک مارکیز دەڵێت: ئەوە کافکا بوو کە فێری کردم دەکرێت بە چەشنێکی تر بنووسین.

بایەخی چیرۆکەکانی کافکا زیاتر لە هەر شتێک لەوەوە گرینگە کە تێکشکاندنی سنووری نێوان واقیع و خەیاڵ دەبینرێت، لێرەوەیە دەتوانین بڵێین کە کافکا چەمکە گشتی و موجەڕەدەکانی لە پەراوێزدا داناوە و لە شتە سادەکان دەکۆڵێتەوە، کافکا بە تەواوی ئاگاداری بوارەکانی زمان بوو، بۆ رۆچوون بە ئاڵۆزترین لایەنەکانی زەینی مرۆڤ، بە سوود وەرگرتن لە سادەترین فۆڕمی ئاخاوتن دەست دەکا بە درووستکردنی ئاوێتەیەک لە خەیاڵ و حەحیقەت، هێزێکی نادیار ناچاری دەکات بەنووسین و بەجۆرێک کە نووسینەکانی وەکو خودی خۆی شێوەیەکی پەراوێزییان هەیە.

دنیای کافکا بە تەواوی شەپۆلێکی بەرز و شێواوە، بەلام بێگومان لەدڵی ئەو نا ئارامیانەدا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بە هێمنی دەگەین.

# بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

کارەکانی دەزگای سەردەم لە دوو مانگی ڕابردودا، جگە لە گۆڤارە مانگانە و وەرزییەکان کە هەمویان لە کاتوساتی گونجاوی خۆیاندا بڵاوکراونەتەوە، بریتییە لە چاپکردنی کۆمەڵێ کتێبی تازە، کە زیاتر لە بوراەکانی هونەر و ئەدەبدا بەرجەستەبووە. واتە کتێبەکانی ئەم ماوەی ڕابردووە زیاتر ژانرە ئەدەبییەکانی گرتووەتەوە، لە ڕۆمانەوە بۆ چیرۆک و بۆ هونەری موزیک. وەلێ لە تەنیشت ئەو کارانەدا و هەر لەو ماوەیەدا، دەزگای سەردەم لە شاکارێکی بێوێنەدا فەرهەنگی (ئەلمونجید)ی عەرەبی لە پێنج بەرگی قەشەنگدا و بە کوردییەکی پاراو چاپ و بڵاوکردەوە کە لە خوارەوە لەسەری دەدەوێین.

## ئەلمونجد

دوای هـەوڵ وماندوبونێکی زۆر و دوای چەند ساڵێک کارکردنی بەردەوام، دواجار بەڕێز مامۆستا "جەلال مەحمود عەلی سوبحانی"، توانی فەرهەنگی ئەلمونجیدی عەرەبی بکات بە کوردی و دواتر دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، لە چاپێکی جوان و نایابدا خستیە بەردەست خوێنەرانی کورد و سوچێکی گرنگی کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند کرد و بۆشاییەکی گەورەی پڕکردەوە.

ئەلمونجید یەکێکە لەو بەرهەمە ناوازانەی کە گرنگ بوو بکرێت بە کـوردی، چونکە ئەم کارە ڕێگا بۆ هەمو ئەو خوێنەر و خوێندکار و وەرگێڕ و توێژەرانە خۆشدەکات کە لە بەرهەمەکانیاندا پێویستیان بە فەرهەنگی ئەلمونجید دەبێت، تا بە ئاسانی لە مانای وشە عەرەبییەکان تێبگەن. ئەم کارە گەورەیە ئەگەرچی کاری لیژنەیەک یان گروپێکە و زەحمەتە بە تەنها کەسێک ئەنجامبدرێت، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا وەرگـێـڕی ئـەم کـارە هەوڵیداوە تا دوا سنور لە کارەکەیدا سەرکەوتوبێت و توانیویەتی بەرگێکی کوردانە بە بەر ئەلمونجیدا بکات و لە وەرگێڕانەکەیدا تاڕادەیەکی باش سەرکەوتوبێت. وەرگێڕ هەستی بەوە کـردووە کارەکەی دەبێ کارێکی هـەرەوەزی بێت، بۆیە وەک لە پێشەکی بەرگی یەکەمدا ئاماژەی پێکردووە، بۆ وەرگێڕانی بەشە زانستییەکانی ناو ئەلمونجیدەکە پەنای بۆ کۆمەڵێ مامۆستا و پسپۆڕ و سەرپەرشتیاری شارەزا بردووە و سوپاسیان دەکات کە یارمەتیان داوە.

ئەلمونجیدی کوردی لە پێنج بەرگ پێکهاتووە، بەرگی یەکەم پیتەکانی (**ا بۆ خ**) لە خۆدەگرێتو ٧٣١ لاپەڕەیە، بەرگی دووەم تایبەتە بە پیتەکانی (**د بۆ ش**)و ٧٥٦ لاپەڕەیە، بەرگی سێیەم پیتەکانی (**ص بۆ ف**) لەخۆدەگرێتو ٧٣٠ لاپەڕەیە، بەرگی چوارەم پیتەکانی (**ق بۆ م**) لەخۆدەگرێتو ٦٨٩ لاپـەڕەیـە، دوا بـەرگ کە دەکاتە بەرگی پێنجەم پیتەکانی (**ن بۆ ی**) لەخۆدەگرێتو ٦١٥ لاپەڕەیە، هەر پێنج بەرگەکە لەناو بۆکسێکدا کۆکراونەتەوە و بەسەریەکەوە دەفرۆشرێن. کۆی ژمارەی لاپەڕەکانی هەر پێنج بەرگەکە دەکاتە ٣٥٢١ لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندی، تیراژی ئەم فەرهەنگە پێنج هەزار دانەیە و نرخی هەر بەرگێک بە تەنها بیست هەزار دینارە و نرخی سەرجەم بەرگەکان سەد هەزار دینارە.

# کۆمەڵناسی و هونەری موزیك

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە باش و نایابانەی بە شێوەیەکی هونەری و ئەکادیمی باس لە مێژویی سەرهەڵدانی موزیک و ئتمێرەکانی لە خۆرئاوا و دواتـر لە ئێران دەکـات. لای زۆربەمان ئاشکرایە هەم خۆرئاوا و هەم ئێران سەرزەمینی مۆسیقا و ئـاوازی تایبەت بە خۆیانن. هـەردوولا لە بورای مۆسیقا و هونەری ژەنین و ئامێرە مۆسیقییەکاندا، جێگا دەستیان دیارە و خاوەنی پێگەیەکی گەورەی داهێنەرانەن.

کتێبەکە زۆر بە وردی و پاڵپشت بە کۆمەڵێ وێنەی دیکۆمێنتاری و پڕ بایەخ، باس لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئامێرە مۆسیقییەکان و مەسەلەی نـەخـش ونیگار و وێـنـە هـەڵـکـۆڵـراوەکـانـی ناو ئەشکەوتەکان دەکات، تەنانەت لە ڕێگەی وێنەوە باس لە قۆناغەکانی پێگەیشتنی مرۆڤ دەکات، هەر لە قۆناغی مەیمونەوە تا دەگاتە مرۆڤی ئەمڕۆ. جگە لەو وێنانە، کۆمەڵێ وێنەی دیکەی تێدایە کە یارمەتیدەرن بۆ زیاتر تێگەشتن لە بابەتەکە و یارمەتییەکی باشی خوێنەر دەدات بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەشتنی ئاسانتر. بوونی ئەو ژمارە زۆرەی وێنەی دەگمەنی کۆن و تازە، خاڵێکی جوانی ئەم کتێبەیە، وێنەکان جگە لە بەها زانستییەکەی، ڕووکـاری دیزاینی کتیبەکەشی جوانترکردووە.

خاڵێکی جوانی دیکەی ئەم کتێبە بریتییە لەوەی کتێبەکە لە تەنها یەک کتێبەوە وەرنەگێڕدراوە، بەڵکو لە کۆمەڵێ کتێب و سەرچاوەی جیاواز جیاوازەوە وەرگـێـڕدراوە، ئەمەش وایکردووە کتێبەکە زیاتر دەوڵەمەندتر ببێت و لە بابەتەکاندا قووڵتر ببێتەوە.

هەروەها کتێبەکە لەبەر ئەو هەمو زانیارییە زۆرەی سەبارەت بە هونەری پان و بەرفراوانی مۆسیقا، دەیخاتەڕوو، دەکرێ هەمو خوێنەرێکی سادە سودی لێوەربگرێت و ساتێکی خۆشی لەگەڵدا بباتە سەر. واتە کتێبەکە چەند گرنگە بۆ ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ مۆسیقا و ژەنین و ئـاوازدانـان و تـەواوی لایەنەکانی دیکەی ئەم هونەرەدا هەیە، بە هەمان ئەندازەش بۆ خوێنەری سادەش گرنگە و لەزەت لە خوێندنەوەی بابەتەکان وەردەگرێت. بە مانایەکیتر کتێبەکە بۆ هەمو ئەو کەسانە دەستدەدات کە حەز دەکەن بە جۆرێک لە جۆرەکان، زانیاریان لەسەر مێژوی هونەری مۆسیقا هەبێت و لە قۆناغەکانی پێگەشتنی ئەم هونەرە تێبگەن، لە سەردەمی هەرە کۆن و دێرینەوە تاکو سەردەمی ئەمڕۆ. سەرەڕای هەمو ئەوانەش کاری وەرگێرانەکە بە زمانێکی کوردی جوانو پاراو، لەلایەن بەڕێز "ستار کەریم"ەوە لە فارسییەوە کراوە بە کوردی.

ئەم کتێبە ژمارەی لاپەڕەکانی ٣٢١ لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندییە و تیراژەکەی ٥٠٠ دانەیە و نرخی پێنج هەزار دینارە.

# سڵاو.. کەسێك لەوێیە

ئەم کتێبە یەکێک لە ڕۆمانە جوانەکانی ڕۆماننوسی نەرویجی یۆستاین گاردەر، خۆشبەختانە ئەم نوسەرە کە لە ساڵی ١٩٥٢ لە دایکبووە و ئێستا مامۆستای زانکۆیە و وانەی فەلسەفە و مێژوی فیکر دەڵێتەوە، تا ڕادەیەکی باش لای خوێنەری کورد ناسراوە و زۆربەی ڕۆمانەکانی کراون بە کوردی. ئەم نوسەرە وەک چۆن لە جیهاندا بە هۆی ڕۆمانە نایاب و بەناوبانگەکەیەوە ناسرا، واتە ڕۆمانی جیهانی سۆفیا، ئـەوا لای خوێنەرانی کوردیش لە ڕێگەی هەمان ڕۆمانەوە ناسرا. ئەم ڕۆمانە بۆ زیاد لە ٥٣ زمانی جیهانی وەرگێڕدراوە و تا ئێستا زیاد لە سی ملیۆن دانەی لێفرۆشراوە، خۆشبەختانە زمانی کوردیش یەکێکە لەو زمانانە و چەند وەرگێڕێک کردویانە بە کوردی و چەند جارێکیش چاپکراوەتەوە. ڕۆمانی جیهانی سۆفیا سەرەڕای ئەوەی بۆ ئەو هەمو زمانە وەرگێڕدراوە و سەرەڕای ئەو فرۆشە باشەی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کراوە بە فیلمی سینەمایی و تەنانەت کراوە بە یاریی ڤیدیۆیی. لە ئێستادا خەڵاتێک هەیە بە ناوی (خەڵاتی سۆفیا) کە لەلایەن خودی نوسەری ڕۆمانەکە و هاوسەرەکەیەوە دابینکراوە و دەدرێت بەو کارانەی کۆمەک بە پێشخستن و پارێزگاریکردن لە ژینگە دەکەن. سەبارەت بە گرنگیو بایەخی ڕۆمانی جیهانی سۆفیا دەڵێن: (ئەگەر دەروازەیەکی سوک و ئاسانمان بۆ مێژوی فەلسەفە هەبێت، ئەوا ئەم ڕۆمانە ئەو دەروازەیەیە).

ڕۆمانی سڵاو.. کەس لەوێیە، تاڕادەیەک بە هەمان ستایلی ڕۆمانی سۆفیا نوسراوە و بە زمانێکی سادەی قووڵ کە خوێنەر بە ئاسانی لێیتێبگات، باس لە پرسیارە فەلسەفییەکان دەکات، باس لەوە دەکات ئایا مرۆڤی دیکە یاخود ڕاستتر ئایا بونەوەری دیکە لەم گەردونە بێ پایان و نا کۆتاییە هەیە؟ ئاخۆ تۆبڵێی لە دەرەوەی ئەم گۆی زەوییە، زەوی دیکە یان هەسارەی دیکە هەبێت و ژیانی تێدابێت؟ ئایا جگە لەم شوێنەی ئێمە کە لەسەری دەژین، شوێن و جێگای دیکە هەیە بونەوەری دیکەی لەسەر بژی؟ بونەوەرێک مەرج نییە چ لە ڕووی شێوەوە و چ لە ڕووی پێکهاتەی جەستەیی و تەنانەت چ لە ڕووی چۆنیەتی لەدایکبوون و گەشەکردنی، لە ئێمە بچێت؟ بەڵام لێمان تێ دەگات و ئێمەش لێی تێدەگەین.

بە درێژایی ١٧٢ لاپەڕە کە ڕۆمانەکەی لێپێکهاتووە، ئێمە لەبەردەم وتووێژی دوو بونەوەرداین، یەکێکیان مرۆڤێکی سەر ئەم زەویەیە و ئێمە دەیناسین و وەک خۆمان وایە، ئەوی دیکەیان لە شوێنێکی دووری ناو گەردونەوە هاتووە و نامۆیە و نایناسین و وەک ئێمە بیرناکاتەوە و تەنانەت وەک ئێمە لەدایکنەبووە. ئەو لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتووە و بۆ ماوەیەک لەگەڵماندا دەژی. میکا ناوی ئەو بونەوەرەیە کە بۆ ساتێک دێتە سەر هەسارەکەمان و دواتر لە بەیانییەکی زوودا بێ دەنگ و بە دزییەوە لە پەنجەرەی ماڵەکەوە دەڕواتەوە بۆ ناو پانتایی ئاسمان و لەوێشەوە تێکەڵ بە گەردوون دەبێتو دەبێتە خاڵێکی ڕەشی نادیار. وەلێ لەو ماوەیەدا کە لەسەر زەوی دەبێتو لە ئەنجامی گفتوگۆی نێوان ئەم بونەوەرەی دەرەوەی زەوی لەگەڵ بونەوەرێکی سەر زەوی کە "مامە جۆی"ە و ڕۆمانەکە دەگێڕێـەوە، هەندێ زانیاری و زانستمان لەسەر گەردون دەستدەکەوێت و تێدەگەین کە هیچ دوور نییە جگە لەم ژیانەی ئێمە، ژیان و زیندەگی دیکە و مرۆڤ و بونەوەری دیکە هەبێت و لەو بەرزاییەوە، لە کەشکەلانی فەلەکەوە لێمان بڕوانن و چاودێریمان بکەن.

ئەم ڕۆمانە لەلایەن بەڕێز "سیروان مەحمود"ەوە سەرکەوتوانە کراوە بە کوردی، لاپەڕەکانی بریتییە لە ١٧٢ لاپەڕەی قەبارە بچوک و تیراژەکە ٥٠٠ دانەیە و نرخی دوو هەزارو پێنج سەد دینارە.

